


بەرگی دووەم



# چیرۆکی تەوبەکاران



## ١٠٠ چیرۆکی واقیعی

وەرگێرانی:
حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

# چیرۆکی تەوبەکاران

## ﴿١٠٠﴾ چیرۆکی واقیعی

## بەرگی دووەم

وەرگێڕانی
حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

بسم الله الرحمن الرحيم


ناوی کتێب: چیرۆکی تەوبەکاران

وەرگێڕان: حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

بابەت: چیرۆک

تایپ: نیگا حسێن

نۆبەتی چاپ: یەکەم

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکانی سلێمانی

ژمارە( ١٤٣٠ )ی ساڵی ٢٠١٣ز پێدراوە

# پێشەکی

زۆرن ئەوانەی بەهۆی وتەیەك یان هەڵوێستێك یان رووداوێك یان بیرکردنەوەیەك یان رامانێك یان....یان....رەوتی ژیانیان بە تەواوی دەگۆڕدرێت و لەوپەڕی رەشبینیەوە بۆ ئەمپەڕی گەشبینی و لەوپەڕی سەرگەردانیەوە بۆ ئەمپەڕی بەختەوەری و لەوپەڕی تیاچوونەوە بۆ ئەمپەڕی رزگاربوون و لە ناو زۆنگاوەوە بۆ کەلی ئاسۆ هەنگاو دەنێن..

ئێمەی موسڵمان نابێ بێئومێد بین لە هیچ کەس و نابێ رەشبین بین بە تەواوی بەرامبەر بە هیچ دڵێك، لە هەر کوێیەك و لە هەر جێیەك و لە هەر کات و لە هەر ساتێکدا وتەیەکی خێرت پێ بوو بیکە و شەرم مەکە، ئەم ئاینە ئاینی خێر و سەرفرازی و بەختەوەریە، پاڵەوانانی ئەم چیرۆکانە بە قەناعەتەوە ئەم بەسەرهاتانەیان نوسیوەتەوە تا نەوەکان بە هەموو چین و توێژەکانیانەوە سوودمەند بن لێی و زیاتر پابەند بن بەم ئیسلامەوە، ئەم چیرۆکانە واقیعین و روویانداوە و لێرەو لەوێ نمونەکانیشیان چەند بارە دەبنەوە تەنها کارەکتەرەکان و ناوی کەسەکان جیاوازیان هەیە، گەر بێت و بکۆڵینەوە لە ژیانی هەر یەکێکمان بەدەر نیە لەو ساتە ناسکانە و لەو کاتانەی کە خەریکە بە تەواوی شتەکان وەك خۆیان وێنا دەکەین..منیش لێرەوە دەخوازم خوێنەری بەرێز ئەگەر تۆش بەسەرهاتێکت لایە پێت وایە سوودی بۆ هەموان هەیە تا ببێتە رێنمایی بۆیان، دەتوانیت لە رێگای ئیمێڵ یان فەیسبوکەوە بۆمان بنێریت و ئێمەش بە ئەمانەتەوە بڵاوی بکەینەوە بۆ سوودی هەموان..لەگەڵ هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو لایەك

حسێن مەحمود هەڵەبجەیی

٠٧٥٠١١١٥٥٢٩

فەیسبوك: husainhalabja

ئیمێڵ: Husain.halabga@googlemail.com

## ١- ﴿پیاوەکە هاواریکرد: خوایەگیان لێبوردەییت﴾

پیاوێك هەبوو، لە پێناو دنیا و دیناردا دەژیا، گرنگی نەدەدا بە ڕۆژی دوایی، کاری بلیت بڕین بوو لە فەرمانگەی ڕێگاوباندا... ڕۆژێکیان نزیك بوویەوە لە یەکێ لەنەفەرەکان، کە یەکێ بوو لە لاوانی ڕابوون، پرسیاری حسابەکەی لێ کرد ئەویش بە سوعبەتەوە ووتی ﴿حسابەکە داینێ بۆ (یوم الحساب)﴾ وەنرخی بلیتەکەی پێدا.

ئەو وشەیە کاریگەریەکی سەیری کردە سەر پیاوەکە... بەڵێ بەخوا وایە... ﴿حسابەکە بۆ (یوم الحساب)﴾، بۆچی بیرناکەینەوە لەو ڕۆژە مەزنە ترسناکە.. بۆچی دنیا سەرقاڵی کردووین و دینمان فەرامۆش کردووە، بۆچی توێشوو کۆنەکەینەوە بۆ ڕۆژی لێپرسینەوە.. هاواریکرد پەروەردگارا، بەزەییت... چەند مانگێ تێپەڕی و ئەو لاوە لە یەکێ لەمزگەوتەکاندا نوێژی دەکرد، پیاوێکی بینی ڕیشی هاتبوو، لە ڕوخساریدا شوێنەواری تەقواو خواناسیی دیاربوو.. دانەویەوە بۆی و پێی ووت: ئایا من دەناسیتەوە.

لاوەکە –بەداوای لێبوردنەوە– ووتی: ناتناسمەوە.

پێی ووت: من ئەو بلیت بڕە بووم، کە ڕۆژێکیان پێت ووتم ﴿حیساب ڕۆژی حیسابە﴾ بە خوا ئەو ووتانەت کاریان تێ کردم و وایان لێ کردم زۆر بیر بکەمەوە لەو ڕۆژە مەزنە.. تا بوویە هۆکارێك بۆ هیدایەتدانی من.. لاوەکەش سوپاسی خوای کرد و داوای دامەزراوەیی بۆ کرد و بوونە دووبرای ئایینی.. پێغەمبەری خوا–ص– دەفەرموێ: ﴿إنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّم الكَلِمَةَ من سَخط الله، مَا يَظُنُ أنْ تَبلغَ مَا بَلَغَتْ، يَكْتُب الله لَهُ بِهَا رِضْوانَهُ إلى يَوْم القِيَامَة، وَ إنَّ الرَّجُلَ لَيَتَكَلَّم الكَلِمَةَ، من سَخط الله مَا يَظُنُ أنْ تَبْلُغَ مَا بَلَغت، يَكْتُب الله عَلَيْهِ سَخَطَه إلى يَوم القِيَامَة﴾صححة الالباني. دەی با هەمووومان ئازیزان سووربین لەسەر چاکەکردن و بڵاوکردنەوەی خێر و چاکە لە نێو خەڵکیداو.. چەندەمان بیست و بینی، کە خوای گەورە هیدایەتی دان بەڵکو موسڵمان بوون و هاتنە ناو ئەم ئاینە مەزنەوە، بەهۆی ووشەیەکەوە، و هەبوو بە هۆی کاسێتێك یان نامیلکەیەکەوە، هەشبوو بەهۆی خەندەیەك یان مامەڵەیەکی باشەوە لەگەڵیدا.

بە فەزڵی خوای گەورە هۆکارەکانی بانگەواز ئەمڕۆ زۆر و فراوانە، بەڵام کوان ئەوانەی لەو بوارەدا کاردەکەن؟ وە ئازیزم بزانە کە پاداشتی چاکە چاکەیە بەدوای خۆیدا، وە

هیچ چاکەیەك ئەوەندەی ئەوە مەزن نیە کە موسڵمان خەمی فەرمانڕەوایەتی ئەم ئاینەی هەڵگرتبێت لە زەویدا و ئیصلاحی برا موسڵمانەکانی، ئەوەی ئەم خەمەی هەڵگرت و هەوڵی بۆبدا، خوای گەورە توشی خێر و چاکەی دەکات و دەرگای ڕەحمەت و بەرەکاتی خۆی لێ دەکاتەوە..

﴿لەکتێبی ﴿التائبون إلى الله﴾ بەدەستکاریەوە﴾..

## ٢-﴿دیمەنێکی تۆقێنەر لە شوێنی مردو شۆردنێکدا﴾

لە بەرواری ڕۆژی ١٤٢٢/٣/٢٠ك، بەیانی سەعات حەوت ڕۆشتم بۆ شوێنی کارەکەم وەك ڕۆژانی تر پێش نوێژی عەسر بە نیو سەعات گەڕامەوە، پاشان بەپەلە نانی نیوەڕۆم خوارد، زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدا... بەرپرسی شوێنی مردوو شۆردنەکە کە نزیك بوو لەماڵی ئێمەوە، داوای لێکردم هاوکاری بکەم لە شۆردنی یەکێك لە مردوان بۆ ئەوەی دوای نوێژی عەسر نوێژی لەسەر بکرێت.. تەنها پێنج خولەکی مابوو بۆ بانگی عەسر.. پشتم بەست بەخوا و بەخێرایی ڕۆشتم بۆ شوێنی مردو شۆردنەکە و گەشتمە ئەوێ و بانگبێژ بانگی فەرموو...

ئەوە یەکەم جارم نەبوو بەشداربم لە شۆردنی مردوودا، پێشتریش چەند جارێ هاوکاریم دەکردن.. بەڵام ئەوەی کە ئەم جارە پاڵی پێوەنام بینوسم، ئەو شتە بوو کە بە چاوی خۆم بینیم لە بارودۆخی ئەو مردووە، لەخوای گەورە دەخوازم من و ئێوەش عاقیبەت خێر بکات.

ڕۆشتمە شوێنی مردوو شۆرەکە، مردووەکەیان لە ئۆتۆمبێل داگرت، و پێش ئەوەی من بگەم بۆنێکی بەهێز لەشوێنی مردوو شۆردنەکەوە هات، مردووەکەش بە تەواوی داپۆشرابوو، هیچ شوێنێکی بەدەرەوە نەبوو...

دەستمانکرد بە لابردنی ئەوشتانەی کە پێی داپۆشرابوو.. جەستەی پیاوێکم بینی بە لای سپیدا دەیڕواند، لەگەڵ کەمێك زەردیدا..

بەڵام سەرسامیەکە لەوەدا بوو کە تەماشای ڕوخساری و سەریم کرد.. ڕوخسارێکی ڕەشم بینی کە لای کردبوو بە لای چەپدا.. ویستمان لەکاتی شۆردندا سەری بجولێنین،و ملی ڕێك بکەینەوە بۆ باری ئاسایی، یان بۆ لای ڕاست، بەڵام سوودی نەبوو، ملی بە تەواوی ڕەق بوو بوو، کەس نەیدەتوانی بیجولێنێت..

لە شۆردن و کفنکردنی بوینەوە... پاشان من و سێ پیاوی بەهێز هەڵمان گرت، خستمانە سەر نەقالە تا بیبەین بۆ مزگەوت نوێژی لەسەر بکەین...

خستمانە سەر نەقالەکە، و دووریی ئێمە لە مزگەوتەکەوە نزیکەی سەد مەترێك دەبوو، کێشی قورس بوو، بە ئەندازەیەك کە خەریك بوو دەستەکانم دەپچڕان و پشتیشم بە

هۆی ئەوەوە ئازاری پێگەشت.. سوپاسی خوام کرد کە توانیم لەگەڵیاندا بیگەیەنینە ناو مزگەوتەکە. هەر کە گەشتین ئیمام سڵاوی نوێژی عەسری دایەوە...

پاشان نوێژیان لەسەر کرد.. بەڵام من نەمتوانی نوێژی لەسەر بکەم بەهۆی سەرسامی ئەو دیمەنەی کە بینیبووم.

لە یەکێك لەو کەسانەم پرسی کە هاوڕێی بوون، ووتی ئەو پزیشکی هەناویی بووە و تەمەنی نزیکەی پەنجا ساڵ بوو...

پاشان لێم پرسی ئەو پیاوە بە چ شێوەیەك مردووە، پێی ووتم: توشی سنگە بڕێ ﴿الذبحه صدرية﴾ بووە بە کتوپڕی، کاتێ کە لە حەمامدا بووە، دوێنێ شەو کەوتوە و لەحەمامدا کتوپڕ گیانی دەرچووە... لە خوای گەورە دەخوازین عاقیبەت خێرمان کات... دوای ئەوە نەمتوانی پرسیاری ئەوە بکەم ئایا نوێژکەر بووە یان هەندێ پرسیاری تر.. لە ترسی ئەوەی ووشەیەك لەمنەوە دەرنەچێ و فەزح نەبێت...

گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان، ئەو دیمەنە زۆر کاری تێکردبووم، جەستەم پەیتا پەیتا عارەقی لێ دەبووەوە، دڵیشم بە ئازار و سوێ بوو بۆ ئەو پیاوە...

ئەو دیمەنە وای لێکردم کە سەرلەنوێ دەست بکەمەوە بە حساباتی خۆم لەگەڵ خوای گەورەدا... و داوا لە هەریەکێ دەکەم کە ئەم چیرۆکە دەخوێنێتەوە پیاچوونەوەی خۆی بکات بە ڕاستگۆیانەوە بگەڕێتەوە بۆ لای خواو دوورکەوێتەوە لە گوناه و تاوان، چونکە هۆکارە بۆ عاقیبەت شەڕی، لەوانەیە تۆ بەسەر تاوانێکەوە بمریت و ئەم دنیا و ئەو دنیاش لەدەست بدەیت.

دەخوازم لەخوای گەورە من و ئێوەش عاقیبەت خێر بکات و بەهەشت بکات بە نسیبمان و ڕزگارمان بکات لەدۆزەخ.

## ٣-﴿دوكانی (تۆمارگەی گۆرانیەکان) بۆ ئامۆژگاریکردن﴾

لەشاری مەدینەی پێغەمبەر(د.خ) یەکێ لە بانگخوازان بۆی باس کردم و ووتی: لەمانگی ڕەمەزاندا بوو ڕۆشتم بۆ دوکانی ﴿تۆمارگای گۆرانی﴾ بۆ ئامۆژگاری، لە دەرگای دوکانەکەدا قسەم لەگەڵ لاوێکدا کرد و ووتم: ﴿دوای سلاوکردن﴾ سەریم ماچ کرد،و خەندەیەکم بۆ کرد،و پێم ووت: ئەگەر لە ڕەمەزاندا واز لە گۆرانی نەهێنیت، ئەی کەی وازی لێ دێنیت. لاوەکەم جێ هێشت، ئەویش هات بە دوامدا و داوای ژمارەی مۆبایلەکەمی کرد.. بە بەردەوامی پەیوەندی پێوە دەکردم، دوای چەند ڕۆژێك لاوەکە تەوبەی کرد و وازی هێنا، هاتە سەر ڕێی ڕاست، وورده وورده داوای زانیاری دەکرد، ئێستا ئەو لە باشترینی قوتابیانی زانستە لە شاری مەدینەی پرشنگداردا.

منیش ووتم: هیدایەتدانی ئەو لاوە، لە ئەنجامی خوڕەوشتی جوانی ئەو بانگخوازە میهرەبانەوە بوو.. کە خەندەی بۆ کرد و چاك بوو لەگەڵیدا و خۆشی ویست.. تەماشای ئەنجام و کاریگەری و بەرهەمی خەندە بکەن... بانگخوازە ئازیزەکان.

بەڕاستی لاوان پێویستیان بە ئێمەیە، بەلاّم پێویستە ئێمە سۆز و میهرەبانیمان هەبێت و نەرم و نیان بین و دەم بەخەندە بین، ئەو کاتەش وەلاّم و خۆشەویستی ئەوان دەبینین بەرامبەرمان. بەڕاستی ئەو لاوانەی ڕێگایان هەڵەکردووە و لایانداوە لەڕێگای ڕاست، و کەوتونەتە ناو زۆنگی تاوانەوە، بەڕاستی ئەوانە چاوەڕوانی خێری زۆریان لێ دەکرێت گەر هەوڵیان لەگەڵدا بدەین.

بەلاّم ئەبێ کێ بێت بەو کارە خێرە هەستێت؟؟ کێ ئەو خێرە لە دڵەکانیاندا دەیەنێتە دەرەوە؟

بەڕاستی وشەیەکی چاك و خەندەیەکی ڕاستگۆیانە و دڵێکی بەسۆز، ئەمانە دەرمانی دڵەکانن بۆ ئەو لاوە سەرگەردان و دوور لە خوایانە..

دەی ئەی بانگخواز، تۆش میهرەبان و بەسۆز و خۆشەویست و ئاسانکار و نزیك بە، ئەو کاتەش لاوەکان دەبینیت کە زۆر بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دێن بە پیرتەوە.

## ٤-﴿ئەم جارە پێشکەشمان کرد، بۆ جاری داهاتوو تۆ پێشکەشی دەکەیت﴾

ئەمە چیرۆکێکی واقیعیە و دەخوازم سوودی لێ ببینن.

چەند هاورێیەك دەبن پێکەوە هەموو شەوێ شەونشینی دەکەن، لاوێکیان تێدا دەبێت کە ناسراوە بە سوعبەت چی و قسەخۆش.. بەڵام خاوەنی زمانێکی زبری سەیر دەبێت، کەس لە زمانی دەرباز نابێت. لەماڵی یەکێ لە هاورێکان کۆبوونەوە، رۆژێکیان ئەو لاوە زمان زبرە رۆشت بۆ لای هاورێیەکی کە لەبارێکی نامۆدا بوو.. هاورێکەی گوێی نەدایە، بەڵام سەیر بوو بە لایەوە کاتێ بینی لە سەر مێزەکە دانیشت و دەیوت: خوایەگیان لێم خۆشبە، خوایە گیان لێم خۆشبە، خاوەن ماڵەکە سەرسام بوو لە رەفتاری هاورێکەی، بەڵام هیچی بۆ نەکرد.. دوای ساتێك ئەو لاوە هەستایەوە ﴿با وای دانێین ناوی محمدە﴾ محمد هەستایەوە و رۆشت بۆ حەمام و دەست نوێژی گرت و دەستی کرد بە نوێژی چێشتەنگاو ﴿الضحی﴾.. هاورێکەی سوێندی خوارد و ووتی: کاتێ محمد سوجدەی برد، سەری بەرز نەکردەوە لە سوجدە، کاتێ نەبێ کە بانگی نیوەڕۆیدا، و بەدرێژایی ئەو ماوەیە هەر دەگریا، و دەیوت: خوایەگیان لێم خۆشبە.. خوایە گیان لێم خۆشبە.. دوای ئەوەی محمد لە نوێژەکەی بوویەوە، خاوەن ماڵەکە دەستی گرت و پێی ووت: ئێستا دەبێ پێم بڵێیت، تۆ چیتە، دەی پێم بڵێ...

محمدیش کە بە کوڵ دەگریا ووتی: من دوێنێ مەوعیدم لەگەڵ سێ کچدا هەبوو لە شوقەیەکدا.. کاتێ بە رێگاوە بووم بۆ ئەوێ، وەستام تا لە شەقامەکە بپەڕمەوە، کەسێکم بینی وەستاوە لە تەنیشتمەوە، گرنگیم پێ نەدا، بەڵام هەستم کردبوو هەر کە من دەجوڵێمەوە و هەنگاوێ دەنێم، ئەویش هەنگاوێك دەنێت.. منیش دوو هەنگاو هاتمە دواوە، ئەویش دوو هەنگاو هاتە دواوە. و لە هەمان کاتدا پێکەوە بە شەقامەکەدا پەڕینەوە، لە پڕ ئۆتۆمبیلێکی خێرا هات، منیش هەنگاوێك گەڕامەوە دواوە، ئەویش هەنگاوێك گەڕایەوە دواوە، و هەر کە ئۆتۆمبیلەکە نزیك بوویەوە، ئەویش بەرە و ئۆتۆمبێلەکە رۆشت و زۆر بەسەختی ئۆتۆمبێلەکە کردی بە ژێرەوە...

خەڵکی لە شەقامەکەدا کۆبوونەوە، هەندێکیان بە هۆی سەختی رووداوەکە و ترسناکی دیمەنەکە دەستیانکرد بە گریان، پەلەکانی لە لەشی جیابووبوونەوە، منیش

وەستام و هیچ نەجولام، و هیچ گرنگیەکم بەپیاوەکە نەدا، پیاوێکم بینی بە توندی شانی گرتم و ووتی پێم:﴿ئەم جارەیان ئەومان پێش خست و تۆمان دواخست، بۆجاری داهاتوو، سوێند بە خوای مەزن، تۆ پێش دەخەین﴾.

تەماشای دەوروبەری خۆمم کرد، کەسم نەبینی، بەلام جارێکی تریش دەنگەکەم بیستەوە:﴿ئەمڕۆ تۆمان دواخست و ئەومان پێش خست، سوێند بەخوای مەزن، جاری داهاتوو تۆ پێش دەخەین﴾.

گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، لە ترساندا دەلەرزیم، دەستم کرد بە کۆکردنەوەی وێنەی ئافرەتان و کاسێتە ڤیدیۆییەکان، و هەموویانم خستە ناو سەللەی زبڵدانەکەوە، هەموو شەیتانەکانی دنیا دەیانویست ڕێگیریم لێ بکەن، نەفس و دەروونم خەریك بوو گومانیان بۆ دروست دەکردم لەو کارەم..

بۆیە جارێکی تریش ئەو دەنگەم بیستەوە ﴿ئەمجارەیان ئەومان پێش خست و تۆمان دواخست، بۆ جاری داهاتوو، سوێند بەخوای مەزن، تۆ پێش دەخەین﴾.. خوایە گیان هەموومان عاقیبەت خێرکەیت.

## ٥- ﴿پشت بە ئارامگرتن و نوێژ ببەستن﴾

﴿م.س﴾ لە شانشینی سعودی چیرۆکی خۆیی بۆ گێرامەوە، ووتی: من ڕێگای مزگەوتم نەدەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا، باوکم مەلا بوو، خەڵکی فێری قورئان خوێندن دەکرد.. ئەو پارەیەی لەبەردەستمدا بوو بەڕاستی سەرگەردانی کردبووم و دووری خستبوومەوە لەڕێگای خوا.. پاشان ویستی خوا وابوو کە توشی ڕوداوێکی ئۆتۆمبێل بووم و وام لێهات کە بەتەواوی توانای ڕۆشتنم نەمابوو، پزیشکەکانیش جەختیان لەوە دەکردەوە، کە هۆکارێکی ئاشکرا نیە بۆ ئەم کەمئەندامیەم، تەنها لەوانەیە بەرکەوتنێکی دەماریی بووبێت، کە وای کردووە لە چوارپەلی خستووم، ڕۆژێکیان دەڕۆشتم بۆ لای هاوڕێیەکم، ئەو عەرەبانەیەی کە بەهۆیەوە پێی دەڕۆشتم، هەر کە لە ئۆتۆمبێلەکەم تایبەت بە کەمئەنداماان بوو براکەم دایبەزاندم و خستمیە سەر عەرەبانەکە پێش ئەوەی براکەم بمخاتە سەر عەرەبانەکە، بانگبێژ بانگی ئێوارەی فەرموو.. دەنگی زۆر خۆش بوو، دڵمی کەمەنکێش کرد و ویژدانمی بەتوندی هەژاند.. وەك ئەوەی یەکەم جار بێت لەژیانمدا گوێم لەبانگەوە بوو بێت، چاوەکانم پڕبوون لەفرمێسك، براکەم سەرسام بوو کاتێك داوام لێکرد تابمبات بۆ مزگەوت و نوێژی بە کۆمەڵ ئەنجام بدەم.. ڕۆژانێکی زۆر تێپەڕین و منیش وابەستەی نوێژەکانم بووم لەمزگەوتا.. تەنانەت نەمدەهێشت نوێژی بەیانیانیشم لەکیس بچێت.. لەگەڵ ئەو مەینەتیە زۆرانەشمدا سوربووم لەسەر ئەوەی کەپاشەکشە نەکەم لەڕێگای گەڕانەوەم بۆلای خوا..

شەوێکیان، پێش نوێژی بەیانی، لەخەونمدا باوکمم بینی، لە گۆڕەکەیدا هەستایەوە و کێشای بە شانمدا و منیش دەگریام، پێی ووتم: کوڕی خۆم، غەمبارمەبە، بە ڕاستی خوای گەورە بەهۆی تۆوە لەمن خۆش بوو، منیش بەهۆی ئەو مژدەیەوە زۆر دڵشاد بووم و ڕۆشتم نوێژم کرد و سوجدەی سوپاسگوزاریم برد بۆ خوای گەورە.. ئەو خەونەم چەندین جار دووبارە دەبوویەوە، دوای چەند ساڵێ، من نوێژی بەیانیانم لە مزگەوتەکەی پاڵ ماڵماندا ئەنجام دەدا، و دادەنیشتم لەسەر کورسی لە کۆتایی ریزی یەکەمدا، ئیمام دوعایەکی زۆری لەکاتی ﴿دوعای قنوت﴾دا خوێند.. منیش بە هۆی دوعاکەیەوە دڵم زۆر هاتە جۆش و فرمێسك بە چاوانمدا دەهاتە خوارەوە.. هەستم

دەکرد جەستەم دەلەرزێت و خەریکە دڵم لە سینەم یەتەدەرەوە، هەستم کرد کە مردن خەریکە نزیك دەبێتەوە لێم، لەپڕ هێور بوومەوە، نوێژەکەمم تەواوکرد، دوای ئەوەی سڵاوم دایەوە لەسەر کورسیەکەم هەستامەوە و کورسیەکەم خستە لاوە، تا لەسەر پێی خۆم بوەستم و دوو ڕکات نوێژی شوکرانە بژێری ئەنجام بدەم بۆ خوای گەورە.. نوێژگەرانی دەوروبەرم هاتن بۆ لام و پیرۆزباییان لێ دەکردم.. فرمێسکەکانیان تێکەڵ بە فرمێسکەکانم بووبوون، بەڕاستی دڵخۆشبوون بە هەستە ڕاستگۆییەکانیان وەسف ناکرێت، ئیمام هات تا بچرپێنێ بەگوێمدا، لەکاتێکدا باوەشی پیاداکردم و ووتی: نەکەی فەزڵ و ڕەحمەتی خوای گەورە بەسەرتەوە لەبیربکەیت، ئەگەر خۆت توشی سەرپێچی خوا بکەیتەوە، ئەوە دەگەڕێیتەوە بۆ سەر کورسیەکەت و هەرگیز دەست بەردارت نابێت، تا پەند وەربگریت!.

## ٦- ﴿پێی ووتم: مامۆستا دەتوانیت لێم بەیت﴾

مامۆستا ﴿ترکی الغامدی﴾ ووتی: دوای ئەوەی لە پێشکەشکردنی موحازەرەیەك بوومەوە، لاوێك هات بۆلام و ووتی: من دەمەوێ قسەت لەگەڵدا بکەم، کاتێ دانیشتم لەگەڵیدا ووتی: بەڕاستم من کاریگەربووم بەوەی کە بیستم، بەخوا ئێستا من هیچم ناوێ تەوبەکردن نەبێت.

منیش ووتم: کارێکی باشت کرد، مژدەت لێ بێت بە تەوبەکردنەکەت، و کاتێ قسەم بۆ دەکرد سەبارەت بە فەزڵەکانی تەوبە، سەری ڕادەوەشاند و سەری شۆڕدەکردەوە بۆ زەوی و بەرزی دەکردەوە، بەردەوام وای دەکرد.

پاشان پێی ووتم: مامۆستا گیان دەتوانیت لێم بدەیت؟

منیش بە سەرسامیەوە پێم ووت: بەڵێ!!

ئەویش ووتی: دەتوانیت لێم بدەیت؟

ووتم: ئایا تۆ بەڕاستیتە؟

ووتی: بەڵێ، بەڕاستمە..

منیش ووتم: چی وای لێکردوویت وا بڵێیت؟

ووتی: من ئێستا کە قسە لەگەڵ تۆدا دەکەم لەحاڵەتی سەرخۆشیدام، و تەرکیزم کەمە و هەندێ جاریش هۆشم لای خۆم نیە، بەڵام بەخوا من خێر و چاکەم دەوێت تۆ بکێشە بەسەرمدا، بەڵکو بێمەوە هۆش خۆم و ئاگام لە قسەکانتەوە بێت.

بەخوا منیش سەرم سوڕما، ئەمە یەکەم جارە دیمەنی وابببینم.. داواکاریەکەم بەجێهێنا.. پاشان سەری بەرزکردەوە و ووتی: بەڵێ... گوێم لێیە. قسەم کرد لەگەڵیدا و ووتم: تەمەنت چەندە؟

ووتی: تەمەنم هەژدە ساڵە.

ووتم: هەژدە ساڵیت و سەرخۆشیت؟! چی ئەبێ گەر باوکت بەم شێوازە بتبینێت.

ووتی: ئای داد و بێداد لە باوکم.. پاشان بێدەنگ بوو.

پاشان ووتم: بۆچی؟

ووتی: چونکە باوکم فێری عارەق خواردنەوەی کردم!!

ووتم: باوکت عارەق دەخواتەوە؟!

ووتی: بەڵێ، براکەم و مامەکانیشم، من ماوەیەکی زۆرە لەسەر ئەم ڕەفتارەم بەردەوامم..

ووتی: سەرسام دەبیت گەر پێت بڵێم: تەنها دایکم کەسێکی خواپەرست و بەتەقوایە لە ماڵەکەماندا.. پاشان چاوەکانی پڕبوون لە فرمێسک...

ووتی: بەخوا نزیکەی سی ساڵە هاوسەری باوکمە و باوکیشم بەوشێوەیەیە و هەموو ئەندامانی خێزانەکەمان، تەنها دایکم نەبێت..

باوکم دەیبردین بۆ شوێنی سەماکردنەکان، لە وڵاتانی تر و دایکیشمی بەزۆر دەبرد، داکیشم کە دابنیشتایە سەری دادەخست و دەیوت:﴿سبحان الله... الحمد الله... لاإله إلا الله... الله اکبر﴾ بەردەوام ئەو دوعایەی دەکرد تا ئێمە لەو سەرگەردانیە تەواو دەبووین، پاشان دەهاتینە دەرەوە و ئەویش هەر لەخوا دەپاڕایەوە و دوعای دەکرد.

پاشان ووتی: بەخوا من دەمەوێ تەوبە بکەم و بگەڕێمەوە بۆ لای خوا، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی منەوە چاو و دڵی دایکم ڕۆشن بکاتەوە...

منیش پێم ووت: ئەی بێجگە لە عارەق خواردنەوە چی ترت دەکرد؟ بۆی باس کردم کە تاوان و خراپەکاری و دزی و بەدڕەوشتی و کاری خراپ تریشی دەکرد.

پاشان پێم ووت: ئایا نوێژ دەکەیت؟

ووتی: نەخێر، ماوەی چوار ساڵە نوێژ ناکەم، تەنها لە قوتابخانە نەبێ و بەبێ دەستنوێژ..

منیش ووتم: سەیرە! چوار ساڵە نوێژ ناکەیت، زیانی نیە ئەو تاوانانەت کردووە، چونکە تۆ نوێژ ناکەیت، ئایا پەروەردگارمان نەی فەرمووە:﴿ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ﴾ العنکبوت/٤٥.. واتە:﴿ بەڕاستی نوێژ مرۆڤ دووردەخاتەوە لە بەدڕەوشتی و خراپەکاری﴾. کەسێ نوێژ نەکات چۆن ناکەوێتە ناو تاوان و گوناهەوە؟

بەو لاوەم ووت: ئەگەر تۆ بەڕاستە، هەر لە ئێستاوە نوێژ بکە، و داواکارم لێت کە واز لە عارەق و خراپەکاریش بهێنیت.. ئەگەر بە ڕاستیتە، دوای هەفتەیەکی تر دەتبینمەوە.. دوای هەفتەیەك بینیمەوە و پێم ووت: چیت کرد؟

ووتی: بەخوا یەك نوێژم لە کیس نەچووە، و پەرداخە عارەقم بۆ دەمم بەرز نەکردۆتەوە.

و ووتی: بەخوا من کە جاری یەکەم قسەم لە گەڵ تۆدا کرد، بە ڕاستی بیرم لە خۆکوشتن دەکردەوە.

منیش پێم ووت: پێویستە هاوڕێکانی پێشووت بگۆڕیت و خوای گەورە بە صاڵحان قەرەبووت بۆ دەکاتەوە.

پێم ووت: دوای هەفتەیەکی تر دەتبینمەوە.

پاشان بینیمەوە و پێی ووتم: مژ دەبێت... هاوڕێکانم واز لێ هێنا و وازیشم لە گۆرانی هێنا.. مژدەت دەدەمێ من ئێستا ڕۆژانە بەلای کەمەوە یەك جوزء قورئان دەخوێنم... نوێژە سوننەتەکان ئەنجام دەدەم و کردەوەی چاك دەکەم، ئەو کردەوانەی کە لە نێوان خۆم و خوای گەورەدان.. و ئەوەندە بەختەوەرم، ئەگەر هەموو دنیام بەنێ یەکسان نابێت بەو ئاسودەیی و بەختەوەریە کە تەنها لەخواپەرستیدا دەیبینمەوە..

سبحان اللە! ڕەحم و بەزەیی خوا چەندە فراوانە..

پێش مانگێك ئەو لاوە بەسەر خۆشی قسەی لەگەڵدا دەکردم، بەڵام ئێستا شەو هەڵدەستێت بۆ خواپەرستی و تەهلیلەی پەروەردگار..

ئەوەیە نور و ڕووناکی ئیمان.

خوشك و برایانم! نوێژ... نوێژ، وەسێتی پێغەمبەر(د.خ)، تەنانەت لەو کاتەدا کە نەخۆش بوو، لەسەرەمەرگدا بوو، و لەسەر ئەوکەسانە پێویستە کەنوێژ ناکەن، کە لەخوای گەورە بترسن، و ئەوانەی کەمتەرخەمن لە نوێژکردندا ئاگاداربن کە خوا چاودێرە بەسەریانەوە، ئازیزان دەی بگەن بە ڕیزی نوێژگەراندا..

سەرچاوە: لە شریتی ﴿چیرۆکانێك نەتبیستون﴾ شێخ: ترکی الغامدی..

## ٧- ﴿موسڵمان بوو.. ناوی خۆی گۆڕی بۆ (ضیف الله)﴾

عەمری کوڕی قەیس ووتی:﴿ئەگەر خێرت پێ گەشت کاری پێ بکە، با یەك جاریش بێت، و ببیتە ئەهلی ئەو﴾.

دوای ناڕەحەتیەکی، زۆر خوێندنم لە ﴿پەیمانگای تەندروستی﴾ تەواوکرد.. ڕێکوپێك نەبووم لە خوێندنەکەمدا... بەڵام خوای گەورە دەرچوونی بۆ ئاسانکردم... دامەزرام لە یەکێ لە نەخۆشخانەی گوندێکی نزیك شارەکەمان.. سوپاس بۆ خوا کاروبارم بە ڕێکی دەڕۆشت بەڕێوە، لە گەڵ دایك و باوکمدا دەژیام، بڕیارمدا پارە کۆبکەمەوە بۆ ژن هێنان.. ئەوکارەی کە هەموو ڕۆژێ دایکم هانی دەدام بۆی..

هەمووکارەکان بەشێوەیەکی باش و ڕێك و پێك بەڕێوە دەچوون، بە تایبەتی کارکردنم لە نەخۆشخانەیەکی سەربازیی، حەزم لە جوڵە بوو، بۆیە لە کارەکەمدا سەرکەوتنێکی باشم بەدەست هێنابوو، بە بەراورد لەگەڵ خوێندنەکەمدا، کەسست و بێزاری کردبووم.. نەخۆشخانەکە پێکهاتبوو لە فەرمانبەری زۆربەی ڕەگەزەکان.. پەیوەندیم لەگەڵیاندا پەیوەندی کارکردن بوو.. هەروەها ئەوانیش سودمەند دەبوون لە بوونی من لەگەڵیاندا وەك کوڕی وڵات و شارەکە.. من ڕێبەریان بووم بۆ شوێنەوارەکان..و بازاڕەکان.. و هەروەها هەندێکیشیانم دەبرد بۆ کێڵگەکەمان، پەیوەندیم لەگەڵیاندا بەهێز بوو.. ئاساییە لە کۆتایی تەواوبوونی گرێبەستی یەکێ لە فەرمانبەرەکان.. ئێمە هەڵدەستاین بە سازدانی ئاهەنگی خواحافیزی.. ڕۆژێکیان یەکێ لە پزیشکە بەریتانیەکان بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەیان، بەهۆی کۆتایی هاتنی ماوەی کارەکەی لەگەڵماندا.. ڕاوێژمانکرد تا ئاهەنگێکی خواحافیزی بۆ سازبکەین.. شوێنی دیاریکراویش کێڵگەکەی ئێمە بوو.. بە شێوەیەکی گشتی و کاروبار ڕێکخرا.. بەڵام ئەوەی کە هەموو بیر و هۆشی منی سەرقاڵ کردبوو.. ئەوە بوو کە چ دیاریەکی پێشکەش بکەم.. بە تایبەتی من بۆ ماوەیەکی درێژ کارم لەگەڵدا کردبوو، دیاری بەهادار و گونجاوم لەیەك کاتدا بەبیرداهات، ئەو پزیشکە حەزی لە کۆکردنەوەی پارچە شوێنەواریەکان بوو.. وە بەبێ ماندووبوون و ناڕەحەتی.. باوکم لەو جۆرە شتانەی زۆر لە لابوو.. منیش داوام لە باوکم کرد.. ئەویش پارچەیەکی لە کەلەپورەکانی پێبەخشیم کە دروستکراوی کۆنی ناوچەکە بوو.. کوڕی مامێکیشم

ئامادەی ئەو قسانەم بوو لەگەڵ باوکمدا.. ووتی: بۆچی دیاریەکی نایەیتیٚ لە شێوەی کتێبێك سەبارەت بە ئیسلام.. پارچە شوێنەواریەکەم هەڵگرت..و گوێم نەدا بە قسەکانی ئامۆزاکەم، و بەهەند وەرمنەگرت..

بەڵام خوای گەورەش ئەو کارەی بۆ ئاسانکردم بەبیٚ ماندووبوون.. بۆ سبەینیٚ ڕۆشتم تا قورئانێکی پیرۆز و چەند گۆڤارێك بکڕم و بەدیاری پێشکەشی بکەم.. تەماشام کرد کتێبێکی لێیە سەبارەت بە ئیسلام بە زمانی ئینگلیزی.. قسەکانی ئامۆزاکەم لە گوێمدا دەزرنگایەوە.. بیرۆکەی کڕینی هات بە بیرمدا، بە تایبەت کە نرخەکەی زۆر هەرزان بوو.. کتێبەکەم هەڵگرت..و لە ڕۆژی خواحافیزی لە هاوڕێکەمان.. کتێبەکەم لە ناو پارچە شوێنەواریەکەدا دانا، وەك ئەوەی کە بیشارمەوە.. دیاریەکەی خۆمم پێشکەش کرد.. بە راستی ماڵئاواییەکی کاریگەر بوو.. ئەو پزیشکە لای هەموان خۆشەویست بوو.. هاوڕێکەمان سەفەریکرد.. ڕۆژەکان و مانگەکان بەخێرایی تێدەپەڕین.. من هاوسەرگیریم ئەنجامدا و پاشان خوای گەورە منداڵێکی پیٚ بەخشین.. ڕۆژێکیان نامەیەکم لە بەریتانیاوە پێگەشت.. بە شێنەیی خوێندمەوە، چونکە بە زمانی ئینگلیزی نوسرابوو.. لە ناوەڕۆکی نامەکە تێگەشتم.. لە هەندێکیشی تێنەدەگەشتم.. زانیم کە لە هاوڕێیەکی دێرینەوەیە کە کاری کردووە لەگەڵماندا.. منیش بیرم کردەوە، ناوەکەی یەکەمجار بوو کە بیبیسم.. بەڵکو زۆر سەیر بوو بەلامەوە ﴿ضيف الله–میوانی خوا﴾ ناوەکەی بەوشێوە بوو.. نامەکەم داخستەوە و، هەوڵمدا بیرکەمەوە لە هاوڕیکانم بزانم کامیان بەو ناوەوە بوو، بەڵام کەسم شك نەبرد ئەو ناوەی هەبێت.. نامەکەم کردەوە و جارێکی تریش خوێندمەوە.. لەسەرخۆ ووشە بە ووشە لێی تێدەگەشتم.. ئەمە بەشێکی پەیامەکەی بوو.. برای بەڕێزم ﴿میوانی خوا﴾ السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.. خوای گەورە ڕێگای موسڵمانبوونی بۆ ئاسانکردم و لەسەر دەستی تۆ هیدایەتی دام.. هاوڕێیەتیم لەگەڵ تۆدا هەرگیز لەیاد ناکەم.. و دوعای خێرت بۆ دەکەم.. بیرتە کە لەکاتی گەڕانەوەمدا کتێبێکت بە دیاری پێشکەش کردم.. هەر ئەو ڕۆژە خوێندمەوە.. بەڕاستی زۆر بەپەرۆش بووم کە زیاتر شارەزابم لە ئیسلام.. بە کۆمەکی خوا لەسەر بەرگی کتێبەکە کە ناونیشانی دەزگای بڵاوکردنەوەکەم بینی، منیش نامەم بۆ ناردن تا کتێبی ترم بۆ

بنێرن.. چیم داواکرد بۆیان ناردم.. سوپاس بۆ خوا نووری ئیسلام له دڵمدا درەوشایەوه.. ڕۆشتم بۆ سەنتەری ئیسلامی و موسڵمان بوونی خۆمم ڕاگەیاند.. ناوی خۆشم له ﴿جۆن﴾ ەوه گۆڕی بۆ ﴿میوانی ئیسلام﴾ واته بۆ ناوەکەی تۆ.. چونکه دوای خوای گەوره تۆ خاوەنی فەزڵ و ڕێز بوویت.. وه هەروەها وێنەیەکیشت بۆ دەنێرم شەهادەتدانی منی تێدایه به ئاینی ئیسلام.. و هەوڵ دەدەم بێم بۆ مەککه بۆ ئەنجامدانی فەرزی حەج.. برای موسڵمانت ﴿میوانی ئیسلام﴾.

والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.. نامەکەم داخستەوه.. دیسان به پەله کردمەوه.. سەرلەنوێ خوێندمەوه.. نامەکه بەهێزەوه هەژاندمی.. چونکه له هەر پیتێك له پیتەکانی هەستم به ڕاستگۆیی دەکرد.. زۆر گریام.. چۆن خوای گەوره هیدایەتی کەسێکی دا بۆ ئیسلام لەسەر دەستی من، که منیش کەمتەرخەمم بەرامبەر هەقی ئەو.. کتێبێك بەهاکەی پێنج ریاڵ نابێت. خوای گەوره هیدایەتی کەسێکی پێ دەدات.. دڵتەنگ بووم..و دڵخۆشیش بووم.. دڵخۆش بووم که خوای گەوره هیدایەتیدا بۆ ئیسلام بەبێ هەوڵ وماندوو بوونی من.. و زۆریش دڵتەنگ بووم، چونکه له خۆمم پرسی من چۆن بووم لەگەڵ هاوڕێکانم لەسەر کارەکەم.. هەرگیز بانگم نەکردوون بۆ موسڵمان بوون. و ئەم ئاینەم پێ نەناساندوون. و یەك ووشەم سەبارەت به ئیسلام نەوتووه که له ڕۆژی قیامەتدا شایەتیم بۆ بدات.. قسەی زۆر و شۆخی زۆرم لەگەڵدا کردوون.. بەڵام سەبارەت به ئیسلام نه زۆر و نه کەم قسەم لەگەڵدا نەکردوون.. خوای گەوره هیدایەتی ﴿میوانی ئیسلام﴾ ی دا که موسڵمان ببێت.. و هیدایەتی منی دا که لێپرسینەوەی خۆم و کەمتەرخەمیەکانی خۆم بکەم له خواپەرستیدا.. نابێ کردەوەی چاکه به کەم بزانم، تەنانەت با کتێبێکیش بێت بەهاکەی یەك ڕیاڵ بێت.. کەمێك بیرم کردەوه، ئەگەر یەك کتێب به دیاری ببەخشن بەوەی که به دەورتاندایه، چی ڕوودەدات جارێکی تر توشی شۆك بوومەوه.. سەبارەت بەوەی که خوێندمەوه.. دەربارەی هەندێ له ڕاستیەکان له ئەفریقیا.. که دەست کراوه به کۆکردنەوەی ۱۳۹ هەزار ملیۆن دۆلاری ئەمریکی، له ئەمریکا به مەبەستی کاروباری کەنیسه.. و ۳۹٦۸۰۰موبەشیری نەصرانی لەو ساڵەدا خراونەته گەڕ.. و ۱۱۲۵٦٤٤۰۰دانه له ئینجیل دابەشکراوه، و ژمارەی ئێستگه و تەلەفزیۆنیه نەصرانیەکان گەشتۆته ۱٦۲۰

دانە.. ئەم سەرژمێریە لە گۆڤاری نێودەوڵەتی بۆ توێژینەوەکانی بەمەسیحیکردنی ئەمریکی بڵاوکراوەتەوە لە ژمارە (١) بەرگی ١١، ساڵی ١٩٨٧ز.. پرسیم.. ئەی ئێمە لە کوێین.. بە لانی زۆر کەمەوە چەند شۆفێرمان هەیە کە موسڵمان نین، و چەند خزمەتکار لە وڵاتەکەماندا هەیە کە موسڵمان نین.. و چەند..و چەند..و چەند.. ئازارێك کە فرمێسك هێنەرە.. بەڵام پرسیارێك دەمێنێتەوە.. کوا کردەوە.. کوا کردەوە.. کات خەریکە تێدەپەڕێ..

لە کتێبی (الزمن القادم) نوسەر: عبدالملك قاسم.

# ٨- ﴿وەفاتكردنی پاكستانیەك لە(كەعبە)دا﴾

ڕۆشتمە سەر مێزی چێشتخانەی زانكۆ، دوای ئەوەی داوای نانی ئێوارەم كرد بۆ خۆم و بۆ هەندێ لە هاوڕێ ئازیزەكانم.. هاوڕێیەكم كە لەنزیكمەوە دانیشتبوو ڕووم تێكرد، تا دانیشتنەكەمان خۆشتر بێت و چەند قسەیەكیش بكەین..

هاوڕێكەم ووتی: ئایا (توركی)ت بینی؟!

ووتم: بەڵێ، بەڵام حاڵی زۆر گۆڕاوە؟!

ووتی: ئایا هۆكاری ئەوەت لێ پرسیوە؟

ووتم: نەبەخوا، ترسام پرسیاری لێ بكەم و ئازاری بدەم و بەسەختی لەبیری بچێتەوە، ئەو شتە چەند زۆرە لەم سەردەمەماندا.

هاوڕێكەم بێدەنگ بوو، نانەكەمان خوارد، لەو كاتەدا كاتەكە نزیك بوو بوویەوە كە موحازەرەكە دەست پێ بكات، بەرەو هۆڵەكە كەوتینە ڕێ..

ڕۆژگار تێپەڕی، منیش (توركی) هاوڕێمم دەبینی زۆر سەیر گۆڕابوو! بەڵام زاتی ئەوەم نەبوو هۆكاری ئەو گۆڕانەی لێ بپرسم، بەڵام بوو بوو بە خەمێك لە ناخمدا تا بزانم هۆكاری چیە.. پاش ماوەیەك لەگەڵ (توركی)و هاوڕێیەكمدا پێكەوە كۆبووینەوە.. دەستمان كرد بە باسكردنی خوێندن و تاقیكردنەوەكان.. لەپڕ هاوڕێكەم پرسیارێكی لێ كردم، كە زۆر ئیحراجی كردم، ووتی: ئایا هۆكاری گۆڕانی (توركی) نازانیت؟!

ووتم: نەبەخوا، بەڵام لەخوای گەورە دەخوازم خێرداربێت.

لێرەدا (توركی) سەری داخست و پاشان دوای ئەوەی سەری بەرزكردەوە و هەناسەیەكی قوڵی هەڵكێشا- ووتی: ڕۆژێكیان سەفەرم كرد بۆ مەككەی پیرۆز بۆ ئەنجامدانی عومرە، لەگەڵ هاوڕێكانم ڕۆشتم بۆ حەرەمی پیرۆز، دوای ئەوەی موسڵمانان لە نوێژی عیشا بوونەوە.. كۆمەڵێكمان بینی لە نزیك شوێنی تەوافەكەوە نوێژدەكەن، ئێمەش نوێژمان دابەست لەگەڵیاندا، پاشان هەستاینەوە تا دەست بە عومرەكەمان بكەین، لێرەدا خەڵكەكەمان بینی بە ئاراستەیەكی دیاریكراودا دەڕۆن، و زیاتر لەكەعبە نزیك دەبنەوە، و قەرەباڵغیەكەش زیاتر و زیاتر دەبێت- تا دڵنیا بووین كە شتێك ڕوویداوە، بۆیە ئەو قەرەباڵغیە سەیرە درووست بوو كە سەرنجی ڕادەكێشا، من و هاوڕێكانم نزیك بووینەوە، و من نزیكترینیان بووم لە ڕووداوەكە، ڕیزەكەم بڕی،

هەر کە نزیکتر دەبوومەوە خەڵکەکەم دەبینی ڕەنگیان دەگۆڕێت، تا گەشتمە ئەو شوێنەی کە هۆکاری ئەو قەرەباڵغیە بوو..

چی ڕوویدابێت؟!

بە کورتی: پیاوێك بەجلەکانی بەریدا دیاربوو کە خەڵکی ئەفغانستان یان پاکستانە، تەمەنی گەورە بوو، ڕیشی پڕ و درێژ بوو، زۆر سپی بوو کە ڕەشی تێدا نەدەبینرا..

پیاوەکە ڕاکشابوو لەسەر زەویەکە، هەندێ لە ئامادەبوان-کە زۆر کەم بوون- لای سەری دانیشتبوون، دەیانوت: لا إله إلا الله-چەند بارەیان دەکردەوە- زانیم کە پیاوەکە لە ساتی گیانداندایە.. یالله، ساتێکی هەست وروژێن بوو، ناتوانم وەسفی بکەم.. ئەو پیاوە هەر کە خولەکێك تێدەپەڕی زیاتر تەختی زەوی دەبوو، وەك پارچە تەختەیەکی لێ هاتبوو، ئەوانەی کە لای سەریەوە بوون ﴿لا إله إلا الله﴾یان دەوت.

لێرەدا پیاوە کەوتە قسەکردن، بەڵام قسانێك نە من و نە ئەوانەی دەوروبەرم لێی تێنەدەگەشتین، وابزانم بەزمانی خۆی قسەی دەکرد.. خەڵکەکەش هەر دەیان ووت: لا إله إلا الله... لا إله إلا الله.. ئەو هەرچەند قسەیەکی دەکرد لێی تێنەدەگەشتین.

زیاتر و زیاتر کاریگەر بووبووین بە ڕووداوەکە، ڕوخسارەکانیش زیاتر و زیاتر دەگۆڕان، ڕوخسارەکان زیاتر نیگەرانیان پێوە دیاربوو بۆ هەر کەس کە ئەو دیمەنە ترسناکەی دەبینی، پیاوێك لەبەردەمتا لەسەرەمەرگدا بێت، خەڵکەکەش بەردەوام بڵێن: لا إله إلا الله، ئەویش قسەبکات بەزمانی خۆیی و لێی تێنەگەیت.

پاشان شتێ ڕوویدا من هەرگیز پێشبینیم نەدەکرد لە ژیانمدا شتی وا ببینم.. ئەوانەی کە لە راسەری پیاوەکەوە بوون گەڕانە دواوە و لای ئێمەوە وەستان. ئایا دەزانن چی ڕوویدا؟! هەردوو قاچی پیاوەکە بەیەکدا ئالان، ڕاستەوخۆ ئەم ئایەتەم هاتەوە یاد ﴿وَالْتَفَّتِ السَّاقُ بِالسَّاقِ(٢٩)﴾القيامة.. وەك ئەوەی یەکەم جار بێت بیر لەم ئایەتە بکەمەوە.

پیاوەکە نوسابوو بە زەویەکەوە، قاچەکانی لوول بوو بوون، و قسەکانیش کەم بوو بوونەوە، ئەو قسانەی کە دەمان بیست و لێی تێنەدەگەشتین، پاشان بە هێمنی بێدەنگ بوو.. سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە قسەکردن.. بەڵام ئەم جارەیان بە دەنگێکی ئاشکرا.. بە زمانێك کە هەموو ئەوانەی وەستابوون لێی تێدەگەشتن..

وتەیەکی ووت موسڵمان نیە نەیبیستبێت یان ماناکەی نەزانێت.. زۆر بە ئاشکرایانە ووتی ﴿لا إله إلا الله.. محمد رسول الله﴾ پاشان هەناسەکانی وەستان و جەستەی خاوبوویەوە.. پاشان قاچەکانی کە پێچرابوون بەیەکەوە خاوبوونەوە، دوای ئەوە هیچمان لێ نەبیست!

پیاوەکە خامۆش بوو.. پاشان خەڵکەکە دەستیان کرد بە قسەکردن، بەڵام بە زمانی فرمێسك و هەنسك و گریان، ئەم دەگری و ئەو دەڵێ ﴿لاحول ولا قوه إلا بالله﴾ ئەوی تریان تەوبەدەکات، وەك ئەوەی مردووەکە باوك یان برای ئامادەبوان بێت.. ئەبێ چەند کەس لە ئامادەبوان ئاواتی خواستبێ بە زمانی حاڵ بڵێت: پیرۆزیی بۆ ئەو، خۆزگە لە جێگەی ئەودا بومایە.. پیاوەکە هەڵگیرا،و خێر خوازان هەستان بە تەواوکردنی ئەوراقەکانی.. خێزانەکەی ڕای وابوو کە لەحەرەمدا نوێژی لەسەر بکرێت، چونکە ئەویش -بەگومانی من- لەمەککە لەگەڵیدابوو.. هەوڵماندا بزانین کەی نوێژی لەسەر دەکەن، و لە چ فەرزێکا..

بۆ سبەینێ نوێژمان لەسەر کرد، ئەو هەڵوێستە لە بیر و هۆشمدا مایەوە، بە تێپەڕبوونی ڕۆژ و شەو لەیادمان ناسڕێتەوە.. لەگەڵ ئەو هەڵوێستەدا.. دوای تەوفیق و کۆمەکی خوای گەورە بۆ من.. حاڵی من گۆڕا، و لەخوای گەورە داواکارم کە من و ئێوەش دامەزراوبکات لەسەر هەق و ڕاستی، تا بە دیداری شاد دەبین..

## ٩- ﴿هیندۆسیەك موسڵمان بوو، سوجدەیەكیشی بۆ خوا نەبرد﴾

پیاوێك لەهیندەوە... هینۆسی بوو.. شێخ محمد الفراج-خوا بیپارێزێ- بەردەوام بانگی دەكرد كە موسڵمان بێت، ئەو نە رەفزی دەكرد و نە وەڵامی دەدایەوە، پۆزشی دەهێنایەوە بە كەسوكاری.. پاشان خوای گەورە سینەی فراوان كرد بۆ ئیسلام و هات بۆلای مامۆستا محمد لە مزگەوت ﴿تا موسڵمان ببێت﴾ مامۆستاش سەرقاڵی قوتابیەكانی و سەرقاڵی هەندێ بانگخواز بوو، وە نەیدەزانی كە ئەو دەیەوێت موسڵمان ببێت، بۆیە هیچ گرنگیەكی پێ نەدا.. مامۆستاكە لەگەڵ قوتابیەكان لەمزگەوت ڕۆشتە دەرەوە.. ئەو پیاوەش كە بە پەرۆش بوو موسڵمان ببێت، لەبەردەرگای مزگەوتەكەدا وەستا، چاوەڕوانی مامۆستا و قوتابیەكانی دەكرد، كە سواری ئۆتۆمبێلەكان بوون و دووركەوتەنەوە.. بۆیە خۆی نەگرت و دەستی كرد بەگریان.. هەردەگریاو لەبەردەرگای مزگەوتەكەدا وەستا بوو، تا یەكێ لە لاوانی ئەو گەڕەكە ڕەت بوو بەلایدا، پرسیاری هۆكاری ئەو گریانەی لێ كرد، هیندیەكەش ووتی: دەمەوێ موسڵمان بم.. ئەو لاوە هەرزەكارە-خوا پاداشتی بداتەوە- هەستا بە بردنی بۆماڵی خۆیان و فەرمانی پێدا كە دەستنوێژ بگرێت و تەلقینی شەهادەتی پێ ووتەوە، پاشان ئەو پیاوە هیندیە دوای ئەوەی شایەتومانی هێنا لەماڵەكە هاتەدەرەوە.. كاتیش نزیكی بانگی ئێوارە بوو.. ڕۆشت بۆ ژوورەكەی.. هەستی بە ئازاركرد لە سكیدا.. پاشان ئەو لاوە هات بۆ لای مامۆستا محمد، بەسەرهاتەكەی بەتەواوی بۆ گێڕایەوە.. مامۆستاكە زۆر پەشیمان بوو لە كردەوەكانی، هەرچەندە نەشیزانیبوو.. ڕۆشت بۆ ژووری پیاوە هیندیەكە، هاوڕێكانی هەواڵیان پێدا كە ئەو شەو وەفاتی كردووە، و ئەو ئێستا لە سەلاجەی ناو نەخۆشخانەدایە.. لە گەڵ هەندێ بانگخواز ڕۆشت بۆ ئەوێ، بەڵام لە نەخۆشخانە ڕێگایان نەدا، چونكە لە ڕێگای باڵوێزخانەوە پەیوەندیان پێوە كراوە، ئەمانیش هەڵدەستن بە سپاردەكردنی لاشەكەی تا لەوێ بسوتێنرێ.. مامۆستاكەش ووتی: ئەم پیاوە موسڵمان بووە، و شایەتیش هەیە لەسەر ئەوە.. بۆیە رەفزیان كرد.. مامۆستا ڕەحمەتی خوای لێ بێت ڕۆشت بۆلای شێخ ﴿إبن باز﴾-ڕەحمەتی خوای لێ بێت-و بەسەرهاتەكەی بە تەواوی بۆ گێڕایەوە..

شێخیش ڕەحمەتی خوای لێبێت ووتی: لاشەکەیان تەسلیم ناکرێتەوە.. ئەو برای موسڵمانی ئێمەیە نوێژی لەسەر دەکرێت و لێرە ئەسپەردە دەکرێت.. ڕاسپاردەی بێ باوەڕان ناکرێتەوە..

بۆیە نامەی نارد بۆ ئیمارەت سەبارەت بە بابەتەکە و داوای وەرگرتنەوەی لاشەکەی کرد کە تەسلیم بکرێتەوە بە مامۆستا ﴿محمد الفراج﴾.. ئیمارەتی نەخۆشخانەش فەرمانی دا لاشەکە تەسلیم بە مامۆستا بکرێتەوە.. هەندێ لە براکانیش هەستان بە شۆردنی و کفنکردنی.. پاشان نوێژکردن لەسەری، هاوکات بوو لەگەڵ نوێژی جومعەدا.. پاشان مامۆستا ﴿محمد الفراج﴾ ووتارێکی جوانی دا سەبارەت بەو کەسەی کەموسڵمان بوو، وە یەك سوجدەشی نەبرد بۆ خوای گەورە، لە ووتاری یەکەمدا ئەوانەی باس کرد لە مێژووداناویان هاتووە.. پاشان لە ووتاری دووەمیدا باسی بەسەرهاتی ئەو پیاوە هیندیەی کرد، کە لە دوای نوێژی جومعە بەتەمان نوێژی لەسەر بکەن.. موسڵمانانیش نوێژیان لەسەر کرد، پاشان جەنازەکەیان خستە سەر شانیان و هەموویان کەوتنە ڕێ بەرەو گۆڕستان، کە ژمارەیەکی زۆر لەبانگخوازان و زانایان پێشیان کەوتبوون.. بەڕاستی دیمەنێکی کاریگەر بوو.. خوای گەورە لێی خۆش بێت و تەوبەی لێ وەربگرێت.

## ١٠- ﴿كاتێ گەشتنە فڕۆکەخانە تابوتەکەیان کردەوە﴾

چوار لاو، لە یەك فەرمانگە کاریان دەکرد، ساڵانێکی درێژ تێپەڕی بوو کە ئەوان موچەکانی خۆیان کۆدەکردەوە.. ئەگەر بیانزانیایە لە شارێك خراپەکاری تێدادەکرێت، دەفڕین بۆی، ئەوان ڕۆژێکیان دانیشتبوون.. ناوی وڵاتێکیان بیست کە نەچووبوون بۆ ئەوێ.. بڕیاریاندا موچەکانیان ئەم جارە کۆبکەنەوە تا سەفەر بکەن بۆ ئەو وڵاتە، کە دیاریان کردووە، کاتی سەفەرەکە هاتە پێشەوە و سواری فڕۆکە بوون و ڕۆشتن بۆ ئەو کارەی کە دەیانویست.. زیاتر لەهەفتەیە تێپەڕی لەو وڵاتە، ئەوان سەرقاڵی زیناو عارەق خواردنەوە بوون، وەکارانێك کە خواڕازی نیە پێی.. شەوێکیان، لە ساتێکی درەنگی شەودا، ئەوان سەرقاڵی تاوان و خراپەکاری بوون، یەکێ لەو چوار کەسە بوورایەوە، هەرسێ هاوڕێکەی بە پەلە چوون بە هانایەوە، یەکێ لەو سیانە لەو شەوە سورەدا ووتی، پێی دەوت: براکەم، بڵێ لا إله إلا الله، لاوەکەش –پەنا بەخوا– تکادەکەم، پەرداخێکی تر عارەقم بۆ تێکە، وەرە کچەکە، پاشان گیانی دەرچوو ئا بەو شێوە ناشرین و قیزەونە.. لە خوای گەورە دەخوازین بمانپارێزێت و عاقیبەت خێرمان کات.. پاشان سێ هاوڕێکەی کە ئەو دیمەنەیان بینی، کە چۆن گیانی سپارد، دەستیان کرد بە گریان، لە مەلهاکە هاتنە دەرەوە بە زمانی تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا.. هاوڕێکەیان ئامادەباش کرد و هێنایانەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان.. کاتێ گەشتنە فڕۆکەخانە، تا دڵنیا بن لە لاشەکەی، کاتێ تەماشای ڕوخساری مردووەکەیان کرد، بە تەواوی ڕەش هەڵگەڕا بوو –پەنا بەخوا– لە خوای گەورە داواکارین ئێمەش و ئێوەش عاقیبەت خێر بکات.

# ١١- ﴿حاجیەکی تورکی دوعای لێدەکات.. دوعاکەی گیرا دەبێت﴾

یەکێ لە براکان کە جێگای متمانە بوو بۆی گێڕامەوە، ووتی ئەم چیرۆکە لە کاتی وەرزی حەجدا ڕوویدا، ﴿ئەویش یەکێ بووە لە سەربازە کارکردووەکان لە مونا﴾، ووتی: یەکێ لەحاجیە تورکەکان کە بەتەمەن بوو هات تا خۆی خاڵی بکاتەوە لە تەنیشت یەکێ لە چادرگەکانی سەر بە سەربازگەکە، و یەکێ لەئەفسەرەکان دەیبینێ و دەڕۆن بۆلای، ئەویش هێشتا لەکارەکەی نەبۆتەوە، ئەفسەرەکە دەست دەخاتە سەرشانی تورکیەکە و ئەویش دەکەوێتە سەر زەوی و پیس دەبێت.

ئەوەی بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوە تورکیەکە بەهۆی ئەوەوە دەستی کرد بەگریان و دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، و دوعای لە هاوڕێکەمان کرد، ئێمەش بە هاوڕێکەمان ووت: فلان کەس، بڕۆ داوای لێبووردنی لێ بکە، ئەو میوانی خوایە.. هەوڵماندا لەگەڵی، بەلام سودی نەبوو، دەڵێ: ڕۆشتین بۆلای پیاوەکە، پەردەمان بۆ گێڕایەوە، تا بەتەواوی خۆی پاك کردەوە و خۆی پۆشتە کردەوە.. پیاوە تورکیەکەش بەردەوام هەر دوعای لە ئەفسەرەکە دەکرد.. ووتی: دوای تەواوبوونی مەراسیمی حەج ئەفسەرەکە ڕۆشت بۆ شاری ﴿ریاض﴾ لە ڕێگادا لە ناوشاردا، وا گومان دەبەم کە باران بوو، ئۆتۆمبێلەکەی خلیسکا و توشی ڕووداوێك بوو، سەیارەکەی وەرگەڕا و ئەفسەرەکە کەوتە ناو چاڵێکی ئاوەڕۆوە، کە پڕبوو لە ئاوەڕۆ، ئەفسەرەکەیان لەناویدا دەرهێنا بە مردوویی، هەموو لاشەشی پیس بوو بوو، لە تۆڵەی ئەو پیاوە تورکیەدا. تۆڵەیەکی خوایی بوو ﴿لاحول ولا قوه إلا بالله﴾ ئەمە چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە.

## ١٢- ﴿لەسەر گۆڕەکەی نوسیان ئەمە گۆڕی (مسکی)یە﴾

مزگەوتی ﴿الحرام﴾ی جێهێشت و بۆنی میسك لە جەستەی دەبوویەوە.. کوڕێك هەبوو قوماشی دەفرۆشت، لەسەر شانی هەڵی دەگرت و بەماڵاندا دەگەڕا.. لەشولارێکی جوان و ڕێکی پێوە بوو، هەرکەس بیبینیایە خۆشی دەویست، خوای گەورە خۆشەویستی کردبوو لای هەموان.. ڕۆژێکیان، کە دەڕۆشت و بە شەقام و کۆڵان و ماڵەکاندا و هاواری دەکرد ﴿قوماش ..قوماش﴾ ئافرەتێ دەیبینێ و بانگی دەکات، ئەمیش یەت بۆلای.. فەرمانی پێ دەدات کە بچێتە ژوورەوە، ئافرەتەکە سەرسام دەبێت پێی، ئەمیش خوای دێنێتەوە یاد و باسی سەختی سزای خوای بۆ دەکات.. بەڵام سودی نابێت..

دوای هەوڵێکی زۆری ئافرەتەکە، بە ناچاری کوڕەکە پێی دەڵێت: ئایا ڕێگام دەدەیت بڕۆم بۆ حەمام، تا خۆم پاك بکەمەوە، ئافرەتەکەش بەم قسانە زۆر دڵخۆش بوو، پیاوەکە ڕۆشتە حەمام و جەستەی لە ترسی توش بوون بە گۆماوی تاوان دەترسا.. چونکە مەکری ئافرەت مەترسیدارە، چونکە گەر پیاوێك بە تەنها و لەخەڵوەتدا لەگەڵ ئافرەتێکدا بێت بێگومان سێهەمینیان شەیتانە.. خوایە گیان چی بکەم، ڕێنماییم بکە، ئەی ڕێنمایی کەرانی سەرگەردانان.. لە پڕ بیرۆکەیەك هات بە مێشکیدا..

ووتی: من بە باشی دەزانم، کە بێگومان ئەوانەی کە خوای گەورە دەیانخاتە سێبەری خۆیەوە، لە ڕۆژێکدا سێبەر نیە بێجگە لەو سێبەرە، پیاوێکە کە ژنێك بانگی بکات بۆ بەدڕەوشتی، ئەمیش بڵێت: من لەخوا دەترسم.. وە بزانە ئەوەی واز لەشتێ بهێنێت لەبەر خوای گەورە خوای گەورە قەرەبووی دەکاتەوە بەشتێك کەلەوە باشتر بێت.. وە زۆرجار شەهوەت و ئارەزوویەك تا کۆتایی تەمەن پەشیمانی بۆ مرۆڤ دێنێت.. ئەبێ من چی سەوز بکەم لەم تاوانە، لە کاتێکدا بە نەکردنی خوای گەورە نوری ئیمان دەخاتە دڵمەوە.. و کاری حەرام ئەنجام نادەم.. بەڵام ئەبێ چی بکەم.. ئایا خۆم لەم پەنجەرەیە فڕێدەمە خوارەوە، ناتوانم ئەوە بکەم، چونکە بەباشی داخراوە و بەو ئاسانیە ناکرێتەوە.. کەواتە جەستەم پیس و قیزەون دەکەم بەم پیسیانە، بەڵکو ئەگەر بینیمی بەو شێوەیە، دوورکەوێتەوە لێم و وازم لێ بێنێت.. بۆیە سووربوو لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە، کە مرۆڤ بێزی دەکردەوە لێی.. پاشان گریا و ووتی: خوایە

گیان سەروەر و پەروەردگارم، ترسی تۆ وای لێکردم کە ئەم کارە بکەم.. خوایە گیان بەخێری بیگێڕیت بەسەرمدا.. لە حەمام هاتە دەرەوە.. کاتێ ژنەکە بینی هاواری کرد بەسەریدا: برۆ دەرەوە شێتە، بۆیە بە ئەسپایی کوڕەکە ڕۆشتە دەرەوە لە ترسی خەڵکی و قسەکانیان کەچی پێ بڵێن.. کەلوپەلەکەی خۆی کۆکردەوە و لەسەر شەقام خەڵکەکە پێی پێدەکەنین هەتا گەشتە ماڵەوە، لەوێ هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و پۆشاکەکانی داکەند و ڕۆشتە حەمامەوە و بە جوای خۆی شۆرد، پاشان چی؟؟ ئایا خوای گەورە بەو شێوە دەستبەرداری بەندەکەی و وەلیەکەی دەبێت.. نەخێر ئازیزانم.. کاتێ لەحەمام هاتە دەرەوە، خوای گەورە بە شتێکی مەزن قەرەبووی بۆ کردەوە، کە لە جەستەیدا مایەوە هەتا وەفاتی کرد، بەڵکو دوای وەفاتکردنیشی.. خوای گەورە بۆنێکی خۆشی پێ بەخشی وەك بۆنی میسك، کە لە جەستەی بڵاودەبوویەوە.. خەڵکی لە دووری چەند مەترێکەوە هەستیان پێدەکرد، نازناوی ﴿پیاوە میسکیەکە﴾یان لێ نابوو.. بۆنی میسك لە جەستەی دەهات.. خوای گەورە لەبری ئەو بۆنەی کە ماوەیەکی کەم بە جەستەیەوە بوو تاوەکو توشی گوناه نەبێت قەرەبووی کردەوە بە بۆنێك کە بە درێژایی ژیانی پێوەی مایەوە.. کاتێ وەفاتی کرد دایان هێڵایە ناو گۆڕەکە.. لەسەر گۆڕەکەی نوسیان ﴿میسکی﴾ واتە ئەو پیاوەی کەبۆنی میسکی لێوە دەهات. من بەچاوی خۆم ئەوەم لە وڵاتی ﴿شام﴾ بینی.. بەوشێوەیەیە ئەی مرۆڤی موسڵمان، خوای مەزن دەستبەرداری بەندە صاڵحەکەی نابێت بەوشێوە.. بەڵکو بەرگری لێ دەکات. ﴿إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ(٣٨)﴾الحج.. سبحان الله.. خوای گەورە دەفەرموێ ﴿ولئن سألني لأعطينه، فأين السائلين﴾ واتە: ﴿ئەگەر داوام لێبکات بێگومان پێی دەبەخشم، کوان ئەوانەی داوای شت دەکەن﴾ بەڕاستی خوا بەهۆی بەخشینی شتی کەمەوە، شتی زۆر دەبەخشێت پێمان.. بە ڕاستی ئەوانەی واز لەسەرپێچی کردن دێنن و ڕوو دەکەنە پەروەردگاریان تا خوای گەورە لەوە باشتر قەرەبوویان بۆ بکاتەوە.. ئایا وەڵامی بانگەوازی خوای گەورە و وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەرەکەی و وەڵامی فیترەتی پاك نادەنەوە..

## ١٣- ﴿تەوبەی لاوێك دوای ئەوەی لەخەویدا ڕۆژی قیامەت دەبینیٚ﴾

ع.أ.غ لاوێکی تازە پێگەیشتووە، حەزوو خولیای گەنجانەی هەبوو، وەکو هاوتەمەنەکانی خۆی دەژیا و گوێی بەفەرمانەکانی خوای گەورە نەدەدا، شەوێکیان ویستی خوای گەورە وابوو توشی خێری بکات.. لە خەویدا دیمەنێکی بینی لەو بێئاگاییەی خەبەری کردەوە و هێنایەوە هۆش خۆی..

ئەو لاوە چیرۆکی خۆی دەگێڕێتەوە بۆمان و دەڵێت: شەوێکیان ڕۆشتمە سەر جێگاکەم تا بخەوم، هەستم بە دڵە ڕاوکێ دەکرد کە زاڵبوو بوو بەسەرمدا، منیش پەنام گرت بەخوای گەورە لە شەیتانی ڕەجم کراو و خەوتم، لە خەومدا شتێکی زەبەلاحم بینی کە لە ئاسمانەوە دای بەزەویدا، نەم دەزانی: ئەوشتە نەدەزانرا چییە، وە ناتوانم وەسفی بکەم، وەکو تەنێکی ئاگرینی مەزن وابوو، بینیم دای بەزەویدا و زانیم کە بەهیلاکا دەچین.. بەسەرگەردانیدا بەزەویدا دەگەڕام، بەدوای هەر دروستکراوێکدا دەگەڕام کە ڕزگارم بکات لەو مەینەتیە... ووتیان ئەمە سەرەتای ڕۆژی قیامەتە، و ڕۆژی قیامەت هات، ئەمەش یەکەمینی نیشانەکانیەتی.. زۆر ترسام.. یادی هەموو کردەوەکانی خۆمم کردەوە، کردەوەی چاك و کردەوەی خراپ... زۆر زۆر پەشیمان بووم.. پەنجەکانی خۆمم گەست لەسەر ئەو کردەوە خراپانەی کە کردبووم.. لەکاتێکدا ترس دای گرتبووم، ووتم ئێستا من چی بکەم؟ چۆن ڕزگارم ببێت؟.. گوێم لە بانگ کەرێکەوە بوو دەیووت: ئەمڕۆ پەشیمانی سوودی نیە... بە کردەوەکانت پاداشتت دەدرێتەوە... تۆ لەکوێبوویت لەکاتی نوێژەکانتدا؟ لەکوێ بوویت کاتێ فەرمانەکانی خوات بۆ دەهات؟ بۆچی وەڵامی فەرمانەکانی خوات نەدەدایەوە و دوور نەدەکەوتیتەوە لەقەدەغە کراوەکانی؟ تۆ بێئاگابوویت لە پەروەردگارت.. کاتەکانت بەسەردەبرد لە یاری و گۆرانی و ڕابواردن، ئێستاش هاتوویت و دەگریت.. ئێستا سزای خۆت دەبینی.. بێئومێدیم زیادی کرد، کاتێ گوێم لێبوو پەیمانی دا بەسزادانم.. هەردەگریام و دەگریام بەڵام سوودی نەبوو.. ئا لەو ساتە زۆر نارەحەتەدا خەبەرم بوویەوە.. هەستم بەخۆم کرد کەلەسەر جێگاکەم ڕاکشاوم.. بڕوام نەدەکرد کە ئەمە خەوە دەیبینم، هەتا دڵنیا بووم لەخۆم..

هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا..بەڵام هێشتا ترس بەری نەدابووم.. بیرم کردەوە و بەخۆمم ووت: بەخوا ئەمە ئاگادارکردنەوە بوو لەلایەن خواوە.. و ڕۆژی حەشر و زیندوو بوونەوە هەرئەبێ ڕوو بدات.. دەی کەواتە بۆچی دەبێ سەرپێچی خوای گەورە بکەم.. بۆچی واز لەو کارانە نەهێنم کە خوای گەورە قەدەغەی کردوون... پرسیارگەلێکی زۆر بەمێشکمدا دەهات و تەنها منیش یەك وەڵامم شك ئەبرد بۆیان. بگەڕێرەوە بۆلای خوا هەتا ڕزگارت ببێ لەو ڕۆژە سەختە..ڕۆژ بوویەوە و نوێژی بەیانیم کرد.. هەستم بە شیرینی کرد لەناخ و دەروونمدا.. لە چێشتەنگاوی ئەو ڕۆژەدا سواری ئۆتۆمبێلەکەم بووم.. تەماشای ناویم کرد پڕ بوو لە کاسێتی گۆرانی.. دەرم هێنان و تەنها چەند کاسێتێکی ئیسلامیم تیایاندا هێشتەوە و ئەوانی ترم فڕێدا.. بەو شێوەیە مامەوە.. هەموو ڕۆژێ هەنگاوێکم دەنا بەرەو ڕێگای هیدایەت کە داوا لەخوای گەورە دەکەم من و ئێوەش چەسپاو بکات لەسەری.. ئەمڕۆ زۆرن ئەوانەی بەدنیای تەواو بوو هەڵخەڵەتاون، و بێئاگان لەو ڕۆژە مەترسیدارە کە مرۆڤ ڕادەکات لە براکەی و دایکی و باوکی و هاوڕێی و منداڵەکانی ﴿يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ مِنْ أَخِيهِ(٣٤)وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ(٣٥)وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ(٣٦)﴾عبس..ڕۆژێکە هیچ ماڵ و منداڵ و سامانێك سوودی نیە مەگەر کەسێ بەدڵێکی پاکەوە بەرەو ڕووی خوا بووبێتەوە{يَوْمَ لاَ يَنفَعُ مَالٌ وَلاَ بَنُونَ(٨٨)إِلاَّ مَنْ أَتَى اللَّهَ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ(٨٩)}نور...

# ١٤- ﴿تەوبەی لاوێکی بێئاگا دوای وەفاتی خوشکێکی ئیمانداری﴾

خاوەنی چیرۆکەکە دەڵێ:﴿من لاوێکی بێئاگا بووم لە خوای گەورە، دوور بووم لێی، ڕۆچوو بووم بەناخی سەرپێچی و تاوانەکاندا.. کاتێ خوای گەورە ویستی ڕێنومایم بکات، تووشی ڕووداوێکی کردم و گەڕاندمیەوە بۆ هۆشی خۆم، و بۆ سەر ڕێگای ڕاست و دروست.. فەرموون ئێوە و چیرۆکەکە..

ڕۆژێکیان.. دوای ئەوەی ڕۆژانێکی جوانمان بەسەر برد لە سەیرانێکی خێزانیدا لەشاری﴿الدمام﴾.. بە ئۆتۆمبێلەکەم بەڕێگای خێرادا کەوتمە ڕێ لەنێوان﴿الدمام﴾و ﴿الرياض﴾دا، هەرسێ خوشکەکەم لەگەڵدا بوو.. لەبری ئەوەی دوعا سوننەتەکانی سەفەر بڵێمەوە، شەیتان بە دەنگی خۆی هەڵیخەڵەتاندم و دەنگی حەرامی لە لا شیرین کردم تا بێئاگابم لە خوای گەورە.. لەو کاتەدا سوور نەبووم لەسەر گوێبیستی ئێزگەی قورئانی پیرۆز یان کاسێتە ئیسلامیە بەسوودەکانی مامۆستا و زانایان ، چونکە هەق و ناهەق هەرگیز لەیەك دڵدا كۆ نابنەوە، یەکێ لە خوشکەکانم ئیماندارێکی چاك بوو.. هەمیشە زیکری خوای دەکرد و سنورەکانی خوای دەپاراست.. داوای لێکردم کە ئەو دەنگە ناهەقە لابەرم و گوێ لەدەنگی هەق بگرم، بەڵام... من چۆن وەڵامی ئەوە دەدەمەوە لە کاتێکدا شەیتان زاڵبووە بەسەرمدا، هەموو ئەندامەکان و دڵمی داگیر کردووە، بەهۆی دەروون بەرزیمەوە داواکاریەکەیم ڕەت کردەوە.. لەو ڕەت کردنەوەیەدا دوو خوشکەکەی تریشم پشتگیریان کردم.. خوشکە ئیماندارەکەم داواکاریەکەی دووبارە کردەوە، منیش زیاتر گیر و سەرسەختیم نواند.. دەستمان کرد بە گاڵتە پێکردن پێی.. بەڵکو بەگاڵتە پێکردنەوە پێم ووت: ئەگەر پێتخۆشە داتدەبەزێنمە قەراغ ڕێگاکە.. خوشکەکەشم بەناچاری بێدەنگ بوو.. لەدڵی خۆیدا ڕقی لەو کارە بوو.. بەڵام ئەو ئەرکی سەرشانی خۆی ڕاپەڕاند، و خوای گەورە زیاد لەتوانای کەسێك داوا ناکات..

لەپڕ... بەقەدەری خوای گەورە یەکێ لە تایەی ئۆتۆمبێلەکەمان تەقی، ئێمەش زۆر بەخێرایی دەڕۆشتین، ئۆتۆمبێلەکە لەسەر ڕێگاکە لای داو کەوتە کەنارێکی ڕێگاکەوە لە تەنیشتمەوە دوای ئەوەی چەند جارێ تەقلەی دا، بە وەرگەڕاوی مایەوە.. لە

حاڵێکدا ماینەوە بێجگە لە خوا کەس نەیدەزانی، خەڵکی کۆبوونەوە لە ئۆتۆمبێلە تێکشکاوەکەمان.. خەڵکی خێرخوا هاتن و لە نێو شوشەو دەرگاو جامی شکاودا دەریان هێناین... بەڵام چی ڕوویدا؟ هەموومان بەسەلامەتی هاتینە دەر تەنها چەند برینداربوونێکی کەممان پێوە بوو.. تەنها خوشکە ئیماندارەکەمان نەبێت.. خوشکە خۆڕاگرەکەمان.. خوشکە پاکیزەکەمان.. کە بەڕاستی دوا هەناسەی لەژێر ئۆتۆمبێلەکەدا دابوو.. بەڵێ... خوشکە ئازیز و خۆشەویستەکەم کە گاڵتەمان پێدەکرد وەفاتی کرد.. خوای گەورە بردیەوە بۆلای دیداری خۆی.. دەخوازم کە خوای گەورە پلەی بەرز بکاتەوە لە بەهەشتی بەریندا.. بەڵام من بۆحاڵی خۆم دەگریام.. پێش ئەوەی بۆ حاڵی خوشکەکەم بگریم.. پەردە بەڕووومدا لادرا، ڕاستەقینەی دەروونم بۆ دەرکەوت.. و ئەو بێئاگایی و تیاچوونەی کە تێی کەوتبووم.. بۆم دەرکەوت کە خوای گەورە خێری ویستووە بۆ من و تەمەنی نوێی بۆ نوسیوم.. تا ژیانێکی نوێ دەست پێبکەم کە پڕبن لە ئیمان و کردەوەی چاك، بەڵام خوشکە ئازیزەکەم هەرکاتێ یادم دەکردەوە، فرمێسکی پەشیمانیم بۆ دەڕشت، و لە خۆمم دەپرسی: ئایا خوای گەورە لێم خۆش دەبێ؟ وەڵامەکەشم لە قورئانی پیرۆزدا دەبینیەوە کە خوای گەورە دەفەرموێ: { قُلْ يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ(٥٣)}الزمر..واته:﴿بڵێ(ئەی محمد، خوا دەفەرموێ) ئەی ئەو بەندانەم کە ڕۆچوون لە خراپەکاریدا، بێئومێد مەبن لە ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار، بە ڕاستی خوای گەورە لە هەموو گوناهەکان خۆش دەبێت، بە ڕاستی ئەو لێبووردە و میهرەبانە} .

لە کۆتاییدا﴿ئیماندارانی ڕێگای خوا﴾ ئاگادارتان دەکەمەوە لە بێئاگایی.. ئەی ئەوانەی بێئاگان، هۆشکەنەوە، پەندو وانە لەکەسانی تر وەربگرن پێش ئەوەی خۆتان ببن بە پەند بۆ کەسانی تر..

## ١٥- «تەوبەکردنی دوو لاو لە فرۆکەخانە لەسەر دەستی یەکێ لە زانایان»

(داوا لەئامادەبوانی گەشتیار دەکەین بۆ گەشتی ژمارە... کە دەروات بەرەو.... با بێن بۆ هۆڵی دەرچوون... ئامادەبن بۆ گەشتەکەیان) ئەم دەنگە لەهەموو لایەکی فرۆکەخانەکە دەزرنگایەوە.. یەکێ لە بانگخوازان لەو کاتەدا لە هۆڵەکە دانیشتبوو، جانتاکانی پێچابوویەوە ئامادەبوو بۆ گەشت بۆ وولاتی بەرفراوانی خوای گەورە بۆ بانگەواز کردن بۆ لای خوا.. گوێی لەو بانگکردنەوە بوو، هەستی بە نارەحەتییەک کرد لە دڵیدا.. ئەو دەیزانی کە زۆربەی خەڵکی بۆچی دەچن بۆ ئەو وڵاتانە.. بە تایبەتی لاوەکان.. لەپڕ ئەو زانا بەڕێزە چاوی کەوت بە دوو لاو کە تەمەنیان لە دەوروبەری (٢٠) ساڵیدا بوون، لە ڕواڵەتیاندا دیار بوو کە بە راستی هیچیان ناوێت تەنها ئارەزوو تێرکردنی حەرام نەبێت لەو وڵاتانە کە بەوە ناسرابوون..

(پێویستە تا کات بەسەر نەچووە ڕزگار بکرێن) مامۆستاکە لە دڵی خۆیدا وای ووت.. سوور بوو لەسەر ئەوەی کە بڕوات بۆ لایان و ئامۆژگاریان بکات.. شەیتان لەبەرچاویدا وەستاو پێی ووت: (چیت داوە بەسەریانەوە؟ وازیان لێ بێنە بابەدەم کاتی خۆشیانەوە بڕۆن، ئەوان وەڵامی تۆ نادەنەوە).. مامۆستا هەر سوور بوو لەسەر بڕیارەکەی خۆی و ئاشنا بوو بە فێڵ و وەسوەسەی شەیتان.. بۆیە تفی کردە ڕوخساری شەیتان، و ڕۆشت بەدەم کاری خۆیەوە و گوێی بەهیچ نەدا.. لە تەنیشت دەرگای چوونە دەرەوەدا دوو لاوەکەی وەستاند، دوای ئەوەی کە سڵاوی لێ کردن، ئامۆژگاریەکی کاریگەری ئاراستە کردن، پێی ووتن: ڕاتان چۆنە ئەگەر ناتەواویەک لە فڕۆکەکەدا ڕوو بدات، و (خوانەکا) ئێوەش تیا بچن و هەر هەمان نیاز و نیەتتان هەبێت لەسەر ململانێ لەگەڵ خوای گەورە.. بە چ ڕوویەکەوە لە ڕۆژی دواییدا دەچنە بەردەم پەروەردگار؟!.. چاوانی ئەو دوو لاوە پڕ بوون لە فرمێسک، دڵیان نەرم بوو بۆ ئامۆژگاریەکانی ئەو زانا بەڕێزە.. بە پەلە پاسپۆرتی گەشتەکەیان دڕاند و ووتیان: مامۆستا گیان: بەڕاستی ئێمە درۆمان کرد لەگەڵ کەسوکارمان، پێمان ووتن ئێمە دەڕۆین بۆ مەککە یان جددە، چی بکەین باشە، چیان پێ بڵێین؟ زاناکە یەکێ لەقوتابیەکانی خۆیی لەگەڵدا بوو پێی ووتن: ئێوە هەردووکتان لەگەڵ ئەم برا بەڕێزەدا بڕۆن، ئەو هەڵدەستێ بە سازدان و ئیصلاحی کاروبارتان.. هەردوو لاوەکە

لەگەڵ هاوڕێکەیاندا ڕۆشتن، سووربوون لەسەر ئەوەی کە یەك هەفتەی تەواو لەلای بمێننەوە، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای کەسوکاریان.. لەو شەوەداو لەماڵی ئەو لاوە ﴿قوتابی زاناکە﴾ یەکێ لە بانگخوازەکان ووتەیەکی کاریگەری ئاراستەکرد کە جۆش و خرۆشی ئەمانی زیاد کرد، دوای ئەوە دوو لاوەکە بڕیاریان دا کە بڕۆن بۆ مەککە بۆ ئەنجامدانی عەمرە.. بەو شێوەیە شتێکیان دەویست و خوای گەورەش شتێکی تری دەویست، ئەوەی کە خوای گەورە ویستی لە بەیانیدا، دوای ئەوەی هەموان نوێژی بەیانیان ئەنجامدا، هەرسێکیان بەرەو مەککە کەوتنە ڕێ، دوای ئەوەی لەکاتی خۆیدا ئیحرامیان پۆشی، لەڕیگادا کۆتایی بەژیانیان هات، ڕێگاکە دوا مەنزڵی دنیای ئەوان بوو... لەڕێگادا بەرەو خانەی ڕۆژی دوایی کەوتنە ڕێ.. توشی ڕووداوێکی دڵتەزێن بوون، هەموویان بوونە قوربانی، خوێنی پاکیان تێکەڵ بە شووشە پەرش و بڵاوەکان بوو بوو.. دوا ووتەیان و دوا هەناسەیان لەو ڕووداوەدا سپارد.. ئەم ووتە نەمرانەیان دەوتەوە﴿لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك...إن الحمد و النعمة لك و الملك لا شريك لك﴾ ئەبێ نێوانی دڕاندنی پاسپۆرتەکەیان بۆ ئەو وولاتە پڕ فەسادانە و نێوان مردنیان چەند بوو بێت؟! چەند سەعاتێکی دیاری کراو بوو.. بەڵام خوای گەورە وویستی وا بوو ڕێنومایی بکرێن و رزگاریان ببێت.. دانایی و حەکیمی مەزن هەر لە لای خواوەیە، خوێنەری موسڵمان: ئەگەر دەروونی پڕ خراپەکارت ململانێی لەگەڵ کردیت بۆ سەرپێچیکردنی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی، ئەوە لەو ساتەدا یادی هەرەس پێهێنەری لەزەتەکان و پچڕێنەری شەهوەت و ئارەزوەکان و دوورخەرەوەی دۆستان بکەرەوە کە مردنە، وە ئاگاداربە کە مردن نەیەت بۆت و تۆش لە حاڵەتێکدا بیت لە ڕەزامەندی خوای گەورەدا نەبێت و ئەوکاتەش لە زیانمەندان دەبیت.. ئەگەر لە پەنهانی و تاریکیدا بوویت گومانت بۆ درووست بوو، دەرونیشت بانگی دەکردیت بۆ سەرپێچی ... ئەوە شەرم لە تەماشاکردنی خوای گەورە بکەو بە دەروونت بڵێ:

ئای کەچەند دوورە لە یەك ئەوکەسەی کە دەمرێت و لە ئامێزی(   )دایەو ئەو کەسەی ئەمرێت و سوجدەی بۆ پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان بردووە، چەند دوورن لە یەك ئەو کەسەی سەرقاڵی ئارەزوو و خراپەکردن و سەرپێچیەو ئەو کەسەی کە دەمرێت و یادی خوای گەورە دەکاتەوە..

## ١٦- ﴿تەوبەی لاوێك دوای لە دەسدانی بینایی﴾

تەماشای شتی حەرامی دەکرد، کاتێ بینایی لەدەستدا ڕادەی ڕۆزی خوای بۆ دەرکەوت لەسەری، تەوبەی کرد و پەشیمان بوویەوە لەسەر ئەوەی کە ڕابورد.. ئەو تەوبەکارە دەڵێ: کەس بەهای ڕۆزی نازانێت هەتا لەدەستی نەدات.. من یەکێ بووم لەوانەی کەزۆر حەزم لە خوێندنەوە بوو.. ڕۆژانە زیاتر لە پێنج سەعات سەرقاڵی خوێندنەوە دەبووم.. هەر گۆڤار یان ڕۆژنامە یان کتێبی نوێم دەست بکەوتایە پیت بە پیتم دەخوێندەوە، تاوەکو خوی تەواوم پێوە گرتبوو.. بوو بوو بەبەشێك لە ژیانی ڕۆژانەم.. ڕۆژێکیان زۆر بەخێرایی ئۆتۆمبێلەکەمم لێدەخوڕی کۆنترۆڵی ئۆتۆمبێلەکەم لەدەستدا بەهۆی زۆری خێراییمەوە.. وەکو تۆپ تەقلەیدا، خۆم کێشا بەیەکێ لە عەموودە زەبەلاحەکان، سەرم تووشی چەند پیاکێشانێکی بەهێز بوو.. بۆ ماوەیەکی درێژ لە نەخۆشخانە چارەسەر دەکرام.. لەگەڵ توانای پزیشکان و دەستەبەربوونی ئامێری پزیشکی پێشکەوتوو.. بەڵام وویستی خوای گەورە لە سەروو ئەوانەوە بوو، قەدەری خوا وابوو کە بیناییم لەدەستدا.. هیچ چارەسەرێك سوودی نەبوو بۆم.. بووم بە نابینا و نەمدەتوانی موومارەسەی ئەو ئارەزووەم بکەم کە هەر لە منداڵیەوە گەورە بوو بوو لەگەڵم.. بوو بوو بە بەشێك لە گیانم و ژیانی ڕۆژانەم.. لەنێو ئەو مەینەتیە سەختەدا بە لەدەسدانی ئەو ڕۆزیە مەزنە، زیکری خوا و دوعا و ئارامگرتن و بەتەمابوونی پاداشت و گوێگرتنی بەرنامەدار بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، بە فەزڵی خوای گەورە تاکە دەروازە بوو.. بەڕاستی من لێرەدا ئەم هەموو گۆڕانەی ژیانم باس دەکەم بۆ هەموان، تا بیهێنمەوە یادی موسڵمانانی ئازیز کە تەقوای خوای گەورە زۆر گرنگە و سوود وەرگرتن لەهەموو شتێك کە ڕەزامەندی خوای گەورەی تێدا بێت..

بە ڕاستی من لە ڕابردوودا-بەداخەوە- لە زیادە ڕەوان بووم لە خراپەکاریدا، وە دووربووم لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.. و نەزەری حەرامم دەکرد.. ئێستاش پەنجەی دەستم دەگەزم لە پەشیمانیی کردەوە خراپەکانم... دەستی پەشیمانی بەرز دەکەمەوە بۆ لای خوای گەورە، تەوبەی ڕاستەقینە دەکەم، و من لێرەدا بەسەرهاتی خۆم باس دەکەم، بەڵکو ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ کەسانی تر.....

تۆبەکار(ئیبراهیم.ع.ن).

## ١٧- «تەوبەی موشادبوویەك»

ئەم تەوبەکارە دەڵێ: ویستگەی یەکەم لەژیانی مندا لە تەمەنێکی زۆر زوودا بوو، کاتێ کە تەمەنم ئەوکاتە تەنها شەش ساڵ بوو... وە پێش ئەوەی هۆش بکەمەوە و دەرك بەژیان بکەم و لێی تێ بگەم، بەرەو رووی «کارەساتێکی خێزانی» بوومەوە.. باوکم دایکمی تەڵاقدا.. جیا بوونەوە.. و کارەکە هەر بەوەوە نەوەستا، بەڵکو کارەکە ئاڵۆزتر بوو کاتێك دایکم بڕیاریدا کە شوو بکات.. و باوکیشم ژنێکی تری هێنا. منیش سەرگەردان بووم. لە[illegible] ئەم [illegible] دوانەدا [illegible]وتام.. وەك دەڵێن: «دووکار[illegible] [illegible]یان تاڵ کردبوو» لەلای باوکم بەرەو رووی خراپیەکانی باوەژنم دەبوومەوە.. لای دایکیشم مێردی دایکم هەمیشە چەپۆکی دەکێشا بە ڕوخسارمدا.. خۆش لەوەدا بوو من هەمیشە ئامادە بووم لای هەردووکیان، و هەروەها غائیب بووم لە هەردووکیان، ئامادە بوویەکی غائیب بووم... لەگەڵ ئەو باروودۆخە خێزانیە ناسروشتیەدا، لەگەڵ ئەو یەکالا بوون و پەرتەوازە خێزانیەدا... [illegible] ناو زۆنگاوی موشاد بوونەوە لەگەڵ هاوڕێی خراپدا.. [illegible]ندا ئەو د[illegible]م [illegible]وە کە لێی بێبەش بووم، و ئەو سۆز و گرنگیدانەی لێی [illegible] بووم. بێ[illegible] سۆز و گرنگیدانی دڵسۆزانە ئەجور بۆ خوای گەورە. [illegible] نیان.. وام [illegible] کاتەکانم [illegible] نێوان [illegible] و [illegible]د بووندا.. کاتێ باوکم لێی دەپرسیم لەکوێ بوویت؟ دەمووت: لەلای دایکم بووم.. کاتێکیش دایکم [illegible] بوویت: [illegible] لەلای باوکم بووم.. [illegible] هەردوکیان وا [illegible]نیان [illegible]م.. [illegible] تەدا [illegible] بووم... غائیب [illegible] و [illegible] ئەوە ئەو [illegible] بەرەو زۆن[illegible] برد... بەڵام [illegible] موشاد [illegible]؟

ئەوە بەسەرهاتێکی ترە و بۆتان دەگێرمەوە:

شەوێکیان.. دوای شەونشینیەك کەسەکان مەست بوو بوون و بووبوونە گاڵتەجاڕی مادەی هۆشبەر. هاتینە دەرەوە تا هەناسەیەك هەڵمژین. کاتێ ئێمە لە ئاسوودەییەکی درۆینەدا بووین ئۆتۆمبێلەکە چەندجارێ وەرگەڕا. ئێمە چوار شەیتان بووین لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا. هەرسێکیان وەفاتیان کرد و تەنها من مامەوە.. بە فەزڵی خوای گەورە

زۆر سەرسامانە ڕزگارم بوو.... لە نەخۆشخانە مامەوە بۆ ماوەی نەڕۆژ لە نێوان ژیان و مردندا.. بێئاگاییەکی تەواو... بە تەواوی وەك ئەوکاتەی کە پێشتر تیایدا دەژیام.. دوای ڕووداوەکە بەئاگا هاتمەوە لەو بێئاگاییە بچووکە بەسەر بێئاگاییەکی گەورەدا کە تێیدا دەژیام.. سەر لەنوێ خۆمم دۆزییەوە، هەستم بە ئیمان کرد دوای ئەوەی هەموو هەستێك لە ناخمدا مردبوو.. گەڕامەوە بۆ لای خوای گەورە بە داوای لێبووردن و ئیستیغفارەوە.. سوپاسی خوام دەکرد چونکە کۆمەکی کردم و ڕزگاری کردم لە دوو مردن: مردن لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا و مردنی موعتاد بوون.. لە نەخۆشخانە هاتمە دەرەوە و ڕاستەوخۆ بەرەو مزگەوت.. هەموو پەیوەندییەکم بە ڕابردومەوە پچڕاند.. سوپاسی خوا دەکەم کە چوومە مزگەوتەوە لەبری ئەوەی بچمە بەندیخانەوە.. ئێستا قورئانی پیرۆز خۆشەویسترین هاوڕێی منە، هۆگری ئەوم و ئەویش هۆگری منە، بە کورتی ئەمە بەسەرهاتی من بوو.. ئامۆژگاری برا لاوەکانم و کەسانی تریش دەکەم کە ئاگایان لە خۆیان بێت لە هاوڕێی خراپ.. ئەوانەی کە زمانیان لە هەنگوین شیرینترە، گورگن و لە پێستی مەڕدان.. دڵەکانیان وەك دڵی گورگەکان وایە.. هەروەها ئامۆژگاریان دەکەم کە دووربکەونەوە لە ماددە هۆشبەرەکان، کە بەڕاستی سەرچاوەی هەموو خراپەکاریەکن. خوای گەورە کۆمەکی هەموومان بێت.

# ١٨- ﴿تەوبەی لاوێکی موجاهید﴾

(ابو ثابت) لاوێك بوو خوای گەورەی ناسی بوو، بۆیە ژیانی بێسەرو بەری و خراپەکاریی واز لێهێنابوو.. ڕۆشتبوو بۆ ئەفغانستان تا بە خوێنی خۆی زەوی پاڵەوانێتی و فیداکاری پاراو بکات.. باسی بەسەرهاتی تەوبەکردنی خۆیمان بۆ دەکات و دەڵێت: ﴿ئێمە کۆمەڵە لاوێك بووین، هیچ مانایەکی کات و ژیانمان نەدەزانی، ئامانجمان تەنها ئەوە بوو ڕۆژەکان بەسەر بەرین، ساتەکان بگوزەرێنین، ویستی خوای گەورە وابوو، کە خزمێکمان-کە کوڕی پورم بوو- پێشمان کەوت و گەڕایەوە بۆ لای خوان پاشان بۆ جیهاد، لەوێ بۆ ماوەیەك کە خوا ویستی لەسەر بوو مایەوە، پاشان گەڕایەوە، سالم کە لە جیهاد گەڕایەوە کەسێکی تر بوو، بوو بووە جێگای ڕێزی هەموان لەناو خێزان و خزم و هاوڕێکانیدا.. جارێکیان هات بۆ ماڵمان و باسی جیهاد و فەزڵی جیهادی بۆ کردین، هانی دایکم و نەنکمیدا کە ئاڵتونەکانیان ببەخشن بۆ جیهاد.. قسەکانی کاریگەر بوون.. ئەوانیش ئاڵتونەکانی خۆیان بەخشی.. منیش، سەد ڕیاڵم دەرهێنا کە لە گیرفانمدا بوو، ووتم: سالم من تەنها ئەم سەد ڕیاڵەم هەیە، بیبە بۆ موجاهیدەکان، ئەویش بە هێمنیەوە وەڵامی دامەوە: ﴿نەخێر.. تۆ گیانت دەبەخشیت نەك ماڵ و سامانت، پشت بەخوا تۆ دەڕۆیت بۆ جیهاد﴾. تەماشای دایکم کرد، ووتم: ئەڕۆم ئەگەر دایە ڕازی بێت.. موفاجەئات لەوەدا بوو کە ئەویش ڕازی بوو.. بە حەماسەتێکی زۆرەوە لەو ڕۆژەوە گەشتی من بۆلای خوا دەستی پێکرد، بوومە هاودەمی سالم.. لەگەڵیدا ئاشنا بووم بە مزگەوت و بازنە زانستیەکان.. خۆش لەوەدا بوو پەیوەندیم لەگەڵ دایکمدا زۆر باشتر بوو، وەك لەو کاتەی سەردەمی سەرپێچی کردنم.. دوای ئەوەی لە ڕابردوودا بێزار بووبوو لێم، پێشتر گوێی پێنەدەدام بە سەفەرکردنم یان دیارنەمانم، بەڵام ئێستا کاتێ دوا دەکەوم بێتاقەت دەبێ.. و حەزی دەکرد دانیشێ لەگەڵمدا تا قسە بکەین پێکەوە.. لەو کاتەدا هەستم بەمانای نوێ دەکرد لە پەیوەندی دایك بە کوڕیەوە... ڕۆشتم بۆ ئەفغانستان... لەوێ لەسەر لمی بیابانی گەرمی ﴿قەندەهار﴾ بیری دەوروبەری شاری ﴿الدمام﴾م کردەوە.. چونکە ڕاهاتبووم سەر لە ئێوارانی درێژ لەگەڵ لاواندا لەوێ بەسەر بەرم، وە هەروەها دیمەنی کەو بڵێسە بەرز بووی بیرە نەوتەکانی دەوروبەری شاری ﴿الدمام﴾ی

دەهێنایەوە یادم.. بەڵام جیاوازیەکە گەورە بوو.. مەدفەع و قازیفەی شیوعیەکانم دەبینی کە ئاراستەی موجاهیدە کەم تفاقەکان دەرا، کە ئەمان تەنها خاوەنی هەندێ چەکی سووك بوون.. ئەمان بەرەو ڕووی دەبوونەوە و ﴿الله اکبر﴾یان دەوتەوە... هەر یەکێك لەوان ئامادە بوو بۆ دیداری خوای گەورە لە بەهەشتێکدا کە پانتاییەکەی بەرادەی ئاسمانەکان و زەویە.. یان هەردەبێ چۆك بەو شیوعیە بێباوەڕانە دابدات.. لەو ساتەدا چەندین وێنە هاتە بەرچاوم لە ژیانم، کە بەخێرایی بەبەردەممدا ڕەت دەبوو.. ڕوونترینیان ڕوخساری دایکی ئازیز و خۆشەویستم بوو کە ماڵئاوایی لێ دەکردم... وێنەی براکانم... ماڵەکەمان لە ﴿الثقبە﴾.. کەمێ گەڕامەوە بۆ دواوە تا یادی گەشتە ناخۆشەکان بکەم بەرەو خۆرهەڵاتی ئاسیا و شتی تر... وێنەی زۆری ئازاراوی لە بەردەممدا دەمبینی... پرسیارم کرد: ئایا خوای گەورە لێم خۆش دەبێ؟ لە خوای گەورە داواکارم... ئەمە بوو چیرۆکی ﴿ابو ثابت﴾ لەگەڵ ڕێنموونیدا، بەو شێوەیە نەتەوە مردووەکان بە جیهاد لە پێناوی خوادا زیندوو دەبنەوە... بەو شێوەیە دەروونە ڕووخاوەکان ئازاد دەبن و سەردەکەون کاتێ ڕۆحی جیهاد لە پێناوی خوادا لە ناخیاندا سەوز دەبێت..

## ١٩- ﴿بالاپۆشی﴾

ئەمەویٚ پەیامێك بنێرم بۆ هەموو خەڵکی بەو ئومێدەی ڕێنوومایی بێت و تەوبە بکەن پێش ئەوەی کات بەسەرچێت، وە دەمەوێ ئەو ڕاستیە بڵێم کە مرۆڤ لە هەموو شوێنێکی ئەم زەویەدا بە موسڵمانی لەدایك دەبێت، وە ڕووی دەمم ئاراستەی ئەوانە دەکەم کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کەموسوڵمانن، ئایا بەڕاستی تۆ وایت؟ هەرچی خواو پێغەمبەرەکەی فەرمانت پێ بدەن ئەوە دەکەیت یان تەنها بە ناسنامە موسڵمانیت؟

ئەمە بۆیادخستنەوەیە، بەڵام ئەو بەسەرهاتەم کەپڕیەتی لە ماتەمی و ناخۆشی بۆتانی دەگێڕمەوە لەڕێگەی سایتی مامۆستا عەمر خالیدەوە:

من ئافرەتێکی تەمەن بیست ساڵم و تاقانەم، دایکم و باوکم بێجگە لە من کەسیان نیە، هەر لەوکاتەوەی فامم کردووەتەوە لە خۆشگوزەرانیدا دەژیم و هەموو هۆکارەکانم لەبەردەستا بووە، لە قوتابخانە بیانیەکاندا خوێندوومە وە ئێمە بەزمانی عەرەبی قسە ناکەین کە زمانی قورئان و زمانی عەرەبە، تەنانەت لەماڵیشەوە، کەس و کارەکەم بەو زمانە قسەیان نەدەکرد لەگەڵمدا.. بۆچی؟ نازانم! بەنیسبەت باوکمەوە، دایکی ئەمریکی بوو، باوکمی فێری عەرەبی نەکردبوو هەرچەندە باپیریشم عەرەب بوو، بەو شێوەیە هەر لەمنداڵیەوە وا ڕاهاتبوو بەزمانی ئێمە لەگەڵماندا نەدوێ، ئەمەش یاسایەکی ستەمکارانە بوو کە سەپێنرابوو بەسەرمدا..

وورده وورده‌گەوره بووم، دەم بینی خزمانم و ناسیاوانم بە زمانێك قسە دەکەن کە من هیچیان لێ تێناگەم، کوڕان و کچانی مامم گاڵتەیان پێ دەکردم چونکە نەم دەتوانی وەکو ئەوان بدوێم، ماتەمی دایگرتم و، ووتم بە باوکم کە فێری عەرەبیم بکات، دوای هەوڵێکی زۆر ڕازیم کرد، بەڵام پێی ووتم کە نابێ نەنکم و باوام و دایکم بەمە بزانن..

وورده وورده دەستم کرد بە فێربوونی زمانی عەرەبی لای مامۆستایەکی ئافرەت، وە هەوڵم ئەدا تا فێری ببم بۆ ئەوەی ئەو ئاینەم بناسم کە بەهۆی بەخت ڕەشیمەوە کەس لە کەس و کارم فێری نەکردووم، کەس و کارم لەسەدا سەد ژیانێکی ڕۆژئاواییان بەسەر دەبرد و هیچیان لە ئاینەکەیان و ئەوەی پەیوەندی بە ئاینەوە هەیە نەدەزانی.

ئەگەر بهاتیتایەتە ماڵمان وات هەست دەکرد دەچیتە ماڵێکی بیانیەوەو پڕ لەتاوان، مەشروبات و پۆشاکی ناشەرعی و ئاهانگانێك کە خواو پێغەمبەری خوایان تووڕە

دەکرد، بۆچی وایان دەکرد؟ چونکە لەو ژیارو کۆمەڵگا مۆدێرنەدا پیاوانت دەبینی لەگەڵ ئافرەتاندا سەمایان دەکردو ماچیان دەکردن تاکو نیوەی شەو، وات هەست دەکرد تەماشای فیلمێکی ڕۆژئاوایی بێ شەرمانە دەکەیت بەناوی شارستانی و پێشکەوتنەوە هەموو ئەمانە بەبەرچاوی منەوە ڕوویان دەداو هەموان هانیان دەدام کەمنیش ئەوە ئەنجام بدەم کە ئەوان دەیکەن، تاببمە کەسێکی مۆدێرن..

پاش ماوەیەك وورده وورده ڕاستێتی ئیسلامم بۆ دەرکەوت، پەروەردگار چیم لێ داوادەکات؟ دەبێ بیپەرستم بە بەزارو بەکردار، وام لێهاتبوو بووبوومە مەترسیەکی گەورە بەسەریانەوە.. داوام لێکردن زۆر بەلێبڕاوانە کە پێویستە واز لەو کردەوە قیزەون و خراپانە بێنن کە پێی هەڵدەستن، دەنگم وورده وورده دلێرو دلێرتر دەبوو چونکە دەنگی هەقە.. ویستیان بەچەندین ڕێگا بێدەنگم بکەن.

بێتاقەت نەبووم چونکە پەروەردگارم داوامان لێ دەکات کە بێتاقەت نەبین و چۆك دانەدەین... لەگەڵ مامۆستاکەمدا کە فێری دەکردم چووم بۆ بازاڕو حیجابێك و قورئانێکم کڕی و چووم بۆ ماڵیان و فێری چۆنیەتی دەست نوێژو نوێژی کردم کە کەس و کارم نەیان دەزانی، چونکە سفری دوای فاریزەو سەرگەردان بوون و نوێژو ڕۆژوو زەکات و حەجیان ئەنجام نەئەیا، چۆن منداڵ لەسەر ئەو نەریتە خراپە پەروەردە دەکەن؟

بۆچی دەژین؟ تەنها بۆ کارکردن و خواردن و شەوانە بەسەربردن و ڕابواردن... ئایا پەروەردگار بۆ ئەوەی دروست کردوون؟ بەڵێ بیروباوەڕیان بەو شێوەیە بوو بەبێ بەها یان ڕەوشت، بەڵام من سوپاسێکی زۆری پەروەردگارم دەکەم کە ڕێنومایی کردم بەفەزڵی خۆی زۆر بە جوانی وەڵامی دامەوە چونکە هەرگیز بەشداری کارە خراپەکانی ئەوانم نەدەکرد وە هەروەها نەم دەویست خوا لەخۆم بڕەنجێنم چونکە زۆرم خۆش دەویست بۆیە پابەندبووم بە نوێژو باڵاپۆشی و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزەوە، هەرچەندە قورئانم بەناڕەحەتی بۆ دەخوێنرایەوە بەهۆی شارەزایی کەمم لە زمانەکەدا، شتێکی ناخۆش ڕوویدا کە چاوەڕوانم نەدەکرد ئەویش ئەوەبو کە کەس و کارم زۆر بەتوندی دژایەتی باڵاپۆشی منیان دەکرد و بەزۆر لەبەریان دادەکەندم و پێیان دەوتم

ئەگەر بەم پۆشاکە ناشارستانی و کۆنە پەرستی و دواکەوتووەو بتبینین ئەوە خێرنایەتە ڕێت...

داواکاریەکەیانم قبولْ نەدەکرد وە سووربووم لەسەرکاری خۆم، بۆیە باوکم هەڕەشەی لێ کردم ئەگەر بەو سەرسەختیەم بمێنمەوە ئەوە دەمنێرێ بۆ ئەو شارەی کە دایکی خۆیی لێیە تاخوێندنم لەوێ تەواو بکەم و بەتەنها لەوێ بم و بەبێ ئەوەی کەسیان چاودێریم بکەن..

چۆکم دانەدا لەبەردەم داواکاریەکانیان، مانم گرت لەخواردن و خواردنەوە بەڵکو دڵیان نەرم بێت و بانگم کەنەوەو ئەوەی پەروەردگارم و پێغەمبەرەکەی پێی خۆشە بیکەم.. بەڵام دڵیان دانەچڵەکا، بەڵکو منیان کردە قوربانی و ناردمیان بۆ وولاتی کوفرو خراپەکاری و فڕێیان دام تاوەکو لەدەست دەرچم و نوقمی کارانێك ببم کە پێچەوانەی ئاینی ئیسلامی بێت.. بەڵام پەروەردگارم لە گەڵمدابوو... دەست بەردارم نەبوو وە فڕێی نەدام وەك چۆن کەس و کارم وایان لێ بەسەرهێنام.. بەڵکو پەروەردگارم هاودەمم و یارمەتیدەرم بوو.. بەپەلە خۆم گەیاندە نزیکترین بنکەی ئیسلامی لەوێ و قسەم لەگەڵ هەندێ پسپۆڕدا کرد لەوێ، ئەوانیش سوپاسی زۆری پەروەردگاریان کرد کە من بیرم لەوان کردووەتەوە، منیش داوای کۆمەکیم لێ کردن و ئەوانیش هەرگیز کەمتەرخەمیان نەنواند لەگەڵمدا، بەڵکو پیاوێکی بەتەمەن کچێکی هەبوو لەتەمەنی مندا، ووتی: ئەو کچە وەك خوشکی تۆ وایە و فێری هەموو مەراسیمێکی ئاینیت دەکات، گەشتی نوێی پڕ لە ئیمانم دەستی پێکردو دڵم پڕ بوو لە خۆشەویستی پەروەردگار.. وە مامۆستا عەمر خالیدم بینی کە باسی ئەو هاوەڵەی دەکرد کە چۆن هەموو شتێکی لەپێناوی خوادا واز لێ هێنا، وەزۆر گریام چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆشی دەویست و شایەتی ئیمانی بۆدا بەهۆی خۆشەویستنی خواو پێغەمبەرەکەیەوە.. وە قورئانی زۆری دەخوێند، وە ئاواتەخوازم منیش وەکو ئەو وابم بەکۆمەکی خوای پەروەردگار.. کەس و کارم هاتن بۆلام وکاتێ زانیان من پابەندم بە بالاپۆشیەوە شێت و هار بوون و قسەی ناشرینیان پێ ووتم.. باوکم پێی ووتم: ئەگەر واز لەم کارانەت نەهێنیت، ئەوە هیچ شتێکت پێ نایەم و لە هەموو شتێکیش بێ بەریت دەکەم.. پێم ووت ((إقض ما أنت قاض إنما تقضي هذه الحياة الدنيا)).

## ٢٠- ﴿كوڕی قەشە﴾

لەو فڕۆکەیەدا کە لە جددەوە دەیبردم بەرەو پاریس، دوای ئەوەی کە ناسیمەوە کەوتمە دواندن لەگەڵی، سەری شۆڕکردبووەوە بەسەر پاڵپشتی کروسیەکیدا، دەیەویست بحەوێتەوە، پێم ووت: ابو محمد سڵاوت لێ بێت، ئەوە لەکوێی پیاو، بەڕاستی ڕێکەوتێکی جوانە کە لەم فڕۆکەیەدا پێت دەگەم، نایەڵم بخەویت، ئێستە کاتی خەوتن نیە، ئایا نابینن ئەو میوانانە پێویستیان بە ئامۆژگاری و ڕێنومایی هەیە، هەستە شتێ پێشکەش کە بە ڵکو ئەمە خوایە بەهۆی تۆوە یەکێکیان ڕێنومایی بکرێت، ئەوکاتەش ئەو کارەت خێری لە هەموو دنیا زیاترە بۆ تۆ، ئایە ئێمە نەتەوەیەکی بانگخواز نین؟ خەو بۆچی؟ هەستە لەم ڕۆوە حەسانەوە نیە.

پیاوە چاوی بەرزکردەوە و ڕوانی پیاما، هەرکە ناسیمی هەستایە سەر پێ و ووتی: دکتۆر (سەرحان) بڕواناکەم!! من زەوی دەگەڕێم بە دواتا، کە چی لە ئاسماندا ئەتبینمەوە، سڵاو سڵاو، بڕوام نەئەکرد لەم فڕۆکەدا بتبینم، بەڵام لەڕاستیدا لەخەیاڵی مندا بوویت، وام گومان دەبرد کە لەفەرەنسا دەتبینم، یان لە باشووری ئەفریقیا، ئایا هەر لەوێ کار ئەکەیت و بەڕێوەبەری ئۆفیسیڕابیتەیت؟ بەڵام پێم بڵێ، ئەمە کاتانێکی جوانە دەتبینم لەم فڕۆکەیەدا لەبەردەممدا وەستاویت!!.. بڕوا بەچاوەکانم ناکەم.

بڕوا بکە، برای بەڕێزم، بڕوابکە، ئایا نامبینی لەبەردەمتا وەستاوم، بیر لەچی دەکەیتەوە، دەت بینم بیرت پەرتەوازە بووە..

بەڵێ بیرم دەکردەوە، لەو منداڵە دە ساڵانەی لە جوهانسبرگ بینیم کە موسوڵمان بووبوو، لەکاتێکدا باوکی کە قەشە بوو موسوڵمان نەبوو بوو.

–چی؟ منداڵێك موسوڵمان بووبوو، باوکیشی قەشە بوو.. هەستە.. خێرا هەستە.. ئەو بەسەرهاتەم بۆ بگێڕەرەوە، من بۆنی چیرۆکێکیخۆش دەکەم، چیرۆکێکی بۆندار، دە هەستە توخوا بۆم بگێڕەرەوە.

–چیرۆکێك سەمەرەتر لە خەیاڵ، بەڵام خوای پەروەردگار ئەگەر وویستی لەسەر هەر شتێك بێت دەیگوزەرێنێ، هەمووشتێك بەدەستی ئەوە، پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار، کێی بوێ ڕێنومایی ئەکات و کێی بوێ سەرگەردانی دەکات.

فەرموو ئەوە تۆو چیرۆکەکە:

چفەرمانێك ئەدەیت بیدە، بێگومانبە لەوەی کە تۆ لەم دنیایەدا دەتوانیت فەرمان دەرکەیت چی ئەکەیت بیکە، ناگەڕێمەوە بۆ سەردەمی نەزانین کە تیایدا ئەژیاین، ئەو ڕۆژانەمان تێپەڕاند، من ئێستە بەختیارتین و خۆشترین و ڕێزدارترین ڕۆژەکانی ژیانم بەسەر ئەبەم، بەختیاریەك کە پێشتر نەم بینیوە، ناتوانی بەهیچ شێوەیە خوام لێ دوور بخەیتەوە.. من هەموو شتێك دەکەمە قوربانیی لە پێناوی ئەوەدا کە خوا لێم ڕازی بێت و بمخاتە بەهەشتەوە.. وە من لەم ماڵە سادەیەمدا لەلای ئەم پیاوە بەڕێزە، تکاو داوا دەکەم لە تۆو دایکم کە بگەڕێنەوە بۆلای خوا تەوبەیەکی یەکجارەکی بکەن، پێش ئەوەی لە کیستان چێت، بەڵام زۆر بەداخەوە گوێی لێ نەگرتم و قسەکانمی قبوڵ نەکردو بەجێی هێشتین بەبێ ئەوەی لا بکاتەوە.. وە من ئێستا لای ئەو پیاوە بەڕێزە ئەژیم بۆ پارێزگاریی لەسەر ئاین و ناسنامەکەم وەك ئافرەتێکی موسڵمان ڕێزم هەیە بۆی و پابەندم بە پۆشاکی شەرعیەوە کە پەروەردگارم فەرمانی پێداوم و نوێژ دەکەم و ڕۆژوو دەگرم و کەمێك لە داهاتم دەبەخشم و تێدەکۆشم لەپێناو ڕەزامەندی و خۆشەویستی پەروەردگاردا... من لەوپەڕی بەختیاریدام چونکە تام و چێژی شیرینی ئیمانم کردووە.

هەموو شتێك لەپێناوی خوادا بێت ئاسانە، ئەوەی لەگەڵ خوادابێت بێتاقەت نابێت چونکە هەمیشە لەگەڵتدایە بۆسەرخستنت، مادام تۆ بەردەوامیت لەسەرخستنی پەروەردگار.

داوا لەپەروەردگار دەکەم ڕاگیرو جێگیرم بکات لەسەر ئیمان و کردەوەی چاك، بەڕاستی پەروەردگار بیسەرو وەڵام دەرەوەیە.

لەشاری (جوهانسبرگ) بووم، جارێکیان لە مزگەوت نوێژم کرد، منداڵێکی دە ساڵانم بینی پۆشاکی عەرەبی لەبەردابوو، واتە پۆشاکی سپی، عەرەبی خلیجی بەسەرشانیەوە، وە چەفتەو عەگالێکیش بەسەریەوە..

دیمەنەکەی سەرنجی ڕاکێشام، عادەتی خەڵکی باشووری ئەفریقا نیە کە ئەو پۆشاکانە بپۆشن ئەوان پانتۆڵ و کراس لەبەر دەکەن، وە کلێتەیەکیش دەکەنە سەریان، یان ئەو پۆشاکە دەپۆشن کە موسوڵمانانی هیند و پاکستان دەیپۆشن.. بەلامدا ڕۆیشت و.. سلاوێکی ئیسلامیانەی لێ کردم، منیش وەلامەکەم دایەوە، پێم ووت: تۆخەڵکی سعودیەیت؟ ووتی: نەخێر، من موسوڵمانم خەڵکی هەموو وولاتێکی ئیسلامیم، سەرم سوڕما، لێم پرسی: بۆچی ئەم پۆشاکە خلیجیەت لەبەرکردووە، وەلامی دامەوە: چونکە شانازی پێوە دەکەم و ئەمە پۆشاکی موسوڵمانانەیە، پیاوێك بەویادا ڕەت بوو منداڵەکەی دەناسی، ووتی: لێی بپرسە چۆن موسوڵمان بووە؟ سەرم سوڕما لە پرسیاری پیاوەکە کە لەو منداڵە بپرسم چۆن موسوڵمان بووە.. ووتم بە پیاوەکە: ئایا موسوڵمان نیە؟ پاشان پرسیارەکەم ئاراستەی منداڵەکە کرد: ئایا تۆ پێشتر موسوڵمان نەبوویت؟ ئایا لە خێزانێکی موسوڵمان نیت؟!!..

پاشان چەندین پرسیار هات بە مێشکمدا، بەلام منداڵەکە پێی ووتم: چیرۆکەکەت لەسەرتاوە بۆ کۆتایی بۆ دەگێڕمەوە، بەلام یەکەم جار.. پێم بڵێ تۆ لە کوێوە هاتوویت؟

—من لە مەککەی پیرۆزەوە، هەر کە منداڵەکە گوێی لە وەلامەکەم بوو کە من لە مەککەی پیرۆزەوە هاتووم، بەرەو ڕووم هات و ویستی باوەشم پیادا بکات و ماچم بکات، وە هەر دەیوت: لە مەککەوە!! لە مەککەوە!! چەندە مشتاقم پیاوێك ببینم کە لە مەککەی پیرۆزەوە لە (بیت الله الحرام)ەوە هاتبێت، چەندە حەز بە بینینی ئەو شارە دەکەم.

سەرم سوڕما لە قسەکانی ئەو منداڵە.. پێم وت: توخوا بەسەرهاتی خۆتم بۆ باس بکە.. منداڵەکە ووتی: من کوڕی باوکێکی کاسۆلیکی قەشەم، بەلام دایکم لەڕووی فێربوونەوە گرنگیەکی زۆری پێ دەدام، هەمیشە لەگەڵ خۆیدا دەیبردم بۆ کەنیسە، وە پیاوێکی تەرخان کردبوو کە فێرم بکات و پەروەردەم بکات، پاشان باوکم لە

کتێبخانەی کەنیسەدا بەجێی هێشتم تا تەماشای گۆڤارەکانی تایبەت بە منداڵان بکەم ئەوانەی نەخشێنرابوون بە چیرۆکەکانی مەسیحیەت، ڕۆژێکیان کە لەکتێبخانەی کەنیسەکەدا بووم، دەستم بۆ کتێبێك برد کە لەسەر یەکێك لە ڕەفەکانی کتێبخانەکە دانرابوو، ناونیشانی کتێبەکەم خوێندەوە تەماشام کرد ئینجیلە.. کتێبێکی کۆن بوو، حەزم کرد تەماشای بکەم و لاپەڕەکانیم هەڵدایەوە.. "سبحان الله" هەر کە کتێبەکەم کردەوە چاوم کەوتە سەر (هەر لەیەکەم ڕوانیندا) دیدێکی سەیر، ئایەتێکم خوێندەوە دەیوت، ئەمە وەرگێڕانەکەیەتی: مەسیح وتی: پێغەمبەرێکی عەرەب دوای من دێت ناوی ئەحمەدە، سەرم سوڕما لەو ڕستەیە، بەپەلە خۆم گەیاندە باوکم.. زۆر بەسادەییەوە لێم پرسی بەڵام بەسەرسوڕمانەوە!

باوکە، باوکە: ئەو ووتانەت خوێندووەتەوە، لەو ئینجیلەدا؟

باوکم ووتی: کام ووتانە؟

–لەم لاپەڕەیەدا ووشەی سەیر هەیە.. مەسیح تیایدا ئەڵێ: کە پێغەمبەرێکی عەرەب دوای ئەو دێت.. باوکە ئەو پێغەمبەرە عەرەبە کێیە، کە مەسیح باسی دەکات کە دوای ئەو دێت؟ وە باسی دەکات کە ناوی ئەحمەدە؟.. ئایا هاتووە باوکە، یان هێشتا نەهاتووە؟..

برایانم بڕوام پێبکەن.. حەزم دەکرد گەشتەکەم درێژە بکێشێت تاوەکو بگەمە کۆتایی چیرۆکەکە.. چیرۆکەکەو بەسەرهاتەکانی سەرنجیان ڕاکێشابووم، هەر لەو کاتەوە کە (ابو محمد) دەستی پێ کردبوو..

ووتم: (ابو محمد) تەواوی کە، کات کەمە..

ابو محمد ووتی: ئەگەر دەتەوێ تەواوی بکەم، پێم مەبڕە، پێم ووت: ئەرام بە ابومحمد، ئەمەوێ بەخێرایی بەتەواوی چیرۆکەکە ئاشنابم.. ابو محمد ووتی: قەشەکە قیڕاندی بەسەر منداڵە بێ گوناهەکەدا و هاواری کرد: لەکوێ ئەم کتێبەت هێنا؟

–باوکە، لە کتێبخانەکە، کتێبخانەی کەنیسە، ئەو کتێبخانە تایبەتەی کە تیایدا دەخوێنیتەوە..

–ئەو کتێبەم نیشاندە.. هەر شتێکی تێدایە درۆیە و هەڵبەستراوە لەسەر مەسیح. بەڵام لەکتێبەکەدایە، لە ئینجلیلدایە، باوکە، ئایا نابینیت لە ئینجلیدا نوسراوە.....–

تۆ چیت داوه بەوەوە، تۆ لەو کارانە تێنلگەیت، تۆ هێشتا منداڵیت.. دەی بڕۆرەوە بۆ ماڵ.. باوکم دەستی ڕاکێشام و بردمیەوە بۆ ماڵەوە، هاواری دەکرد بەسەرمداو بەڵێنی دەدا، کە واو وام لێ دەکات، ئەگەر واز لەوە نەهێنم..

بەڵام زانیم کە نهێنیەك هەیە و باوکم دەیەوێ لێم بشارێتەوە، بەڵام پەروەردگارم ڕێنومایی کردم کە دەست بە گەڕان بکەم بەناو شتە عەرەبیەکاندا، تا بگەم بە ئەنجام.. دەستم کرد بەگەڕان بەدوای کەسانی عەرەبدا تا پرسیاریان لێ بکەم، چێشتخانەیەکی عەرەبیم بینیەوە لە شارەکەماندا، چوومە ژوورەوە، پرسیارم کرد دەربارەی پێغەمبەرە عەرەبەکە، خاوەنی چێشتخانەکە ووتی: بڕۆ بۆ مزگەوتی موسوڵمانەکان.. لەوێ لە من باشتر باسی ئەوەت بۆ دەکەن.. چووم بۆ مزگەوت.. هاوارم کرد لە مزگەوتەکەدا: لەم مزگەوتەدا عەرەبی تێدایە.. یەکێکیان ووتی: عەرەبت بۆچی یە؟.. پێی ووتن: ((دەمەوێ پرسار دەربارەی پێغەمبەری عەرەبی ئەحمەد بکەم؟..) یەکێکیان پێی ووتم: (فەرموو دانیشە) دەتەوێ چی بزانیت دەربارەی ئەو پێغەمبەرە عەرەبە؟..) ووتی: ((خوێندوومەتەوە مەسیح لە ئینجیلدا دەڵێ: پێغەمبەرێکی عەرەب کە ناوی ئەحمەدە دوای من دێت، ئایا ئەمە ڕاستە؟) پیاوەکە ووتی: (ئایا بەڕاستی ئەمەت خوێندەوە؟.. کوڕم ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاستە.. وە ئێمەی موسوڵمان شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرە عەرەبەین کە ناوی محمدە ﷺ وە قورئانی ئێمەش باسی ئەو شتەی کردووە کە تۆ باست کرد) منداڵەکە هاواری کرد.. وەك ئەوەی خۆی دۆزیبێتەوە: (ئایا بەڕاستە؟!!) (بەڵێ بەڕاستی.. کەمێك چاوەڕوانبە..) پیاوەکە ڕۆشت و تیراژێکی وەرگێڕدراوی ماناکانی قورئانی پیرۆزی هێنا.. لە سورەتی (الصف)دا ئایەتەکەی دۆزیەوە کە دەفەرموێ: ﴿ بشيراً برسول يأتي من بعدي اسمه أحمد ﴾ منداڵەکە هاواری کرد: (نیشانم بدە..) پیاوەکەش ئایەتە تەفسیرکراوەکەی نیشاندا..

منداڵەکە هاواری کرد: (خوایەگیان هەمان نووسراوی ناو ئینجیلەکەیە.. مەسیح درۆی نەفەرمووە) بەڵام باوکم درۆی لەگەڵ کردم.. چی بکەم تا منیش ببمە شوێنکەوتەی ئەو پێغەمبەرە (محمد ﷺ) پیاوەکە ووتی: پێویستە شایەتی بدەیت کە پەرستراو نیە بێجگە لە (الله) وە محمد بەندە و پێغەمبەری خوایە، وە عیسا بەندە و

پێغەمبەری خوایە، منداڵەکە ووتی: أشهد أن لا الە إلا الله وأن محمداً عبدە ورسولە، وأن عیسی عبدە ورسولە).

حەزرەتی عیسا مژدەی هاتنی ئەم پێغەمبەرەی داوە کە ناوی (محمد ﷺ).. ئەمڕۆ چەندە بەختیارم.. دەچم بۆ لای باوکم و مژدەی دەدەمێ) منداڵەکە بە دڵخۆشیەوە بەرەو لای باوکە قەشەکەی ڕۆیشت..

-باوکە، باوکە، ڕاستیم بۆ ئاشکرابوو.. عەرەبەکان لە ئەمریکادا هەن و موسوڵمانیش لە ئەمریکادا هەن، وە ئەوان شوێنکەوتەی محمدن ﷺ وە قورئانەکەیانم بینی کە باس لە هەمان ئەو ئایەتە دەکات کە نیشانم دایت لە ئینجیلەکەدا.. من موسوڵمان بووم..

باوکە من ئێستە موسوڵمانم.. دەی تۆش موسوڵمان ببە لەگەڵم دەبێ شوێن ئەو پێغەمبەرە بکەویت کە ناوی محمدە ﷺ.. عیسا لە ئینجیلدا وامان پێ دەڵێت..)

قەشەکە وەك هەورەگرمەیەك داباریبێت بەسەریدا.. منداڵە بچوکەکەی ڕاکێشاو خستیە ژوورێکی بچووکەوە و دەرگاکەی لەسەری داخست، و بەندی کرد..

داوای کرد بەزەیی لەگەڵیدا بەکار نەهێنرێت.. چەند هەفتەیەك لە بەندیخانەدا مایەوە.. خواردن و خواردنەوەی بۆ دەبرا، پاشان دەرگای لێ دادەخرایەوە.. کاتێك قەشەکە لەوەترسا کە کارەکەی لای حکومەت ئاشکرابێت -دوای ئەوەی لە قوتابخانەکەوە هەواڵی بۆ هات دەربارەی دیارنەبوونی کوڕەکەی- ترسا کارەکە تەشەنە بسەنێ.. و بەهۆیەوە بخرێتە بەندیخانەوە.. بیری لە دوور خستنەوەی کوڕەکەی کردەوە بۆ تەنزانیا لە ئەفریقیا، کە دایك و باوکی ئەم قەشەیە لەوێ دەژیان..

جۆیە لە ئەنجامدا ناردی بۆ ئەوێ، وە هەواڵی دا بە دایك و باوکی کە بەزەییان پیایدا نەیەتەوە.. ئەگەر منداڵەکە هەر سوور بوو لەسەر کەللە ڕەقیەکەی.. ئەگەر پێویستی کرد بیکوژن، ئەوە هەر لەوێ بیکوژن.. لە ئەفریقیا کەس بەدوایدا ناگەڕێت!! منداڵەکە سەفەری کرد بۆ تەنزانیا، بەڵام ئیسلامی لە یاد نەکرد.. لەوێش بەدوای موسوڵمانەکاندا دەگەڕا، تا مزگەوتێکی بینیەوە و چووە ناوەوەو لەگەڵ چەند موسوڵمانێکدا دانیشت و باسی خۆیی کرد بۆیان.. ئەوانیش سۆزیان نواند

بەرامبەری.. وورده وورده فێری ئیسلامیان کرد، بەڵام باپیری بەکارەکەی زانی.. بۆیە گرتی و بەندی کرد وەك چۆن باوکی پێشتر وای لێ کرد..

پاشان دەستیکرد بە سزادانی منداڵەکە.. بەڵام سەرکەوتوو نەبوو لە پەشیمان کردنەوەیدا، وەنەی دەتوانی ڕێگای خواپەرستی لێ بگرێت، بۆیە بەندکردنی و سزادانەکەی زیاتر ئیمانی منداڵەکەی پتەو دەکرد و زیاتر هۆگری پەروەردگار دەبوو، لەکۆتاییدا باپیری وویستی ڕزگاری بێت لێی، بۆیە ژەهری کردە خواردنەکەیەوە.. بەڵام پەروەردگار هات بەهانایەوە و بەو تاوانە نامرۆییانە تیا نەچوو.. دوای ئەوەی کەمێکی لە خواردنەکە خوارد هەستی کرد کە گەدەی ئازاری ئەدات و خۆی ڕشاندەوە، پاشان لەو ژوورەیدا کە دەیڕوانی بەسەر بەلە کۆنەکەدا لەوێشەوە بۆ باخچەکە خۆی هەڵدا.. بەخێرایی ڕایکرد.. چوو بۆ لای کۆمەڵی ناو مزگەوتەکە، کە ئەوانیش بە خێرایی چارەسەری پێویستیان بۆ ئەنجامدا.. تا خوای پەروەردگار شیفای تەواوی بۆ نارد.. پاشان پێی وتن کە لای خۆیان حەشاری بدەن.. پاشان لەگەڵ یەکێکیاندا بەرەو ئەسیوبیا ڕفاندیان.. لە ئەسیوبیا لە سەردەستی ئەم منداڵە دەیان کەس موسوڵمان بوو، بانگی دەکرد بۆ ئیسلامەتی.. (چی؟.. دەیان کەس لە سەردەستی ئەم موسوڵمان بوون؟!!..) پرسیارم لە (ابومحمد کرد.. هاواری کرد بەسەرمدا کە بێدەنگ بم ئەگەر ئەمەوێ بەردەوام بێت لەسەر بەسەرهاتەکەم..

بۆیە خێرا بێدەنگ بووم.. ابو محمد وتی: منداڵەکە پێی ووتم: پاشان ترسیان هەبوو لەسەرم بۆیە ناردمیان بۆ باشووری ئەفریقیا.. ئەوەتا من ئێستا لە باشووری ئەفریقیام.. نیشتەنی زانایان ئەکەم و لەکۆبونەوەکانی بانگخوازاندا ئامادە دەبم لە هەر کوێ یەك بێت.. و خەڵکی بانگ دەکەم بۆ ئیسلام.. ئەو ئاینە هەقە.. ئاینی فیترەتە.. ئەو ئاینەی پەروەردگارمان فەرمانی پێ دەدات کە شوێنی بکەوین..

کۆتاهەمین ئایین، ئەو ئاینەی عیسای مەسیح مژدەی پێداوە، کە پێغەمبەرێك ناوی محمدە ﷺ دوای ئەو دێت و لەسەر هەموو خەڵکی جیهان پێویستە کە شوێنی کەون..

..مەسیحییەکان ئەگەر بەڕاستی شوێنی مەسیحیەتی ڕاستەقینە بکەون ئەوە بەختەوەری دنیاو قیامەت دەبن.. ئەوەتا ئەوە ئەو ئینجیلەبوو کە دەستکاری نەکرابوو کە لەکتێبخانەکەی کەنیسە لە شیکاغۆ بینیم، بەو شێوە نوسرابوو تیایدا..

خوای پەروەردگار ئەو کتێبەی نیشاندام، وە لەیەکەمین لاپەڕەدا کە کردمەوە، وە یەکەمین دێڕ کە خوێندمەوە.. ئەمەی تیادا نوسرابوو( مەسیح ووتی بێگومان پێغەمبەرێکی عەرەب دوای من دێت کە ناوی ئەحمەدە).. پەروەردگارا.. چەندە بەبەزەییت.. چەندە مەزنیت، بەبێ ئەوەی حیساب گیری بۆ بکەم ڕێنومایيت کردم.. لەکاتێکدا من کوڕی ئەو قەشەیەم کە مل نادات و دان بەو ڕاستیەدا نانێت! کاك دکتۆر کاتێك کە گوێم لەو منداڵە بچووکە گرتبوو چاوانم پڕبوون لە ئاو.. بەڕاستی موعجیزەیە.. لەو تەمەنە بچوکەدا، خوای گەورە بە موعجیزەیەك ڕێنمایی کردووە کە من هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات.. هەموو ئەو دووریەی بڕیوە بۆ پارێزگاری لە ئاینەکەی.. بەجوانی گوێم لەبەسەرهاتەکەی گرت.. و تەوقەم کرد لەگەڵیدا و ماچم کرد، و پێم ووت خوای گەورە بەوویستی خۆی خێر لەسەر دەستی دەنوسێت.. پاشان منداڵەکە خواحافیزی لێ کردم.. و بە مزگەوتەکەدا دەگەڕا.. ئەو ڕوخسارە پڕ لە نوور و ئیمانەم لەیاد ناچێت، ڕووخساری ئەو منداڵە بچووکە.. کە خۆی ناونابوو محمد.. ووتم بە ابو محمد:

برای بەڕێز کارت تێکردم.. بەڕاستی چیرۆکێکی سەیربوو.. وات لێکردم کە بەتاسەوەبم بۆ بینینی ئەو منداڵە بچوکە.. قسەکانم تەواو نەکرد، گوێم لە دەنگی کارمەندی ناو فڕۆکەکەوە بوو کە هەواڵی داینێ لە شوێنی خۆمان دانیشین، نزیك بووینەتەوە لە فڕۆکەخانەی (شارل دیگۆل)ی نێودەوڵەتی لە پاریس..

لە شوێنی خۆم دانیشتم و ئەم ئایەتەم لەبەرخۆمەوە دەوتەوە ﴿ إنك لا تهدي من احببت ولكن الله يهدي من يشاء ﴾.

واتە: (ئەی پێغەمبەر) تۆ ناتوانی ڕێنمایی کەسێك بکەیت کە خۆشت دەوێت، بەڵکو خوای گەورە ڕێنومایی هەرکەسێ دەکات کە خۆی دەیەوێ.

جارێکیان گەشتم کرد بۆ باشوری ئەفریقیا، وە ووێنەی ئەو منداڵە (محمد) لە مێشکمدابوو لێم جیانەدەبووەوە، پرسیارم دەکرد دەربارەی.. پێیان دەوتم ئەو پێشتر لێرەبوو وە گەشتی کردووە بۆ شارێکی تر، و خەڵکی بانگ دەکات بۆ لای خوا.. زۆرم حەز دەکرد کە بیبینم، وە هەر ڕۆژێك دەبێت –پشت بەخوا– کە بیبینم.. ئەگەر خوای گەورە تەمەنمان بداتێ.. ئایا ئێوەش ئەو حەزەتان تێدایە؟.

# ٢١-﴿كەڕو لاڵێکی ڕەوانبێژ﴾

ئەمە یەکێکە لە چیرۆکە سەیرو سەمەرەکان، ئەگەر خاوەنەکەی خۆی بە دەستی خۆی نەینوسیبایە بۆم، گومانم دەبرد کە ڕووینەدا بێت. خاوەن چیرۆکەکە خەڵکی شاری مەدینەیە، دەڵێت:

من لاوێکی تەمەن سی و حەوت ساڵانم، ژنم هێناوە، و منداڵم هەیە، هەر شتێك حەرام و قەدەغە بوایە دەمکرد. و نوێژ کردنم ئەنجام نەئەدا، مەگەر تەنها لە بۆنەکاندا ئەویش تەنها بۆ موجامەلەی کەسانی تر، هۆکارەکەیشی ئەوە بوو کە من هاوڕێی یەتی کەسانی خراپ و جادوو بازانم دەکرد، شەیتان لە زۆربەی کاتەکاندا دەست بەردارم نەدەبوو، کوڕێکم هەبوو تەمەنی حەوت ساڵان بوو، ناوی مەروان بوو، کەڕو لاڵ بوو، بەڵام لە ئامێزی دایکیدا پەروەردە کرابوو لە سەر ئیمان..

ڕۆژێکیان من و مەروان لەماڵەوە بووین، من پلانم دا دەنا کە لە گەڵ هاوڕێکانمدا چی بکەین، و بۆکوێ بڕۆین. کات دوای نوێژی مەغریب بوو، مەروان دەیویست بدوێت لەگەڵمدا (بەو ئاماژانە کە لەیەکتری تێدەگەشتین) ئامارەی بۆ کردم: باوکە بۆچی نوێژ ناکەیت؟! پاشان دەستی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، و هەڕەشەی لێکردم کە خوای گەورە دەمبینێت. ئەم کوڕەم هەندێك جار کەکاری خراپم دەکرد دەیبینیم..

سەرم سوڕما لە ئامارەکانی، کوڕەکەم لە بەردەممدا دەستی کرد بە گریان، هەڵم گرت و هێنامە پاڵ خۆمەوە بەڵام رایکرد لەدەستم، پاشان ماوەیەکی کەم چووە لای دەست شۆرەکەو دەستنوێژی گرت، پێشتر دەست نوێژی نەدەزانی بەڵام فێر بوو بوو لە دایکیەوە، ئەو دایکەی کە هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم بەڵام بێهودە بوو، قورئانی پیرۆزی لەبەربوو پاشان منداڵە کەڕو لاڵەکەم هاتەوە بۆ لام، ئامارەی بۆ کردم کە کەمێك چاوەڕوان بم..

لەبەردەممدا نوێژی کرد، پاشان هەستا قورئانە پیرۆزەکەی هێناو لەبەردەممدا دایناو ڕاستەو خۆ بە بێ ئەوەی لاپەڕەکانی هەڵبداتەوە کردیەوەو پەنجەی خستە سەر ئەم ئایەتە لە سورەتی (المريم)(٤٥) (يا ابت إني اخاف أن يمسك عذاب من الرحمن فتكون للشيطان وليا) واتە (ئەی باوکی بەڕێزم، بەڕاستی من دەترسم، لەلایەن خوای

میهرەبانەوە سزایەك یەخەت پێ بگرێ ئەوكات ئیتر دەبیتە یارو یاوەرو پشتگیریی شەیتان)

پاشان دەستی كرد بە گریان، منیش لەگەڵیدا گریام، هەستایەوەو فرمێسكەكانی چاومی سڕی، پاشان سەرو دەستی ماچ كردم، پاشان بەو ئاماژەیەی كەلە نێوانماندا هەبوو كە ئەمە ماناكەیەتی ووتی: باوكە گیان نوێژ بكە پێش ئەوەی ئەسپەردەی خاك بكرێیت، سزا چاوەڕوانت بێت..منیش سوێند بە خوای مەزن لەسەر سوڕمان و ترسێكی زۆردا بووم كە تەنها خوای گەورە دەیزانی، بەخێرایی هەستامەوە هەموو گڵۆپەكانم داگیرساند، كوڕەكەم ژوور بە ژوور دوام كەوتبوو، بەسەر سوڕمانەوە تەماشای دەكردم، پێی ووتم: واز لە ڕووناكی بێنە، با بڕۆین بۆ مزگەوتی گەورە مەبەستی حەرەمی نەبەوی پیرۆز بوو پێم ووت: با بڕۆین بۆ مزگەوتەكەی نزیكی خۆمان، ڕازی نەبوو تەنها بۆ ئەوێ نەبێ، بۆیە چووین بۆ ئەوێ، وە من زۆر دەترسام، چاوی لێم فەرامۆش نەدەكردو بەردەوام سەرنجی دەدام..چوینە ڕەوزەی پیرۆزەوە، پڕیش بوو لە خەڵك، هەستاینەوە بۆ نوێژی عیشا، ئیمام ئەم ئایەتانەی لە نوێژەكەدا خوێندەوە (یا أیها الذین آمنوا لا تتبعوا خطوات الشیطان، ومن یتبع خطوات الشیطان فإنه یأمر بالفحشاء والمنكر، ولولا فضل الله علیكم ورحمته مازكي منكم من احد أبدا ولكن الله یزكي من یشاء، والله سیمع علیم) (النور:٢١)

واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە شوێنی هەنگاوو نەخشەو پیلانەكانی شەیتان مەكەون، هەركەس شوێنی هەنگاوەكانی شەیتان بكەوێت زەرەر دەكات چونكە بێكومان ئەو فەرمان بە كردەوەی خراپ و تاوانكاریی دەكات، ئەگەر فەزڵ و میهرەبانیی خوا نەبوایە بەرسەرتانەوە ئەوە هەرگیز كەسێتانێی پاك و پوختە نەدەبوون، بەڵام خوا هەركەسێكی بوێت پاك و پوختەی دەكات و لە گوناهەكانی دەبورێت خوایش هەمیشە بیسەرو زانایە)

ئەم توانی بەهۆی گریانەوە كۆنترۆڵی خۆم بكەم، مەروانیش لەپاڵمدا دەگریا، وەلەكاتی نوێژەكەما مەروان لەگیرفانمدا كلینسێكی دەرهێناو فرمێسكەكانمی سڕی، وە دوای تەواو بونی نوێژەكە بەردەوام ئەگریام و ئەویش فرمێسكەكانی دەسڕیم، هەتا نزیكی یەك سەعاتی تەواو لە حەرەمی پیرۆزدا دانیشتم..هەتا مەروانی كوڕم پێی

ووتم: بەسە باوکە، مەترسە..بەهۆی زۆر گریانەوە ترسا بوو..گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە..ئەو شەوە لە مەزنترینی شەوەکان بو لەلای من...چونکە لەوشەوەدا تازە لە دایك بوو بوومەوە...خێزانم و منداڵەکانم ئامادە بوون، هەموویان دەستیان کرد بە گریان و نەشیان دەزانی چی ڕوویداوە..مەروان پێی ووتن-بەزمانی ئاماژە- (باوکم لەحەرەمی پیرۆز نوێژی کرد..خێزانم زۆر دڵشاد بوو بەو هەواڵە، بەڕاستی ئەوە بەرهەمی پەروەردگارە چاکەکەی ئەو بوو..

وە بەسەرهاتەکەی نێوان خۆم و مەروانم بۆ گێڕایەوە، وە پێم ووت: سوێندت ئەیەم بەخوا، ئایا تۆ فێرت کردبوو کە ئەو ئایەتە لەناو قورئانی پیرۆزەکەدایە بکاتەوە؟

سێ جار سوێندی خوارد بە خوا کە ئەو فێری ئەوەی نەکردووە...پاشان خێزانم پێی ووتم: سوپاسی خوا دەکەم لەسەر ڕێنومایی کردنت ئەو شەوە گەشاوەترین شەو بوو، وەمن ئێستا سوپاس بۆ خوا نوێژی جەماعەتم لە مزگەوتا نافەوتێ و وازم لە هەموو هاوڕێی خراپەکانم هێنا، چێژی ئیمانم چەشت.

ئەگەر بتبینیمایە ئەوت لە ڕوخسارمدا دەبینی، وە هەروەها ئێستا لە بەختەوەریەکی زۆرداو خۆشەویستی و گونجان لەگەڵ ژن و منداڵەکانمدا دەژیم، بەتایبەتی کوڕە کەڕو لاڵەکەم -مەروان- کە زۆر خۆشم ئەوێت.

چۆن نا، لەکاتێکدا ڕێنومایکردنی من لە سەر دەستی ئەو بوو.

# ٢٢-﴿ئـــايـــدز﴾

لـەڕۆژێکی ڕەشـدا و لـە یـەکێك لـە بازاڕەکانـدا لـە شـاری (الخـبر) لـە خۆرهـەڵاتی سـعودیە.. لەیـەکێ لـە قاوەخانەکانـدا دانیـشتبووم قـاوەم دەخـواردەوەو تەماشـای ڕۆژنامەم دەکرد..

ئـافرەتێکی چـاو جـوان و سـەرنج ڕاکـێش بەبەردەممـدا هـات و چـەند سـەرنجێکی عارانـەو تینوانـەی ئاراستـەکردم بەهۆی جوانی و کەشـخەییمەوە، هەسـتامەوە و بێ ئەوەی ئاگام لە خۆم بێت دوای کەوتم، بینیم چووە دوکانێکەوە نەم توانی بەدوایدا بـڕۆم لـە ترسـی پیـاوانی دەزگـا نـەك لەترسـی پـەروەردگار (پـەنا بـەخوا).. ڕووی وەرچـەرخان بەلامـدا و بەدەسـتە سـپییە ناسـکە جوانـەکانی بەوپـەڕی ئەدەبـەوە پێـی ووتم: ئەتوانی ژمارەکەی خۆتم بەیتێ.. بەدەمی پێم ووت و ئەویش لە مۆبایلەکەیدا یاداشتی کرد، ئەو مۆبایلـەی لـەم سـەردەمەدا کۆمـەڵێ کێشە و ناڕەحـەتی بۆ دروسـت کردووین.

وە دوای ئـەوە بۆ نیوەشـەو تەلـەفۆنی بۆ کـردم و دەسـتمان کـرد بـە قسەی خـۆش و خۆشی دەربڕین لە هـەر دوولامـان، پێـی ووتم کـە تـەڵاق دراوە و سـەرمایەدارە و مـاڵ و سـامانی هەیـە و تەمـەنی (٣١) ساڵە، وە ئەگـەر بتبینیایـە وات دەزانـی (١٨) بـەهاری تێنەپەڕاندووە.

دوای هەموو ئەو قسانە جێ ژووانمان دیاریکرد وەك سـەرەتایەك لـە چێشتخانەکاندا پاشان قاوەخانەکان یەکتریمان دەبینی، من لەهەموو ژوانێکدا نەم ئەتوانی ماچی بکەم یان هەتا دەستی ماچ بکەم بۆیە زۆرتـر هۆگربووم پێیـەوە، چونکە بـەخۆمم دەوت ئـەم ئافرەتـە بەشـەرەفە و بێجگـە لـەمن بەکەسـی تـر ئاشـنا نـەبووە و نایـەوێ بێجگـە لـە مـن بەکەسـی تـر ئاشـنابێت چـونکە مـن بـەلای ئـەوەوە گـەنجێکی شـۆخ و شـەنگ بـووم، هەرواش بوو من لەوپەڕی جوانیدا بووم.

ڕۆژێکیان تەلەفۆنی بۆ کردم و پێی ووتم: تۆم بۆ کارێکی گرنگ دەوێ، منیش پێم ووت: من خزمەتکاری تۆم گیانەکەم، پێی ووتم: دەمەوێ دوای سەعاتێکی تر لە فلان چێشتخانە بتبینم، مـن ئامادەم بەسـەر ئاگرابێم (بـەڵکو بەسـەر دۆزەخیشا).. لـە چێشتخانەکە بینیم و کەوتینە ووت و وویژ پێم ووت: گیانەکەم، چیت ئەوێ لە من

ئەنجامی بدەم؟ لەناو جانتاکەیدا بلیتێکی گشەت کردنی درەهێنا بۆ قاهیرە بە پلەی یەکەم و بەناوی منەوە وە هەروەها مانەوە بۆماوەی سێ ڕۆژ لە ئوتێلی (خمس نجوم).. وەهەروەها چەکێکی مۆرکراو بەناوی منەوە بە بڕی هەزار ڕیاڵی سعودی (١,٠٠٠) پێی ووتم: دەمەوێ دووسبەی بڕۆین بۆ قاهیرە وە بۆفلانە ئوتێل (دۆزەخەکە) بۆ لای کەسێك بەناوی (فلان) ئەمەش ژمارەی تەلەفۆنەکەیەتی (٠٠٠٠٠٠) تا بتبات بۆ فلان کۆمپانیا وە لەباتی من گرێبەستێ مۆر بکەیت بۆ کڕینی بڕێك لە پۆشاك و مۆدێلی جیهانی کە لەپاریسەوە هاتووە، وە ئەمەش کاغەزی بریکاری منە بۆ ئەوەی داوات لێ دەکەم کە بڕۆیت، پێم ووت: گیانی من، بە چاوان.

دوای تێك هەڵگژان لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەمدا مۆڵەتم لەسەر کارەکەم وەرگرت و لەکاتی دیاریکراودا سەفەرم کرد (خۆزگە ئەو سەفەرەم نەکردایە) دوای ئەوەی سەعات (٤)ی عەسر گەشتمە ئەوێ کەمێك حەوامەوە، وە لەسەعات (٦)ی ئێوارەدا بەمۆبایلەکەم فلان ژمارەم لێدا (خۆزگە ئەو ژمارەیەم لێ نەدایە).. پێشبینی دەکەن ئەو ژمارەیە کێ بووبێ؟ ئافرەتەکەی هاوڕێم بوو ووتم: فلان کەسیت؟ بەڵێ ئەوم، خۆشەویستم ئایا پێت سەیرە؟؟

ووتم: بەڵێ.. پێی ووتم: من یەم و کارەکەت بۆ ڕوون دەکەمەوە پاشان ووتی: خۆشەویستم وەرە بۆ ژووری ژمارە (٠٠٠٠) منیش خێرا ڕۆشتم، زۆر دڵخۆش بووم و کاتێ چوومە ژوورەوە پۆشاکێکی تەنکی سەرنج ڕاکێشی لەبەر کردبوو، هەرکەس بیبینیایە بەو پۆشاکانەوە نەی ئەتوانی خۆی بگرێت! مەگەر کەسێك پەروەردگار پارێزگاریی کردبێت.. باوەشی پیادا کردم و ماچی کردم و یاری لەگەڵ دەکردم خۆمم لەبیرچووەوەو جیماعم لەگەڵدا کرد، نەخێر بەڵکو زینام لەگەڵدا کرد (پەنا بەخوا.. بەو شێوەیە مۆڵەتەکەمم درێژکردەوە بۆ دەڕۆژ..

هەموو ئەو ماوەیە لەگەڵ ئەودا بووم، دوای ئەوەی گەڕاینەوە بۆ سعودیە بەیەك فڕۆکە و لە کورسیە پلەیەکەکاندا لەپاڵ یەکدا دانیشتبووین و لەکەش و هەوای خۆماندابووین و پەروەردگاریش لەسەرەوە دەیبینی، پەنا بەخوا وەك ئەوەی هەست بە بوونیشی نەکەین بەم شێوەیە بۆ ماوەی ساڵێك لەگەڵیدابووم، ئەچووم بۆ لای کۆدەبوومەوە لەگەڵی لە خانوەکەی خۆیداو وە هەروەها ئەوی دەهات بۆ شوقە ساردەکەی من.. شوقەکەی من ئەوەنەبوو شیاوی ئەوبێت، بەڵام بەهۆی جوانیمەوەو

ئارەزووی سێکسییەوە دەهات بۆلام.. ڕۆژێکیان من و براکەم لە شاری (ریاض)ی پایتەختی خۆشەویست بووین.. قەدەری خوا وابوو تووشی ڕووداوێکی هاتووچۆ بووین، براکەم تووشی نەزیفێکی سەخت بوو، وە سوپاس بۆ خوا من تووشی هیچ نەهاتم، تەنها چەند بەرکەوتنێکی سادەو بێ ئازار نەبێت، خەڵکی داباریە سەرمان و مانگی سورهات و گەیاندنیانە نزیکترین نەخۆشخانە لە شوێنی ڕووداوەکە، خێرا براکەمیان ناردە ژووری نەشتەرگەرییەوە، پزیشکەکە داوای لە من کرد کە لە خوێنی خۆم ببەخشم بە براکەم چونکە خوێنی هەردووکمان یەك گروپ بوو.. ووتم من ئامادەم.. بردمی بۆ ژووری خوێن بەخشین، دوای ئەوەی چەند (سی سی)یەك خوێنیان لێ گرتم بۆ پشکنینی لە نەخۆشی، وە من متمانەم بەخۆم هەبوو، وە ئەوەندە هات بە خەیاڵمدا کە من لەگەڵ فلان ئافرەت کۆبوومەتەوە ((الجماع))، دوای ئەنجامی پشکنینەکە پزیشکەکە هات و ڕوخساری زۆر مات دیاربوو پێم ووت براکەم چی لێ هاتووە دکتۆر؟ تکات لێ ئەکەم پێم بڵێ ووتی: کوڕی خۆم دەمەوێ مرۆڤێکی وابیت باوەڕت بە قەزاوقەدەری خوا هەبێت.

لە جێگاکە هاتمە خوارەوەو هەستامەوە و هاوارم کرد: ئایا براکەم مردووە؟؟.

پزیشکەکە پێی ووتم: خوێنەکەت پیس بووە بە نەخۆشی ئایدزی پیس (ووشەکانی بۆمن وەك هەورە تریشقە وابوو.. خۆزگە زەوی شەق بوایەو منی قووت بدایە)..

کاتێك وای پێ ووتم لەهۆش خۆم چووم و کەوتمە سەر زەوی.. دوای ئەوەی هاتمەوە هۆشی خۆم بەهۆی سەختی کارەساتەکەوە جەستەم دەلەرزی، ئایا بەڕاستی من تووشی ئەو دەردە کوشندەیە بووم.. یا الله.. یا الله.. من لەکەیەوە تووشی ئەو حاڵەتە بووم؟؟..

پێی ووتم: تۆ تووش نەبوویت، بەڵام تەنها نەخۆشیەکەت هەڵگرتووە وە تا مردن دانابڕێت لێت و خوای گەورە کۆمەکمان بێت..

دوای دوو ڕۆژ لە ڕووداوەکە براکەم وەفاتی کرد -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- زۆر دڵتەنگ بووم بۆی، چونکە ئەو تەنها برایەك نەبوو بۆ من، بەڵکو هەمیشە ئامۆژگاری دەکردم کە دوورکەومەوە لەو ئافرەتە (هاوڕێکەم) چونکە پێشتر بەسەرهاتی خۆمم بەڕاشکاوانە بۆ گێڕابوویەوە.. دە ڕۆژ دوای مردنی براکەم.. ئافرەتەکەی هاوڕێم

پەیوەندی پێوە کردم پێی ووتم: خۆشەویستم ئەوە لە کوێی؟ زۆرت پێ چوو.. بەتوڕەییەکی زۆرەوە ووتم: چیت ئەوێ لە من؟ پێی ووتم: ئەوە چیتە؟

ووتم: براکەم بەڕووداوێك مردووە و منیش دڵتەنگم پێی، ووتی: مردووە، وە نەیوت ڕەحمەتی خوای لێ بێت.. چونکە دڵ ڕەق بوو..

ووتی: دەی باشە کەی بت بینم (وە ڕەچاوی هەستی منی نەدەکرد)

ووتم: لەمڕۆ بەدواوە من تۆ نابینم.

ووتی: بۆچی؟

ووتم: من ڤایرۆسی نەخۆشی ئایدزم هەڵگرتووە.

ووتی: چۆن ئەوەت زانی

ووتم: کاتێ تووشی ڕووداوەکە بووین من و براکەم -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- (بەسەرهاتەکەم هەمووی بۆ گێڕایەوە)

ووتی: ئایا بێجگە لەمن چویتەتە لای هیچ ئافرەتێ؟

ووتم: نەخێر.. بەڕاستگۆیانە ئەمە دەڵێم

ووتی: ئایا لە ژیانتدا خوێنی کەست تێ کراوە؟

ووتم: نەخێر

ووتی: کەواتە ئاواتەکەم هاتە دی.

بەتوڕەییەوە پێم ووت: فلان کەس مەبەستت چی یە؟؟

ووتی: دەمەوێ تۆڵە لەهەموو ئەو لاوانە بکەمەوە کە هۆکاربوون لە تووش بوونی من بەو نەخۆشیە، وە ئەوە بەچاوی خۆتان دەبینن و تۆش یەکەم کەسیانی وە لەکەسانی نموونەی تۆش بەرێوەن!! پاشان تفێکی تێ کردم و مۆبایلەکەی بەڕوومدا داخست.

پاشان ووتم (حسبنا الله ونعم الوكيل).

ئەی ئافرەتی ئایدزاوی، وە چەندین ووتەی تر نامەوێ باسیان کەم تا هەستی ئێوە بریندار نەکەم.

ئێستە من تەمەنم (٣٢)ساڵە و ژنم نەهێناوە، کاتێ تووشی ئەم نەخۆشیە هاتم تەمەنم (٢٩) ساڵ بوو، وە من لەوکاتەوە دەزگیراندارم تا ئەمڕۆ و دایکم و خوشك و براکانم داوام لێدەکەن ژن بێنم، بەڵام من بەرپەرچی ئەدەمەوە، چونکە هەڵگری ئەو نەخۆشیە پیسەم و ئەوان نازانن و نامەوێ بیگوازمەوە بۆ هاوسەری ژیانم و منداڵەکانم، من

کوڕی گەورەم لەماڵەوە و باوکم -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- بەئاواتەوەبوو شایی من ببینێت، بەڵام کاتێ من تەمەنم (٢٩) ساڵان بوو وەفاتی کرد و ئاواتەکەی نەهاتە دی.. هەتا هاوڕێیانم لەسەر کار هەمیشە پێم دەڵێن: بۆ ژن ناهێنی.. من ئێستا لەڕووی دەروونیەوە ماندووم و کێشم دابەزیوە بۆ (٥٥) کیلۆ لەکاتێکدا پێش نەخۆشیەکە (٦٨) کیلۆبووم.

هەموو ئەمانە لەئەنجامی ماندوێتی دەروونی و خەیاڵی سەیر و سەمەرە لەمەڕ ئەو نەخۆشیە پیسە کە نازانم کەی و چۆن زاڵ دەبێ بەسەر ژیانمدا، ئێستا بەڕاستی گەڕاومەتەوە بۆ لای خواو تەوبەم کردووە و پارێزگاری لە نوێژەکانم دەکەم و خەریکی وانە خوێندنی قورئانی پیرۆز و لەبەرکردنیمی، هەرچەندە کات بەسەرچووەو درەنگ گەڕاومەتەوە.. من ئێستا ئەم پەیامە دەنێرم بۆ هەموو براو خوشکێکی موسوڵمان کە دوورکەونەوە لە هەر شتێك کە خوای گەورە تووڕە بکات وەك بەیەك گەیشتنی ناشەرعی (زینا) و هەرجۆرە کارێکی تری حەرام کراوبێت.

ئەمە ئامۆژگاری منە ئاراستەی ئەکەم لە ڕێگای لاپەڕەکانی ئەنتەرنێتەوە و لەڕێگای بڵاوکراوەکانەوەو تیایدا ئەڵێم: بەڕاستی ژیان جوانەو چێژ و تامی خۆشە بەتەندروستی و خۆشیەوە، بەڵام گوێڕایەڵی خوا لەزەت و تامی زیاترە..

وە هەرگیز لەزەت و تامی زینایەك ئەوە نایەنێ کە ژیانت بفەوتێنێ و بەرەو دۆزەخ بتبات و خەیاڵی ناخۆشت بۆ دروست بکات و چەندیش شتی تریش کە من ئێستا ئاوا دەژیم و ڕۆژانە بەو شێوەیەم و ئومێدەوارم خوای گەورە کۆمەك و هاوکارم بێت.

ئەم چیرۆکەم بۆیە بۆ نوسین بەهۆی خۆشەویستی و ترسی زۆرم لێتان کە تووشی ئەو نەخۆشیە پیسانە نەبن.. داواتان لێ دەکەم زیاتر لە خوای گەورە نزیك ببنەوە و ئیمانتان بەهێز بکەن هەتا شەیتان هەڵتان نەخەڵەتێنێ -پەنا بەخوا- بەرەو کاروکردەوەی حەرام..

داواتان لێ دەکەم دوعای خێرم بۆ بکەن کەچاك ببمەوە و خوای گەورەش پاداشتی ئەو کەسە بداتەوە ە ئەم چیرۆك و بەسەرهاتە بڵاودەکاتەوە بۆ وانەو پەند لێ وەرگرتنی.

# ٢٢- ﴿ئەو ڕۆشناییەی ژیانی منی ڕوناك كردەوە﴾

ترافیك لایتەكە سووری نیشان دەدا، ڕێگاكەش پڕ بوو لە ئۆتۆمبێل...تەنها خولەكێكی مابوو بۆ جیٚ ژوانەكەم...نەفرەت لەم ترافیك لایتە كەچەند زۆری پیٚ نەچێت...ئەگەر لە پێشەوە بوومایە...گوێم پیٚ نەئەداو ئەڕۆیشتم.

چركەكان زۆر بە خاوی دەڕۆیشتن وەك خولەك بەڵكو وەك سەعاتیان لیٚ هاتبوو..

جارێك تەماشای كاتژمێرەكەمم دەكردو جارێكیش تەماشای ترافیك لایتەكە..گڵۆپی سەوز داگیرسا....دەستم نابە هۆڕنی ئۆتۆمبێلەكەداو هەموانم هەراسانكرد...ئۆتۆمبێلەكەم جوڵاند....پێشی یەكەمم یایەوە...خەریك بوو بكێشم بە ئۆتۆمبێلێكی تردا....لێخوڕینەكەم هەموانی هەراسان كردبوو، هەوڵمدا خێراتر بڕۆم....بەڵام نەم دەتوانی....كات ڕۆیشت...و ژوانەكەم لە كیس چوو....هاڕێكانم لەویٚ نەبینیەوە...ڕۆیشتبوو...بۆ كویٚ بڕۆم؟..

نە ئەزانی چۆن وەڵامی خۆم بدەمەوە..هەناسەیەكم هەڵكێشا...خۆزگە شوێنەكەم دەزانی..

بەهێواشی لێم دەخوڕی...بەڕێوە هەر بیرم دەكردەوە...هۆڕنی ئۆتۆمبێلێكی تر بە ئاگای هێنایەوە بە توڕەییەوە تەماشای شۆفێرەكەم كرد...بە دەست ئاماژەم بۆ كرد..لە سەرخۆ بە خۆدنیا نافرێت...خۆمم لە بیر چوویەوە پێش چەند خولەكێك، بڕیارمدا ئەمشەو لەماڵەوە بەسەرم بەرم...بیرۆكەیەكی باش بوو...كچە تاقانەكەم نەخۆشە..باشتر وایە نزیك بم لیٚ یەوە...ئۆتۆمبیلەكەم لە بەردەم دوكانێكی ڤیدیۆدا وەستاند....دابەزیم و چومە دوكانەكەوە...چەند فیلمێكم هەڵبژارد...و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە...و دەرگاكەم كردەوە...هاوارم كرد لە خێزانم...چاو چەرەسات ئامادە كە بۆمان...چومە ژوورەكەوە (ئای چەندە ژنێكی ووشكە) ئێستە پێم ئەڵیٚ: (ئەحمەد، لەخوابترسە) ڕاهاتبووم لەسەر ئەوو ووشانە هیچ كاریگەری نەبوو لەسەرم، بەڵام ژنێكی گوێڕایەڵ بوو....چاك بوو...نارەحەتی دەكێشا لە پێناو بەختەوەر كردنی مندا....هاتە ژوورەوە بە چاو چەرەساتەوە....خەندەیەكی ئاراستە كردم...ووتی: دیارە ئەمشەو بێتاقەتی هاوڕێكانت بوویت و دەتەویٚ لەماڵەوە دانیشیت...ووتم: بەڵیٚ..وەرە تۆش دانیشە..پێی خۆش بوو وویستی دانیشیٚ....منیش هەستامەوە بۆ

ئەنجامی کردنی نوێژی بەیانیە لە مزگەوتا...ئیراهیم باری گرانی ئیشەکەی لە سەربوو کەچی من بێئاگاو خەوتبووم...هەرگیز گەلەیی نەدەکردو بێزار نەدەبوو...بەڕاستی مرۆڤــــە...بــــەڵێ ئــــەوە ئیمانــــە کــــاتێ شــــیرینیەکەی دەچــــێژێت دڵــــەکان دەبوژێنێتەوە....لەگەڵ تەواو بوونی کاتدا هەستم بە ماندوو بوون نەدەکرد...ئیبراهیم پێی ووتم: ئەحمەد پێویستە بڕۆیتەوە بۆ ماڵ تۆ لە دوینێ وە نەخەوتوویت و من کارەکەی تۆ دەکەم...پێم ووت: باشە...ئەڕۆم...تەماشای کاتژمێرەکەمم کرد...چەند خولـەکێکی مـابوو بـۆ بـانگ...بڕیارمـدا بمێنمـەوە....بانگـدراو بەپەلـە چـووم بـۆ مزگەوت...لە ڕیزی یەکەمدا دانیشتم، شەرمم دەهات لەو ڕۆژگارانەی کەڕام دەکرد لە نوێژ لەکاتی ئیشدا...دوای نوێژەکە گەڕامەوە بۆ ماڵ...لە ڕێگا تووشی دڵە ڕاوکێ بووم...ئەبێ حاڵی کچەکەم چۆن بێت؟ هەستم بە هەناسە تنی دەکرد، نەم دەزانی بۆ چی؟ هەستم دەکرد ڕێگاکە درێژ دەبێتەوە...ترسە کە زیادی کرد...سەرم بەرز کردەوە بـۆ ئاسمـان...لــەخوا پاڕامــەوە زووتــر شــیفای کــچەکەم بــدات....گەشــتمەوە ماڵەوە...دەرگام کردەوە...بانگم لە ژنەکەم کرد....گوێم لەوەڵام نەبوو..بە خێرایی چوومە ژوورەکەوە...ژنەکەم بەهاتنی من بە ئاگا هات...بەگریانەوە هاواریکرد کچەکەم ڕۆشــتم.....نووســانم بــە ســینگمەوە....دەســتەکانی شــۆڕ بوونــەوە بــەرەو زەوی....جەستەی سارد بـوو...وە هـەروەها دەسـتەکانی و پـێ یـەکانی....لێـدانی دڵـی....و هەناسـەی....هیچم نەدەبیت..تەماشای ڕوخساریم کرد...ڕووناکیەك بوو دەدرەوشــــایەوە وەك مــــانگی چــــواردە....ویــــستم بــــەئاگیا بێنمــــەوە....ڕام دەوەشاند...دایکی هاواری کرد....تـەواو ئـەو مـرد...بـەکوڵ گریـام...وەك ڕووبـار فرمێسك بە چاوەکاندا دەهاتە خوار..دەنگی کچەکەم لە گوێمدا دەزرنگایەوە...باوکە لـە خوابترسـە..هاتمـەوە بەخۆمـدا...لاحـول ولاقـوة إلـە بـالله....إنـا لله وإنـا إليـە راجعون....ژنەکەم ووتی: پەروەردگارا پاداشتی ئەم ناڕەحەتیەم بدەرەوەو لەم باشترم پـێ ببەخـشە (اللـهم اجرنـي في مـصيبتي، واخلفـني خـيراً منهـا) پەیوەنـدیم کـرد بـە ئیراهیمـەوە...پـێم ووت: خێـرا وەرە...کـچەکەم وەفـاتی کـردووە...بـە ئـارام بـوو لـە گەڵمـدا....هەمیـشە پـێ دەوتم: تاکـەی ئەحمـەد؟ منـیش دەمـوت سـبەینێ...ئـەویش دەیـوت: بـەڵام مـردن لـە ناکـاودا یەخـە بـە مـرۆڤ دەگرێـت...پـەروەردگار دەفـەرموێ:

(والذين آمنوا واتبعتهم ذريتهم بإيمان الحقنا بهم ذريتهم، وما التناهم من عملهم من شيئ، كل امري بما كسب رهين) واته: (ئەوانەی بڕوایان هێناوەو نەوەكانیشیان بە ئیمان و باوەڕەوە شوێنیان كەوتوون، ئەوانە لە بەهەشتدا پێك شاد دەكەینەوە، وە نەبێت ئەوانەی كە پلەی بەرزیان دەست كەوتووە دایانبەزێنین بۆ پلەی نزمتر، چونكە ئێمە پاداشتی كردەوەی كەس كەم ناكەینەوە، لەهەمان كاتدا هەركەس بارمتەی كردەوەی خۆیەتی)

دایكی گریاو منیش گریام..نوێژی مردوومان لە سەر ئەنجامدا...پاشان بردمان بۆ گۆڕستان....تەماشای جەنازەكەیم دكرد وام هەست دەكرد تەماشای ئەو ڕووناكیە دەكەم كە ژیانمی ڕووناك كردەوە....گەیشتینە گۆڕستانەكە....شوێنەكە ترسناك بوو..نامۆ بوو....بەرەو گۆڕەكە ڕۆیشتین...لە قەرغ گۆڕەكەدا وەستام....منداڵەكەم ئەسپەردە دەكەم لێرەدا...ئیراهیم شانی گرتم و ووتی (بە ئارامبە ئەحمەد) دابەزیمە ناو گۆڕەكە.....ئەمەیەماڵی تۆ ئەحمەد....لەوانەیە ئەمڕۆ و لەوانەیە سبەینێ...چیت ئامادە كردووە بۆ ئەم ماڵەت...ئیراهیم بانگی كردم: ئەحمەد كچەكە بگرە...بەسەر شانی ڕاستدا پاڵم خست و ووتم (بسم الله وعلي ملة رسول الله) بەناوی خواوەو لەسەر ڕێبازی پێغەبمەری خوای...هەموو كون و كەلەبەرەكانم گرت...هاتمە دەرەوە لەگۆڕەكە....خەڵكی خۆڵیان داباران بەسەریدا...توانام نەبوو فرمێسكەكانم ڕاگیر كەم...من ئەمڕۆ ئەو ڕووناكیە ئەسپەردە دەكەم كە ژیانمی ڕووناك كردەوە پاك و پێكەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی كە مرۆڤ لە حاڵێكەوە دەگۆڕێت بۆ حاڵێكی تر....

لای ڤیدیۆو تەلەزفزیۆنەکە....خێزانم سەرێکی ڕاوەشاندوو ووتی: ئەحمەد، لەخوا بترسە...زۆر بە بێزارو دارمانەوە ڕۆشتە دەرەوە...دەنگ لە ژوورەکەدا بەرز بوویەوە...مۆسیقا...هاوار...پێکەنین منیش چاو خواردەوەو چەرەسانم دەخوارد..چاوم بریبوە شاشەی تەلەفزیۆنەکە....شریتی یەکەم تەواو بوو...پاشان شریتی دووەم....کاتژمێر سیٚ ی نیوەشەو پنیشان دەدا...لەپڕ....دەسکی دەرگاکە بە هێواشی جولایەوە....هاوارم کرد: چیێت ئەویٚ؟...گوێم لەوەلام نەبوو دەرگاکە کرایەوە...کچە نەخۆشەکەم خۆی کرد بە ژووردا...توشی شۆك هاتم...کەمێك بێدەنگ بووم و هیچم نەوت...نزیك بوویەوە لێم...پێی ووتم: لەخوا بترسەن باوکە...لەخوابترسە باوکە...پاشان ڕۆشت و دەرگاکەی داخست بانگم کرد بەلام وەلامی نەدایەوە..بەدوایدا ڕۆشتم...بڕوام نە دەکرد...ئایا ئەمە کچی منە؟ دەرگای ژوورەکەم کردەوە...بینیم لە باوەشی دایکیدا خەوتووە...بەلٚیٚ ئەوە...گەڕامەوە ژوورەکەی خۆم...ڤیدیۆکەم کوژاندەوە....دەنگی کچەکەم ژوورەکەی داگیر کردبوو...باوکە لە خوابترسە باوکە لە خوا بترسە...لاشەم هەمووی هاتە لەرزین...ئارەق بە ناوچاومدا ئەهاتە خوارەوە...لە کاتێکدا ژوورەکەم شم سارد بوو نازانم تووشی چی بووم...تەنها ئەو دەنگەم دەبیست، هیچم نەدەبینی ووێنەس ئەوە نەبیٚ...ووشەکانی هەموو بەر بەستە داخراوەکانی سنگی کردەوە کەلە مێژەوە داخرا بوون...واز هێنان لە نوێژ..گوناهکردن...جگەرە کێشان...فلیمی نا شەرعی....لە بێئاگایی بە ئاگای هێناوە...ترپەی دڵم خێرا تر دەبوو...خۆم دا بەزەویدا...وویستم بخەوم...بەلام نەم ئەتوانی...کات بە خێرایی دەچوو...وێنەکانی ڕابردووی خۆمم هێنایەوە پێش چاوم...لەگەڵ هەموو وێنەیەکدا گوێم لە دەنگی کچەکەم بوو (باوکە لەخوا بترسە) لەم کاتەدا..گوێم لە بانگی بەیانی بوو...مو چرکەیەك پیادا هات..چوارپەلم هاتە لەرزین..ڕاوەشاندنێك هەموو لاشەمی گرتەوە...(الصلاه خیر من النوم) نوێژ کردن خێری زیاترە لە خەوتن..یاە...من بە درێژایی هەموو سالانە خەوتبووم...دەست نوێژم گرت و چووم بۆ مزگەوت....وا بەڕێگادا دەڕۆیشتم وەکو کەسێکی نامۆ...وەك ئەوەی شەونمی بەرە بەیان لۆمەم بکات و بلیٚ تۆ لەویٚ بوویت؟ وە باڵندەکانی ئاسمان بڵێن: مەرحە با لەو خەوتوەی بە خێرەوە هەستایەوە...چومە

مزگەوتەوە...دوو ڕكات نوێژم كرد...دانیشتم و قورئانم خوێند...تەتەڵەم ئەكرد لە خوێندنەوەدا....زەمەنێكی زۆر بوو قورئانم نەخوێندبوو...هەستم دەكرد كە قورئان لەگەڵ مندا ئەدوێ...بە پەرۆشم ئەكات...و ئەمترسێنێ...دەرگای تۆبەو ڕزگار بوون لە ئاگرم بۆ دەكاتەوە...(قل يا عبادي الذين اسرخوا علي انفسهم لا تقنطوا من رحمة الله إ، الله يغفر الذنوب جميعا) واتە: (ئەی محمدﷺ) پێ یان بڵێ (خوای مەزن دەفەرموێ) ئەی بەندەكانم ئەوانەتان گوناهی زۆرتان بەسەر خۆتان هێناوە، بێئومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا، خوای پەروەردگار لە هەموو گوناهەكان خۆش دەبێت.

تەمەننام ئەكرد بەردەوام بم لە خوێندنەوەی قورئان...بەڵام بانگدەرەكە...قامەتی نوێژی خوێند..بۆ ساتێك لە شوێنی خۆمدا ووشك بووم پاشان لەگەڵ خەڵكەكەدا چومە پێشەوە...لە ڕیزەكەدا وەستام...وام دەزانی غەریبم....نوێژەكە تەواو بوو....لە مزگەوت دانیشتم تا خۆر هەڵهات...گەڕامەوە بۆماڵەوە...دەرگای ژوورەكەم كردەوە..تەماشای خێزانم و كچەكەمم كرد....خەوتبوون...بەجێم هێشتن ڕۆشتم بۆ سەر كارەكەم...خووم بەوەوە نەگرتبوو زوو بچمە سەر كارەكەم.....هاوڕێكانم سەریان سوڕما لە ئامادە بوونم بەو بەیانیە زووە....دەست خۆشی گاڵتە ئامێزیان لێ دەكردم....گوێم بەقسەكانیان نەدا...هەر تەماشای دەرگاكەم دەكرد...چاوەڕوانی هاتنی ئیبراهیم بووم...هاوڕێم بوو لەو نوسینگەیە...هەمیشە ئامۆژگاریی دەكردم...مرۆڤێكی ڕەوشت جوان بوو..مامەڵەی دروستانە بوو...ئیراهیم ئامادە بوو...لەجێی خۆم هەستام پێشوازی بكەم بڕوای بەچاوەكانی نەكرد...پرسی: تۆ ئەحمەدیت؟ ووتم: بەڵێ...دەستیم گرت...دەمەوێ قسەت لەگەڵ بكەم...وتی: قەیناكا لە نوسینگە قسە دەكەین....ووتم: نا دەچین بۆ كافتریا...ئیراهیم بێدەنگ بوو گوێی بۆ قسەكانم شال كردبوو...بەسەرهاتی دوێنێم بۆ گێڕایەوە...چاوەكانی پڕ بوون لە فرمێسك...خەندەیەكی درێژ هاتە سەر ڕوخساری...پێ ی ووتم: ئەوە ڕوناكیەكە دڵتی ڕووناك كردووەتەوە توخوا بە تاریكایی گوناه مەیكوژێنەوە ئەو ڕۆژە زۆر چوست و چالاك بووم لەگەڵ ئەوەدا شەویش نەخەوتبووم...خەندە لە ڕوخسارما دەباری...ماندوو نەبوون لەكار...داواكاران یارمەتی هاواریان لە من دەكرد...یەكێكیان پێی ووتم: ئەم هەموو چالاكیە چی یە؟ لە وولامدا ووتم: ئەوە لە

## ٢٤- «زیپکــــه»

براوخوشکانم.. من بۆیەکەمین جار لە ژیانم ئەم بەسەرهاتە دەنووسم.. من پێشتر وا گومانم دەبرد کە باسی نەکەم بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان من و پەروەردگارم تێك نەچێ.. کەپەیوەندییەکی توندوتۆڵەو منەت باری کردبووم، بەڵام.. دوای ئەوە چیرۆك و بەسەرهاتەکانی ترم خوێندەوە.. بینیم کە بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکەی منیش خەیرو چاکەی تیایە بۆ کەسانیتر.

داوای لێبوردن دەکەم کە من لەڕێگای ئینتەرنێتەوە کەسێکی نەناسراوم، ئەوەندە بەسە کە من ئافرەتێکی موسوڵمانم و کەس نامناسێت، وە هیچ ترسێکم نیە لە فەوتانم لەو پەیوەندیەم کە هەمە لەگەڵ پەروەردگارمدا، وە ئەوەندەی لەو پەیوەندیە ئەترسم لە ژیانی خۆم ناترسم، سوێند بە خوا ژیانم بفەوتێ لەوە باشترە پەیوەندی نێوان من و پەروەردگارم بفەوتێ و خوام لەبیربچێتەوە، وە پەنادەگرم بەخوا لەگەڕانەوەم بۆ سەرگەردانیی پێشوو.

ئەمە ش بەسەرهاتەکەمە:

سوپاس بۆخوا من کچی دایك و باوکێکی دیندارم، بەڵام هەروەك کچانی سەردەمی خۆم (ئێستە تەمەنم ٣٣ ساڵە بەڵام بەسەرهاتەکەم لەسەردەمی هەرزەکاریەوە دەست پێ دەکات).

گوناهو تاوانی زۆر زۆرم کردووە، من کچی بچوکی خێزانەکەم بووم، لەبەر ئەوە ئەو نازەی کە بۆم ڕەخسابوو، ئاسانکاری بۆ کردبووم کە گوناهی زۆر ئەنجام بدەم، وە سوپاس بۆ خوا گوناهی گەورە نا ، بەدڕە وشتی لەگەڵ لاوانی کوڕیشدا نا، لەگەڵ ئەوەدا ڕەخسابوو بۆم و دەمتوانی بیکەم، بەڵام شتێك لەدەروونمدا نەفرەتی لێ دەکردم وە من لێرەدا نکوڵی لەوە ناکەم کە بەدوای چیرۆکی خۆشەویستی راستەقینەدا عەودالْ بووم کە بە زەواج کۆتایی بێت، وەك چۆن ئەو فیلمانە نیشانمان دەدەن کە بەخشە ویستی نێوان لاوانی کوڕ و کچ دەمانخەڵەتێنن و هەموو بیروهۆشمانی پێ داگیر دەکەن.

گرنگ ئەوەیە چوومە زانکۆو تەواوم کردوو خوای گەورە بڕێك جوانی پێ بەخشیبووم کە وای لێکردبووم داواکاریم زۆربێت، بەڵام من هیچیانم نەدەچوو بەدڵ یان با بڵێین خوای گەورە لە چارەمی نەنووسی بوو ببمە هاوسەری کەسیان.

لەوماوەیەدا بیرۆکەی بالاپۆشی لەخەیاڵمدابوو، هەستم بەترس و تاوان دەکرد، کە بمرم و بالاپۆش نەبم، باوکم -رەحمەتی خوای لێ بێت- هەمیشە دوعای بۆ دەکردین بالاپۆش بین و زۆرجار لەو بارەیەوە قسەی دەکرد لەگەڵماندا، وە هەروەها دایکیشم.

دوای دەرچوونم لە زانکۆ بەساڵێك خوای گەورە حەجی کرد بە نسیبمان، پێش ڕۆشتنم بڕیارمدا دوای حەج کردن بالام بپۆشم! وە هێشتا ئەو ساتەم لەیادە کاتێ بڕیارمدا بالاپۆش بم فرمێسك لەچاوانم دەباری و هەستم بە حەوانەوە دەکرد کاتێ لەوساتانەدا پەیمانم بەپەروەردگارم دەدا، بەڵام!!

چووم بۆ حەج و بەهەمان بەڵێن گەڕامەوە، بەڵام کاتێ گەڕامەوە هەواڵی ئەوەم بیست لەیەکێ لە سەنتەرەکان وەرگیراوم بۆ کارێ کە پێشتر خوازیاری بووم، خەیاڵم دەکردەوە چۆن بالاپۆش بم؟ وەچی لەبەر بکەم؟ وە چۆن بەرەو ڕووی ئەو کۆمەڵگا نوێیە ببمەوە و بەم پۆشاکە نوێیەم کە ڕانەهاتووم لەسەری دەبێ ڕای خەڵك و کەس و کارو هاوڕێکانم چۆن بێت؟

پاشان دەترسام جوان نەبم پێیەوە یان ڕواڵەتێکی ناقۆڵاو دواکەوتوانەم هەبێت، یان بەهۆی بالاپۆشیمەوە کەس نەیەتە داوام، کۆمەڵە پرسیارێکی بێ ماناو خەیالاتی ڕووکەشانە لە واقیعمان بەڵام لەوانەیە بەهۆی لاوازی کەسایەتیمەوە بووبێت چونکە من زیاتر لە خەڵکی دەترسام کە دەبوایە زیاتر لە خوا بترسامایە، سەردڵم گیرابوو، پەیمانم لەگەڵ پەروەردگارمدا شکاند.

پێش دەست بەکاربوونم، زۆر بەباشی خۆم ئامادەکرد، وەبڕێکی زۆر لە پۆشاك و میکیاجی نوێم کڕی، لەوانەیە سەرتان سوڕبمێنێ ئەگەر بڵێم، بۆ ماوەی هەفتەیەك سەفەرم کرد بۆ دەرەوە بۆ ئەوەی ئەو پێداویستیانە بکڕم! سوێند بەخوا بەشێك لەو پۆشاکانەم هەر نەپۆشی تەنها بۆیەك جاریش، لەم دواییەدا کردمن بە خێر، وە هێشتا هەندێکیان لە زەرفەکانیاندان، ئەوەش لەبەر ئەوەی کە بزانن پەروەردگار ڕەزامەند نەبوو لەسەری و بەرەکەتی تێدا نەبوو! دەستم بەکاری نوێم کرد، بەبێ زیادەڕەوی جێگای سەرنجی هەموان بووم، وە من دڵخۆش بووم کە ئەو گرنگی پێدانەم دەبینی،

وە هیچ کاتیَ پەشیمان نەبووم یان بترسم لەپەیمان شکێنیەکەم، نزیکەی (٣-٤)مانگ تێپەڕی، ڕۆژێکیان هەستم بە ئازاریَ کرد لە ڕوخسارمدا پاشان سوربوونەوەو سور هەڵگەڕان، ووردە ووردە لەپڕ هەندیَ لە زیپکە لە ڕووخسارمدا بەدەرکەوتن.

هەستام بە شۆردنی ڕوخسارم بەهەندیَ داودەرمان و پاککرەوە، وەهەموو ئومێدێکم ئەوەبوو ئەو زیپکانە دوای ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ دەڕەونەوەو ساڕێژ دەبن.

بەڵام مانەوەو زیادیان کرد و سوێند بەخوا پشتیەکەم بەهۆی کێمی ئەو زیپکانەوە خوێناوی دەبوو.

شتێکی سەیر بوو، لەژیانمدا شتی وام بەسەردا نەهاتبوو، پێشتر زیپکەیەك یان دوان لە ڕوخسارمدا دەردەکەوتن بەڵام پاش ماوەیەك بەبیَ هێشتنی شوێنەوار نەدەمان، بەڵام ئەمەی لەماوەی شەووڕۆژێکدا بەسەرمدا هات، لەناکاودابوو بەبیَ ئاگادارکردنەوەیەك زیپکەی پێکەوەلکاوی کەڵەکەبوو بەسەریەکتردا، وە کێم و خوێن و زام ڕوخسارمی تەنی بوو شوێنێك نەمابوو ئەو زیپکانەی پێوە نەبیَ.

بێگومان بەخێرایی چووم بۆ لای پزیشك دەرمانی بۆ نوسیم لەگەڵ شۆردنیدا بەڵام هیچ سودی نەبوو، جارێکی تر چوومەوە بۆلای، ئەم جارەیان حەبی بۆ نوسیم بەڵام سوودی نەبوو، چوم بۆ لای پزیشکێکی تر بەهێزترین دەرمانی بۆ نووسیم کە لەوانە بوو دەنوسران بۆ زیپکەی گەنجان، دوای کۆمەڵێك پشکنینی زۆر هیچ هۆکارێکی تری جەستەیی نەبوو کە یارمەتیدەری سەرهەڵدانی ئەم حاڵەتە بووبێت کە ڕوخسارمی شێواندبوو، پزیشکەکە دەرمانێکی بۆ نووسیم کە کاری لەسەر ووشك بوونەوەی چەوری دەکرد بەتەواوی لەلەشدا، تا ئەو ڕادەیەی کە نابیَ ئافرەتی سکپڕ بەکاری بهێنێت، وە نابیَ ئەو کەسانە بەکاری بهێنن کە عەدەسەی پەیوەستدار بەکار دەهێنن چونکە وەك ووتمان بەتەواوی لەش ووشك دەکاتەوە ئەوەش هەر سوودی نەبوو!!

بەڵکو بۆ ئەو مەبەستە چووم بۆ هەندەران بۆ لەندەن بۆ لای پزیشك جوان پشکنینی بۆ ئەنجام دام، دوای پشکنینەکەم ووتی: چارەسەرێکت بۆ دەنوسم کە لەوە بەهێزتر شك نابەم کە کاریگەری هەبێت و حاڵەتەکەی تۆ باش بکاتەوە، کاتیَ تەماشام کرد چی نووسیوە.

بینیم هەمان ئەو دەرمانەیە کە پێشتر بەکارم هێنابوو وە سوودی نەبوو، کاتێك پێم ووت، ئەویش ووتی: داوای لێبوردن دەکەم، ئەو دەرمانە بەهێزترین دەرمانە کە

لەکاتی زۆر پێویستدا دەنوسرێت بۆ نەخۆش، دوای ئەوە لەدەسەلاَتی مندا نیە هیچ شتێکت بۆ بکەم.

حاڵەتی دەروونیم بەتەواوی داڕووخابوو، شەوانە بەتەنها دەگریام و بەڕۆژیشدا خۆم نیشانی کەس نەدەدا، تا بەزەییان نەیەتەوە پیامدا، بەلاَم تێڕوانینی خەمناکم لەچاوانی دایکم و خوشکەکانمدا هەست پێ دەکرد، ڕقم لەخۆم دەبوویەوە تا ئەو ڕادەیەی لە ئاوێنەشدا تەماشای خۆمم نەدەکرد، هەموان ئامۆژگارییان دەکردم کە ڕێگای چارەسەرکردن بگرمە بەر، ئەوەش هۆکارێکی تربوو بۆ زیاتر بێتاقەتی و زویربوونم.

بەهۆی ئەو دومەڵ و زیپکەوە هەندێ لە ئافرەتان بێزیان لە ماچکردنم دەهاتەوە لەکاتی سلاَوکردندا لەترسی ڕوخساریان، ئەو حاڵەتەش وەك چەقۆ وابوو کەبیکەن بە دڵمدا.

شەوێکیان یادی خوام کردەوە، زانیم کە هۆکارەکە ئەوەیە پەیمانم شکاندووە، پێشتر دەترسام ئەگەر بالاَپۆش بم بەجوانی دەرناکەوم! وەك ئەوەی خوای گەورە پەیامێکم بۆبنێرێت، ئێستە چۆن خۆت دەبینیتەوە؟ ئێستە خۆت پێش کەسانی تر بێز لەخۆت دەکەیتەوە تەماشای ڕووخسارت بکەیت لە ئاوێنەدا، بەهۆی شێواوی ڕووخسارتەوە، ئایا جوانیی بەخششێك نیە لە خواوە ئایا ئەو زاتەی جوانیی دروستکردووەو بەخشیویەتی پێمان توانای نیە بە چاوتروکانێ بیباتەوە؟ پاشان خوای گەورە ڕێنمایی کردم بەدەرمانێك لەلای خۆیەوە کە چارەسەری بیماریەکەم بکات، خوای گەورە پەروەردگاری دەردو دەرمانە (وإذا مرضت فهو يشفين) واتە: ئەگەر نەخۆش بکەوم پەروەردگارم شیفابەخشمە.

سوێند بە پەروەردگار بێجگە لەوە من ڕاستیتان پێ دەڵێم، قورئان بوو بە شیفای من، بەو ئاوەی کە قورئانی خوێندرابوو بەسەردا، ڕوخسارم پێ شۆرد و لێم خواردەوەو دەستنوێژم پێگرت، ئەو دوعایانەی کە پێغەمبەرمان ﷺ فێری کردووین بۆ شیفابەخشین کردم (اللهم اشف.. انت الشافي المعافي.. لا شفاء إلا شفاءك..شفاء لا يغادر سقماً).. پەروەردگارا شیفام پێ ببەخشە.. تۆ شیفابەخش و چاککەرەوەی، تەنها شیفای تۆ شیفایە، شیفایەکە کە هیچ شوێنەوارێك جێ ناهێڵێ، وە دووعای: {أعوذ على نفسي بكلمات الله التامة من كل شيطان و هامة ومن كل عين لامة}.

وەڵڵاهی وەڵڵاهی تەنها دوای سێ ڕۆژ لە دەستپێکردنم بەو چارەسەرو دەوایانە ئەو ئاگرەی کە خەریك بوو ڕوخسارمی دەخوارد دامرکایەوە و بورکانەکانی زیپکە و بلۆقەکان و جەراعەتەکان بەرەو ووشك بوونەوە ڕۆشتن و ئازارەکان نەمان و سوپاس بۆ خوای گەورە چاك بوومەوە.

بۆیە بڕیارمدا بالاَم بپۆشم و وازم لەکارەکەم هێنا، وویستی خوا وابوو لەو مانگەدا باوکم نەخۆش کەوت و لەگەڵ باوکم و کەس و کارەکەمدا چووین بۆ دەرەوەی وولاَت، لەوێ بالاَم پۆشی لەسەرەتادا بالاَپۆشیەکەم سادەبوو واتە سەرپۆشێکم دابەسەرمداو لەگەڵ تەنورەیەکی درێژدا وە زۆر سوپاسی خوام کرد لەسەر ئەوە، بەلاَم دوای ماوەیەکی کەم نەخۆشیەکە زۆری بە باوکم هێنابوو وە هەستمان کرد بوو کە نەخۆشیەکی پیسی هەیە، وە باوکم بینی بەبەرچاومەوە لەکەسێکی سامناکی گەورەوە بووە بە ئێسکە پەیکەرێکی لاواز، کاتێ قسەی دەکرد دەنگ و سەدای هەموومانی دەگرتەوە بەلاَم ئێستە ناتوانێ دەنگ هەڵبڕێت، بەوپەڕی زۆر لەخۆکردنەوە دەتوانێ بە چپە قسە بکات.

ئەو مرۆڤەم بینی کاتێك تواناکانی وورده وورده لێ دەستێنیتەوە چی بەسەر دێت، ڕێگاکەم بۆ ڕۆشن بوویەوە، ژیانم لەو ساتە گۆڕانی بەسەردا هات و بڕیارمدا خۆم ئامادە بکەم بۆ ئەو چارەنووسە.

ئایا ئێمە بەخێرایی بەرەو ئەو چارەنووسە ناڕۆین؟ بڕیارمدا یەکەمین کەسبم کە بۆ حاڵی خۆم بگریم وە تێبکۆشم و خۆم بسازێنم، جوانی و هێزو سەروەت و سامان سودی نیە بۆم ئەگەر پەیوەندیم بەپەروەردگارمەوە پتەو نەبێت و لەناڕەحەتی و کۆستەکانمدا پشت بەو نەبەستم.

وە باوکم -ڕەحمەتی خوای لێ بێت- وەفاتی کرد، دوای وەفاتی باوکم گەڕامەوە بۆ وولاَتەکەی خۆم بەتەواوەتی بالاَم پۆشی و بەدڵنیاییەوە لەبەرمکرد، گوێم نەدا بەو کەسە بێ موبالاتانەی هەزار حسابیان بۆ دنیا دەکرد، لەکاتێکدا لەڕۆژی دوایی‌دا حساب بۆ ئەوانە نەدەکرا!

من ئێستا تەماشای ڕوخسارم دەکەم لە ئاوێنەدا، دەبینم ئاسەواری زیپکەکانی پێوە ماوە کە ئازیزن بەلامەوە، بەخوا خۆشەویستن لە دڵما، چونکە پەیامێکی خوایی بوون بۆ من، کێ دەزانێ ئەگەر ئەو زیپاکە نەبوونایە لە ڕوخسارمدا ژیانی من گۆڕانی

بەسەردا نەئەهات و نەمدەزانی و هەستم نەدەکرد کە من بەرێگایەکی هەڵەدا گوزەر دەکەم.

حەز دەکەم ئەوەشتەتان پێ بڵێم کە ساڵێك دوای باڵاپۆشیەکەم هاوسەرگیرم ئەنجامدا و خوای گەورە منداڵی پێ بەخشیم و ئەمانە ئەو ڕۆزیانەن کە خوای گەورە دەیبەخشێ بە مرۆڤ بە جوانی و بە قسەزانین نیە بەڵکو کارەکە پەیوەندی بەکارانێکەوە هەیە لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگاربێت، وە بەرەکەتیش لەلایەن خواوەیە، ئەو ڕۆزیدەرەو ئەو شتەکان دەبەخشێت وەهەروەها دوای ماوەیەك و دوای زیاتر خوێندنی وانە ئاینیەکان پەچە(نقاب)م پۆشی، وەمن ئێستە ئافرەتێکی بەختەوەرم لەپەنای خوادام و کە ئەوەش گەورەترین ڕۆزییە کە خوای گەورە پێی بەخشیوم، وە تکا دەکەم لێم نەسێنێتەوەو خوای گەورە بیبەخشێت بەهەموو موسوڵمانان لە ژن و پیاوو خوێنەران، وە ئاینەکەمان بپارێزێت و کۆتایی کردەوەکانمان بەباشترینیان بهێنێت وە تاله ژیاندا ماوین لە ڕەزامەندی ئەودابین.

بەڕاستی تەنها ئەو بەخشندەو میهرەبانە.. آمین

# ٢٥- ﴿چارە نووسێکی گەش﴾

کۆمەڵێ لاو لە یەکێك لە شەقامەکانی شارێك لە شارەکانی وولاتانی کەنداو کۆبوونەوە لە سەر خراپەکاری و شەڕنگێزی..هەرکەسێك بەو شەقامەدا بڕۆشتایە سوکایەتیان پێ دەکرد..

هەرکەس بوایە، ئەمە ئەگەر نەیان گرتایە...ئەگەر بکەوتایەتە دەستیشیان لێیان دەدا.

سەریان دەشکاند یان ئاسایی بوو بەلایانەوە چەقۆی لێ بدەن..وە بەنیسبەت ماڵەکانی ئەو ناوەوە ئۆتۆمبیلەکانیان ئەوە هەر مەپرسە..خەڵکی ئەو ناوە نەیاندەهێشت ئافرەتەکانیان بێنە دەرەوە تا ئەو شەقاوانە نەڕۆن..لەگەڵ هەموو ئەمانەدا چاوەڕوانی کاتی بانگدانیان دەکرد تا بچن بۆ مزگەوتی ئەو گەڕەکە (بۆ نوێژ کردن نا) بەڵکو بۆ فڕێدانی زبڵ و پیسیی بەسەر نوێژ گەراندا لە کاتی ڕکوع و سجودیاندا..وە هەروەها میزیشیان پیادا دەکردن وکەس نەیدەتوانی شکاتیان لێ بکات؟

لە یەکێك لەشەوەکانی ڕەمەزاندا وەك نەریتێکی ئاسایی چوون بۆ مزگەوت بۆ ئازاردانی نوێژ گەران، لە نێوان ئەم شەقاوانەدا کوڕێکی زۆر ئەسمەری تێدا بوو (تاك بوو تیایاندا) لە هەموویان سەر سەخت و ئالەبارتر بوو، لەو شەوەدا بە تایبەتی بەدەر لەهەموو شەوەکانی تر شتێکی سەیر بە سەر ئەم لاوەدا هات..پێشنیاری کرد بۆ شەقاوەکان کە بچێ بۆ مزگەوت بۆ ئەنجامدانی نوێژی (خەوتنان) ئەوانیش بە گوێیان کردو دەستنوێژیان گرت و نوێژیانکرد پاشان وویستیان بێنە دەرەوەو بانگی ئەویشیان کرد..ڕازیی نەبوو...پێی ووتن لەزووەوە نوێژم نەکردووە، وازم لێ بێنن من دەمەوێ بەردەوام بم لە نوێژ کردن بۆیە بەجێیان هێشت و چوونە دەرەوە..کوڕە لاوەکە تا شەو درەنگانێك هەر نوێژی دەکرد.

تا خادیمی مزگەوتەکە هات و وویستی دەرگای مزگەوتەکە دابخات، قسەی لەگەڵدا کرد بەڵام سوودی نەبوو، بە تەنها ووتەیەکیش وەڵامی نەدایەوە، خادیمی مزگەوتەکە وازی لێ هێناو چوو لە دەرەوە دانیشت..

باوکی کوڕە بەویدا ڕەت بوو نزیك بوویەوە لە خادیمەکەو وویستی سۆراخی کوڕەکەی بزانێت..تەنها پرسیارێك بکات چونکە گومانی نەدەبرد لەویٚ بێت، بەلاٚم ئەوەی کە چاوەڕوان نەدەکرا ئەوەبوو خادیمی مزگەوتەکە پێی ووت کوڕێك لە ژوورەوەیەو شێوەی لە کوڕەکەی تۆ دەکات و نایەوێت بێتە دەرەوە، باوکی بەهەڵەداوان چووە مزگەوتەکەوە بینی کە بەڕاستی کوڕەکەی لەوێیە، بڕوای بە چاوەکانی خۆی نەکرد..زۆر سەری سوڕما بەلاٚم دڵخۆشیەکەی بێ ئەندازە بوو..ڕۆشتنەوە بۆماڵەوە... کوڕە داوای لێبوردنی لە دایك و باوکی دەکرد کە ئەمان بەردەوام بێ ئومێدی نەبوون لە ڕەحمەتی خواو دووعا کردن بۆی بەشەوو بەڕۆژ ئومێدیان بەڕەحمی خوا هەبو (إنك لاتهدي من أحببت ولكن الله يهدي من يشاء) واتە: ئەی محمد (ﷺ) تۆ ناتوانیت ڕێنومایی ئەو کەسە بکەیت کە خۆشت دەوێت بەڵکو خوای گەورە ڕێنومایی هەرکەسێك دەکات بیەوێت) پاشان داوای لیٚ بووردنی لیٚ کردن و بەڵێنیدا پێیان کەلەمەودوا باشتر بێت...ئەوەندە دڵشاد بوون کە وەسف ناکرێت...وەك ئەوەی تازە لە دایك بوو بێتەوە پاشان دایك و باوکی ماچ کردوو داوای لێکردن کە بۆ نوێژی بەیانی هەڵیسێنن، پاش کەمێك چوو بۆ سەر جێگاکەی و خەوت... چەند سەعاتێکی نەبرد دەنگی بانگی بەیانی ئاسۆی پڕ کردەوە..

دایکی چوو خەبەداری بکات، بەلاٚم...هەناسەی لیٚ بڕابوو..ئەو ماڵ ئاوایی لە ژیان کردبوو...(لا إله إلا الله محمد رسول الله)بردیان بۆ مزگەوت تا بیشۆن چەند پیاوێك کۆ بوونەوەو دەستیانکرد بە شۆردنی....ئاوەکە ئەسمەریەکەیی دەشۆردەوەو دەیتوانەوە ئەوانەیش کە خەریکی شۆردنی بوون بەردەوام هەر (الله أكبر)یان دەکرد. ئەم لاوە ئەسمەرە ڕەنگی ڕوخساری سپی بوویەوە!! ئایا ئەمە گوناهەکانیەتی یان فریشتەکان هەستاون بەشتنی یان ئەمە ئەنجامی دوعای دایك و باوکیەتی بۆی، کە بۆ تەنها ڕۆژێك هیوا بڕاو نەبوون لە ڕەحمەتی خوا یان ئەمە ڕەحمەتی خوایەو موسڵمان و کافرو گوێڕایەڵ و سەر پێچیکەریش دەگرێتەوە؟ من پێم وایە هەموویان پێکەوە گرێدراون..سوپاس بۆ خوا.. پەروەردگاری من کە خوای بەخشندەو میهرەبانە لە عەرشی خۆیدا نوسیویەتی (رحمتي تسبق غضبي-میهرەبانیم پێش تووڕە بوونمە).

بێگومان پێویستە سوپاسی ئەم نیعمەتەی بکەین بە پێی پێویست.

## ٢٦- ﴿ڕۆژانێك ژیانی منی گۆڕی﴾

پـێش ئـەوەی ئـەم بەسـەرهاتەی خۆمتـان بـۆ بنێـرم دوو دڵ بـووم، بـەڵام ویـستم بەهەموو مرۆڤێك بڵێم کە دەیخوێنێتـەوە.. نزیکی مرۆڤ لەپەروەردگاریـەوە پێوەرێکی گەرمیی هەیە، ئەندازەی نزیکی و دووری لـە خـوای خۆیـەوە دەزانێت... چیرۆکەکەی من کاتێك دەست پێ دەکات کە منداڵ بووم ..باوکم دایدەنام گوێ لە هەندێ سورەتی کورت بگرم بەدەنگی شێخ عبدالباسط عبدالصمد (ڕەحمەتی خوای لێبێت) کاتێ گوێم لـەدەنگی بـوو دەگریـام وە نەمـدەزانی بـۆ، تـا ئـەو ڕادەیـەی بـەدەنگی ئـەو سـورەتە کورتـەکانم لەبــەرکردبوو، کــاتێ قورئــانم دەخوێنــد لەســەر ئــاوازی دەنگــی ئــەو دەمخوێند... ژیـان بـەو شێوەیە تێپەڕی تـا تەمـەنم گەیشتە نزیکەی چوارده سـاڵی.. هـەنگاو بەهـەنگاو ووردە وردە لەپـەروەردگارم دووردەکەوتمـەوە... تـا ئـەو ڕۆژە هاتـە پێشەوە کە ویستی خوای گەورە وابوو کە بیهێنێتەوە یادم ئەم گەردوونـە خـاوەنێکی هەیە توانای بەسەر هـەموو شتەکاندا دەشکێت، توانـای هەیـە زینـدەوەران بژێنێت و بمرێنێت..

من لە پۆلی سێی ناوەندیدا بووم.. لەگەڵ سـەرەتای سـاڵی خوێندنـدا هـەواڵی وەفاتی برا گەورەکەممان پێ گەیشت چونکە من و دایك و باوکم لـە شارێکی تـر بووین.. ئەم هەواڵـە بـۆ مـن وەکـو هـەورە گرمەیـەك وابـوو بـەڵام زۆر نـەدەگریام، دڵـم وەکـو بـەردی لێ هــاتبوو، لەوکاتــەدا قورئــانم نەدەخوێنــدو نوێژیــشم نــەدەکرد، وە زۆر دوور بــووم لەپــەروەردگاری ئاسمانــەکان و زەوی، کــاتێ گەڕاینــەوە خــاکی نیــشتمان.. براکــەم گەشتی کردبوو بۆ ماڵی هەتا هەتایی .. ئەوە یەکەمین ڕۆژم بوو بێم بۆ میصر و باڵام پۆشی بێت.. جاران کە دەهاتمەوە بۆ میسر یەکەمین شت کە فرێم دەدا سەرپۆشـەکەم بوو.. ڕۆشتین بۆ گۆڕستـان بـۆ زیارەتی.. تـەنها لـەوێ گریـام و هـەموو شـتێکم هاتـەوە یـاد، بیرم کـردەوە کـە پێویـستە چـی بکـەم ئەگـەر مـن لـەجێی ئـەوبم، چـی بکـەم کاتێك بەسـەر پـردی (سـراط)دا دەپەڕمـەوە، تـەنها ئـەوە بۆیەکـەمین جـاربوو هەسـتم کـرد کـە (سراط) مانای چیە.. وە هەر ئەوساتە بڕیارمدا باڵام بپۆشم و پابەندبم پێیـەوە.. بۆیـە ئـیتر لەکـەناری تیاچـوونەوە دەسـتیانگرتم بـەرەو دیـاریکردنی ئامـانج لـە ژیانـدا.. لێیانەوە مانای خۆشەویستی خوا فێربووم.. وە مانای دڵسۆزی لەکارداو مانای گریان

لەترسی خوا... وە ئەوەی ڕێنومایکەرم بوو بۆ ئەمە دوای خوای گەورە ئەو برایەم بوو..

وە دەخوازم لەو زاتەی کە بەفەزڵی ئەوەوە ڕێنوومایکرام بۆ ڕاستەشەقام کە ڕێنوومایی هەموان بکات پێش ئەوەی ئەو ڕۆژە دابێت کە پەشیمان بوونەوە هیچ سودێکی نییە.

## ٢٧- ﴿دەیویست سەرگەردانیکات﴾

ڕابردوو چەند خۆش و چەند ناخۆشە، دوو سیفەت لە یادگاریەکانی پیاوێکدا کۆ بوونەتەوە، دوو سیفەتی دژ بەیەك، دەمەوێ ڕابردوو یاد بکەمەوە لە پێناوی ئەوەدا کە بەرانەتی منداڵێم ببینمەوە، وە دەمەوێ ڕابردووی لاویتیشم لەیاد بکەم تا ئەو سەرە ڕۆییەی تایدا ژیاوم نەیەتەوە یادم ...کاتێك لەهەرەتی لاویداو لە تەمەنی پانزەساڵیدا بووم، لەو پەڕی ململانێدا بووم لەگەڵ دوو ڕێگادا ،ڕێگای چاکەو ڕێگای خراپە...بەڵام بەهۆی بەخت ڕەشیمەوە ڕێگای خراپەم هەڵبژاردبوو...شەیتان نایابترین مەدالیای خۆی کردە ملم، بوم بە شوێنکەوتەی ..چەند ڕۆژێك بەسەر نەچوو لێی هەڵگەڕامەو ئەو بوو بە شوێنکەوتەی من، ڕێگای شەڕم گرتە بەرو تاڵاوەکەیم خواردەوە کە لە تاڵاوی کاڵەکەمارانە خراپتر بوو...نەمدەهێشت ڕۆژێکم بەسەردا تێپەڕێت و بەشدار نەبم لە هەڵوەشاندنەوەی بەها بەرزەکاندا، تا ئەو ئەندازەیەی ناوم بوو بوو بە ناسنامەی سەرکەشی و گومڕایی، جارێکیان ئافرەتێکی گەڕەکەکەمان کە من نیشتە جێ بووم تیایدا، سەرنجی ڕاکێشام، زۆر جار سەرنجی دەدام و لەماناکەشی تێ نەدەگەیشتم، بەڵام سەرنجەکانی سەرنجی عاشقانەو خۆشەویستی نەبوو، هەرچەندە من بەینم لەگەڵ عەشق و خۆشەویستیدا نەبوو، لەوکاتەدا من دڵم نەبوو، ئەو سەرنجانەی کە زۆر جار هەڵوێستەیان پێ دەکردم بیرو هۆشمی داگیر کردبوو تا ئەو ڕادەی هات بەخەیاڵمدا داوی خۆم لەسەر ئەو ئافرەتە دانێم...دوای ماوەیەك شیعرێکم ڕێکخست کە پێی دەڵێن شیعری عاشقانە، لە ڕێگای دەرگای ماڵیانەوە ناردم بۆی، بەڵام نەمبینی وەڵامم بداتەوە، بۆیە ئەو هەڵوێستە وای لێکردم هەستم بە تاوان و ئەو ئافرەتە فریو بدەم، پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت.. هەڵبەستێکی شیعریم بۆ نوسی بەبێ ناو هێنانی ناوی.. کاتێ نامەکەی پێگەیشت هیچ هەڵوێستێکی نەبوو، جارێکیان سەعات چواری بەرەبەیان بوو بەرەو ماڵەوە دەگەڕامەوە، من یەکێك بووم لەوانەی بە ڕۆژودا خۆم دەشاردەوەو بەشەویشدا هەڵەگەڕ بووم، لە بەردەم دەرگاکەماندا کتێبی (الأذكار النبوية)م بینیەوە، دەموچاوم سور هەڵگەڕا، هەموو ئیرادەتەکانی شەڕم لە ناخمدا کۆکردەوە، زانیم کە ئەو کەسەی ئەوەی بۆ ناردوم ئەوە ئەو ئافرەتەیە، وە بەوەش ئیعلانی شەڕی کردووە لەگەڵ

مندا...لەوکاتەدا بیرم کردەوە کە شیعرێکی بۆ بنووسم دەربارەی خۆشەویستی نێوان من و ئەو ..وە بڵاوی بکەمەوە بەگەڕەکدا، بەمەش دەتوانم شەرەفی لەکەدار بکەم، دانیشتم ئەوەی شەیتان حەزی پێ دەکرد خستمە ناو چامە شیعریەکەم...لە شیعرەکەم بوومەوە ناردم بۆ ماڵیان هەڕەشەی ئەوەشم لێکرد کە ئەوە بەناو هەموو ناسیاواندا بلاودەکەمەوە.. ئەو کەسەی کەنامەکەم پیادا ناردبوو چەند دەنکە خورمایەکی بۆ هێنامەوە، پێی ووتم ئەمڕۆ ئەو ئافرەتە بەڕۆژوەو چاوەڕوانی بەربانگ کردنەوەیە، وە ئەم چەند دەنکە خورمایەی پێ دام کە بە دیاری بیهێنم بۆتۆ لە ڕێی ئەو شیعرەی کە پێشکەشت کردووە...وە پێت دەڵێ کە ئەو لەخوا دەپارێتەوە کە ڕێنومایت بکات لە کاتی بەربانگدا، چەند دەنکە خورماکەم وەرگرت و فڕێمدانە سەر زەوی، چاوم شەڕی لێ دەباری، بەڵێنمدا ئێستا بێ یان دوایی هەر دەبێ تۆڵەی خۆمی لێ بکەمەوە... وە نەهێڵم تا زیندوو بم بە ڕێگای هەقدا بڕوات، لەوکاتانەدا کە دەچوو بۆ مزگەوت سوکایەتی و گاڵتەم پێ دەکرد، ئەو ئافرەتانەی لە گەڵیدا بوون قاقا پێی پێ دەکەنین...

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئەو وەك ماسی مەیوو وا بوو...ڕۆژان بەسەر چوون بینیم کە من شکستم هێناوە لە هەوڵەکانمدا بۆ ئەوەی ئەو ئافرەتە گومڕا بکەم، بەڵام ئەو هەر بەردەوام نامیلەکەی ئاینی بۆ دەناردم، هەموو ڕۆژانێکی دووشەممەو پێنج شەممان کە لەو ڕۆژانەدا ئەو بە ڕۆژوو دەبوو خورمای بۆ دەناردم بە دیاری، وەك ئەوەی بەزمانی حاڵی بڵێت ئەو سەرکەوتووە بەسەرمندا، من وا گومانم دەبرد لە هەڵس و کەوتەکانی.. چەند مانگێکی نەبرد سەفەرم کرد بۆ دەرەوەی وولات بۆ گەڕان بە دوای لەزەت و خۆشیەکانی دنیادا کە لە وڵاتی خۆمدا نەمدەبینیەوە، نزیکەی چوار مانگ مامەوە، وە من کاتێ لە دەرەوەی وولات بووم بیرم هەر لە لای ئەو ئافرەتە بوو، چۆن ڕزگاری بوو لە هەموو ئەو پیلانانەی بۆم کێشا بوو.. وە بیرم کردەو کە هەر بگەمەوە شوێنی خۆم دەست دەکەمەوە بە ئەنجامدانی کردەوەکانی پێشووم، بەڵام خراپترو فێڵبازانەتر.. وە بڕیارمدا دەبێ وای لێ بکەم هەڵیگێڕمەوە لە دینداریەکەی و وای لێ بکەم بەڕێگای خراپیدا بەرم، کاتی گەڕانەوە هات و ئەو ڕۆژە پێنج شەممە بوو...یەکێك بوو لەو ڕۆژانەی ئەو ئافرەتە بە ڕۆژوو دەبوو تیایدا، کاتێك لە فڕۆکەکەدا

قاوەو خورمایان پێشکەش کردم، قاوەکەم خواردەوە بەڵام خورماکەم فڕێدا (چونکە ڕەمزێك بوو بۆ ڕۆژوەوانان و ئەوانی دەهێنایەوە یادم) فرۆکەکە لە فرۆکەخانەی شارەکە نیشتەوە کە من نیشتە جێ بووم تیایدا، سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ بوو، تەکسیەکم گرت و بەرەو ماڵەوە ڕۆشتم...هەر کە گشتمە ماڵەوە هاوڕێکانم سەردانیان کردم، وە دیاریم پێشکەش بە هەر هەموویان کرد ،ئەو دیاریانە هەموویان بێ ئەرزش بوون، بەڵام خراپترین و قیزەونترین دیاریان ئەوەیان بوو کە تەرخانم کرد بوو بۆ ئەو کچە، تا بینێرم بۆی، وە ببینم بزانم دوای ئەوە چی دەکات، ڕۆشتمەدەرەوە بۆ نزیکی مزگەوتەکەو کاتیش پێش بانگی ئێوارە بوو...ئەو هەمیشە سور بوو لە سەر نوێژ کردنەکانی لە مزگەوتدا، لەوێ بازنەیەکی ئافرەتان هەبوو بۆ لەبەر کردنی قورئان، بانگی مەغریب دراو بانگ لێ بویەوە و کاتی قامەت هات و کچەم نەبینی...سەرم سوڕما، بەخۆم ووت لەوانەیە بۆ چوونی گۆڕابێت لەکاتی سەفەرەکەی منداو وازی لەهاتو چۆی مزگەوت و دینداریی هێنا بێت...گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، وە من هەموو ئاواتێکم ئەوە بوو کە گومانەکانم هاتبنە دی لەوکاتەدا کە کتێبەکانم هەڵدەدایەوە قورئانێکم بینی لە سەری نوسرابوو دیاری بێت بۆ تۆ بەو ئومێدەی کە خوای گەورە ڕێنومایکەرت بێت بۆ سەر ڕێگای ڕاست، ئیمزاو ناوی کچەکەی پێوە بوو، دوورم خستەوە لەخۆم و لەکارەکەرەکەم پرسی کێ ئەم قورئانەی هێناوە بۆ ئێرە، وەڵامی نەدامەوە، ڕۆژی دووەم چوومەوە هەمان شوێن و چاوەڕوانی کچەکەم دەکرد بەڵام نەهات..چەند ڕۆژێك ئەو کارەم دووبارە کردەوە هیچ سوودی نەبوو...چوومە نزیك ماڵیانەوەو پرسیارم لە یەکێ لەو منداڵە کوڕانە کرد کەیاریان لەگەڵ برا بچوکەکەی ئەو کچەدا دەکرد، لێم پرسین: ئایا فلان ئافرەت لەوێ یە؟

پێیان ووتم: ئەم پرسیارە بۆچی دەکەیت؟ لەوانەیە تۆ خەڵکی ئەم گەڕەکە نەبیت، ووتم: بەڵێ بەڵام نامەیەکم پێیە لە هاوڕێیەکی کچیەوە دەمەوێ بیبەن بۆی، پێیان ووتم: ئەوەی تۆ پرسیاری لە بارەوە دەکەیت پێش دوو مانگ لە مزگەوت و لە سوجدەدا وەفاتی کرد...

لەوکاتەدا نەمزانی تووشی چی هاتووم، دنیا لە بەرچاوم دەسوڕایەوە، ترسام گێژ بخۆم و بەم درێژیەوە و بەم دڵڕەقیەوە بکەوم، فرمێسك بەچاوانمدا هاتە خوارەوە،

بەڵام هەموو ئەم پەژارەییە بۆچی؟ ئایا لە پێناوی مردن و ئایندەگەشی ئەو دایە یان لە پێناوی شتێکی تردایە؟ نەمدەتوانی تەرکیز بکەم یان هۆکارو تەفسیری ئەو هەموو خەفەتەی خۆم بزانم.

بە پێ گەڕامەوە بۆماڵەوە، ئاگام لەخۆم نەمابوو.. نەمدەزانی بەرەو کوێوە مل دەنێم ..تەقەم لە دەرگای ماڵی خۆماندا و لە کاتێکدا کلیلیش لە گیرفانمدا بوو...هەموو شتێکم بیر چوو بوەوە بیرم چوو بوو کە من کێم، بەردەوام بیرم لە سەرنجەکانی ئەو کچە دەکردەوە، لە هەموو شوێنێکدا بەدوامەوە بوو، پاشتر دڵنیا بووم کە ئەو سەرنجانە سەرنجی پیسی و شتی ترنین بەڵکو سەرنجی بەزەیی هاتنەوەو پەرۆشی و ڕەحمەتە بۆ من، ئەو ئاواتەخواز بوو دوورم بخاتەوە لە خراپەکاری ،بۆیە دوای وەفاتی ئەو بڕیارمدا دورکەومەوە لەکەس و کارم و بۆیە بەڕاستی بۆ زیاتر لە ساڵێك دورکەوتمەوە لە کەس و کارم و هەموو خەڵکی.. وە دورکەوتمەوە لەو گەڕەکەو گۆڕان بەسەر ژیانمدا هات، خەیاڵەکانی لەبەرچاومدا بوون، لە تەنهایشمدا لێم جیانەدەبوویەوە، دەمبینی کە دەچوو بۆ مزگەوت و دەگەڕایەوە، زۆرێك لە هاوڕێکانم دەیانەویست هۆکاری دورەپەرێزیم لە کۆمەڵگا بزانن و هەروەها پەرۆشیم و حەزم لە ژیانی تەنیایی، بەڵام من پێم نەدەوتن....ئەو قورئانەی پێشکەشی کردبووم هێشتا لەلامە، ماچم کردو گریام و خێرا هەستام دەست نوێژ بگرم و نوێژ بکەم بەڵام دەکەوتم.. هەرچەندە هەوڵم دەدا هەستمەوە بەڵام نەمدەتوانی.. چونکە بەدرێژایی ژیانم نوێژم نەکردبوو، زۆر هەوڵمدا خوای گەورە یارمەتیدام و ناوی خوام هێنا...زۆر پاڕامەوەو گریام کە خوای گەورە لێم ببورێت و ڕەحمیش بەو کچە بکات و بیخاتە بەر ڕەحمەتی بەر فراوانی خۆیەوە، ئەو ئافرەتەی هەمیشە لە هەوڵداندا بوو بۆ ئیصلاح کردنی من و منیش هەمیشە هەوڵمدەدا ئەو بەرەو خراپە کاری ببەم...بەڵام ئاواتە خواز بووم نەمردایەو منی ببینیایە کە ڕێنوومایی کراوم بەرەو ڕێگای ڕاست، بەڵام قەدەری خوا گەڕانەوەی بۆ نیە، بەردەوام دوعام بۆ دەکردو داوای ڕەحمەت و بەزەیی خواییم بۆ دەکردو خوای گەورە بیخاتە بەر ڕەحمەتی خۆی و منیش لەگەڵ بەندە چاکەکانیدا حەشر بکات...

## ٢٨- ﴿ســــاره﴾

ئەم بەسەرهاتە بەسەر مندا هاتووە ، پێش سێ هەفتە لە سایتەکەی خۆمدا ئیمێڵێکم بۆ هاتبوو لە ئافرەتێکەوە کە لە ئوستورالیا دەژی .. ئەمەش دەقی ئیمێڵەکەیە: من ئافرەتێکی بە نەژاد لوبنانیم .. باوکم موسڵمانەو دایکم مەسیحیە ، دە ساڵی یەکەمی ژیانم لە لوبنان بەسەربرد پاشان دایکم و باوکم کۆچیان کرد بۆ ئوستورالیا ، بۆیە لەو ساتەوە پەیوەندیم بە خۆرهەڵاتی ناوەراستەوە پچرا و ئێستا تەمەنم (٢٢) ساڵە ، وە بە گەشتنم بە بۆ ئوستورالیا بە تەواوی پەیوەندیم بە ئاینەوە پچرا و، تەنها ئەوەندە ئەزانم کە من موسڵمانم و بەس ، نازانم شێوازی قورئان چۆنە و نازانم شێوازی فاتیحە چۆنە و نازانم چۆن نوێژ بکەم ، وە ئاین لە ژیانی مندا هیچ رۆڵێکی نەبوو .. پاشان لەوێ باوکم لە دایکم جیابوویەوە و هەریەکەیان هاوسەرگیری تریان ئەنجامدا ، هەتا چوومە زانکۆ پاشان باوکم و دایکم ئوستورالیایان بەجێهێشت .. منیان بەجێهێشت بەبێ خێزان و بەبێ خوشك و برا ، وە هیچیش نازانم دەربارەی باوباپیرانم لەلوبنان ، بەتەنها دەژیام ، ناچار بووم کار بکەم تا بژێوی ژیانم مسۆگەر بکەم ، بەیانیان لە زانکۆ دەمخوێند و ئێوارانیش لە (بار) دا کارمدەکرد .. بە مانا رۆژئاواییەکەی هاورێیەکەم هەبوو... هیچ شتێکی حەرام نەمابوو بەبێ شەرمانە ئەنجامی نەدەم. من زۆر رۆژئاواییانە بووم ، بە شێوەیەکی سادە عەرەبیم دەزانی .. لەبەرئەوەی زۆر جوان بووم ،بەشداریم کرد لە پێشبرکێی خانمە جوانەکانی نیوزیلەندا ، لەو شارەدا کە پێشبرکێکەی تیادا ئەنجامدرا سەرکەوتم، وە خۆم ئامادە کرد بۆ پێشبرکێی گەورە لە نیوزیلەندا، وە بووبووم بە مۆدێکی بەرگی گۆڤارە ناشەرعیەکان.. لەو ماوەیەدا سەردانی خێزانێکی بە نەژاد لوبنانیم کرد کە نیشتەجێی ئوستورالیا بوون ، زنجیرەیەکی رەمەزانیم بینی کە دەربارەی (داوێنپاکی) دەدوا و ناونیشانی سایتەکەی لەسەر بوو ، تووشی ناهەمواریەکی توندو بووم، وام دەزانی ئەو زنجیرەیە لەگەڵ مندا قسە دەکات.. منیش لێم پرسین: ئایا خوای گەورە تەوبەم لێ قبووڵ دەکات و دەتوانم بگەرێمەوە بۆلای پەروەردگار؟! عەمرخالید وتی: ئەو پەیامەم بۆ هات و بەخۆم وت .. سبحان الله ، دەروونی مرۆڤ چەندە خراپەکاریش بێ هەر بەپەرۆشە بۆلای پەروەردگار، چۆن سك برسی دەبێت بۆ خواردن رۆحیش برسی دەبێت بۆلای پەروەردگار.. بۆیە

منیش پەیامێکم بۆ ناردو وتم: بێگومان خوای گەورە تەوبەت قبولْ دەکات و ڕێنماییم کرد بۆ مەرجەکانی تەوبە کردن. دوای دوو ڕۆژ پەیوەندی پێوە کردمەوە و وتی: بە تەواوەتی تەوبەم کردووە و گەڕاومەتەوە بۆلای پەروەدگارم، وە وازم لە هاوڕێیەکەم هێناوەو لەمڕۆ بەدواوە نایبینم ، پاش دوو ڕۆژی تر پەیوەندی پێوە کردمەوە و وتی: دەمەوێ فێری نوێژ ببم ، پاش دوو ڕۆژی تر پەیوەندی پێوە کردم و وتی: شریتەکانی قورئانم دەوێ ، ئێمەش شریتەکانی شێخی عەجمی و مشاریی ڕاشد و مەصحەفی مەدینە و هەموو زنجیرەی شریتەکانمان بۆ نارد.. هەفتەیەك بێ دەنگ بوو ، پاشان پەیوەندی کردەوەو وتی: وازم لە نازناوی شاژنی جوانانی شار هێنا .. پاش چوار ڕۆژ هەواڵی دڵخۆشکەری پێداین کە بالآی پۆشیوە.. بەڵام هێشتا چیرۆکەکە کۆتایی نەهاتووە، پاش دوو ڕۆژ لە بالآ پۆشیەکەی وتی: هەستم بە ئازارێکی زۆر توندکرد بۆیە چووم بۆ لای پزیشك ئەویش دوای پشکنین ووتی: تووشی شێرپەنجەی مێشك بوویت و چەند ڕۆژێکی کەمت لەبەردەمدا ماوە. ئەو کچە ڕۆژی هەینی بریار بوو کە بچێتە هۆڵی نەشتەرگەریەوە لە ئوستورالیا بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکی بەپەلە لە مێشکیدا کە ڕێژەی سەرکەوتنی (٢٠ ٪) تێپەری نەدەکرد بەپێی وتەی پزیشکەکان.. پزیشکەکان وایان دەوت بەڵام ئەو لە پەیامەکەدا وتی: زانایان ناتوانن چارەسەری نەخۆشیەکەم بکەن وە وتی: من دڵشادم بە دیدەنی خوای گەورە ، من دڵشادم من کاتێك تەوبەم کرد کە نەمدەزانی نەخۆشم ، من نازانم ئایا باوکم و دایکم بە حاڵی من دەزانن یان نا، ئەوان زۆر کەم پەیوەندیم پێوە دەکەن .. بەڵام من تەنها سێ هەفتەیە تەوبەم کردووە و بیست ساڵ سەرپێچی خوام کردووە ..دوعای خێرم بۆ بکەن کە خوای گەورە لە ریزی بەهەشتیەکاندا دامنێت ، وە ئەگەر خوای گەورە تەمەنم بداتێ خزمەت بە ئیسلام بکەم لە ڕێی ئەم سایتەی ئێوەوە.. ئەمە دەروازەیەك بوو بۆ من بەرەو ئیسلام. پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی ڕێنمایی بەندەکانی دەکات و لێیان خۆش دەبێت تا بیانخاتە ژێر ڕەحمەتی خۆیەوە؟؟ ناڵەی دەروونی تاوانباران خۆشەویسترە لەلای ئێمە لە تەسبیحاتی مەرایی کەران.. (إنا لله و إنا إليه راجعون) (اللهم اجرنا فی مصیبتنا و اخلفنا خيراً منها) سارە لە تەمەنی (٢٢) ساڵیدا وەفاتی کردو ئەمڕۆ لە گۆرستانی موسڵمانان لە نیوزیلەندا ئەسپەردە کرا و نوێژی هەینیان

لەسەر کرد.. پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەرییەکە پەیامێکی کورتی بۆ ناردبووم کە تیایدا وتبووی: من (٢٢) ساڵە دوور لە خوا دەژیم، بەڵام ماوەی سێ هەفتەیە گەڕاومەتەوە بۆلای خواو تەوبەم کردووە، وە دەتانگرم بە شایەت کە گەڕاومەتەوە بۆلای خواو وازم لەو هاورێیەم و لە کارکردن لە بارڕدا هێناوە وە وازم لە پێشبرکێی شازنی جوانان هێناوە ، وە باڵام پۆشیوە و پابەندم بە نوێژکردنەوە و شایەتی دەدەم بۆتان کەمن هەموو ئەم کارانەم لە پێناوی پەروەردگارمدا کردوە.. وە من بێجگە لە ئێوەی موسڵمان و بێجگە لەو پێگەیە کەس ناناسم وە داواتان لێدەکەم دوعای خێرم بۆبکەن کە پەروەردگارم رەحمم پێبکات و لێم خۆش بێت وە داوا لە پەروەردگارم دەکەم رێنمایی دایکم بکات وە ئەو هیچ دەربارەی من نازانێت. داواتان لێدەکەم چەندە دەتوانن کاری چاکە ئەنجام بدەن لە حەج و عومرە و بەخشش و دوعا و بینێرن بۆ (سارە).

ئایا بینیتان رەحمەتی خوا چەندە بەرفراوان بوو ، وە ئەو لە چارەنووسی نووسرا بوو کە لەو کاتەدا بمرێت ، بەڵام چارەنووسی خۆی بە رەحمەت و دینداریەوە تەواو کرد.. تەنها پێش سێ هەفتە تەوبەی کرد و وازی لە هەمووکارە خراپەکان و گوناهەکان هێنا .. پەروەردگار دەفەرموێ: ( إن في ذلك لذكرى لمن كان له قلب أو ألقى السمع و هو شهيد ).

## ٢٩- ﴿دووریی لە پەروەردگار﴾

هەر لە منداڵیەوە دەستم کرد بوو بە ئەنجامدانی نەریت و خوودی خراپ کە پڕ بوون لە سەر پێچی کردنی خوا ..دەشمزانی کە حەرامن و لە ڕەزامەندیی خوادا نین، بەڵام ئەوە وای لێ نەدەکردم نەیانکەم و بەردەوام نەبم لەسەریان، هەرکاتێك سەر پێچیەکم ئەنجام دەدا، ویژدانم لۆمەی دەکردم، بەڵام ویژدانیشم سەرکەوتوو نەبوو لە دوورخستنەوەم و واز هێنانم لەو کارانە، ئەوەی کە جێگای پێکەنین بوو ئەوە بوو کە من لە مامەڵەکردنم لەگەڵ کەسانی تردا زۆر بە ئەدەب بووم، هەمیشە سور بووم لەسەر بەختەوەر کردن و ڕەزامەندیی کەسانی تر، بەڵام ئەو سوربوونەم لە بەختەوەریی و ڕەزامەندی پەروەردگاردا نەبوو ئەویش بە شوێنکەوتنی فەرمانەکانی و دوور کەوتنەوە لە قەدەغە کراوەکانی. وەمن سەرکەوتوو بووم لەخوێندنم و بڕوانامە زانستیەکەمدا، هەمیشە لە ڕیزی یەکەمەکاندا بووم..بەڵام سوور نەبووم لە سەرئەوەی کە لە ڕیزی یەکەمەکاندا بم لە پەرستنی پەروەردگارو سوور بوون لەسەر ڕەفتار کردن بە پێی سوننەتی پێغەمبەر -درودی خوای لەسەر بێت-...چەندە شکست هاوەرە مرۆڤێك لە ژیانی دنیادا سەرکەوێت لەسەر حسابی سەرکەوتنێکی گرنگ کە سەرکەوتنی ڕۆژی دواییە و بردنەوەی بەهەشتە...لا حول ولا قوه إلا بالله، کێشەی دووەم پەیوەندی بەو واجباتانەوە هەبوو کە خوای گەورە فەرمانی پێداوین یان ئەو سوننەتانەی پێغەمبەرەکەی -درودی خوای لەسەر بێت -ڕێنومایی کردووین، وەك نوێژ کردن لە مزگەوتداو، خوێندنەوەی قورئان، هەموو کارێکی تری پەیوەستدار بە پەرستشەوە، من ئەنجامم ئەدان و داوای پاداشتم لە خوا دەکرد، بەڵام تەنها لە بەرخوای پەروەردگار نەبوو، بەهۆی چەندین مەبەستەوە بوو کە لە خوا دەپاڕێمەوە لێم خۆش بێت، هەوڵمدەدا دایك وباوکم لەخۆم ڕازیکەم، یان بۆ هاوسێ بوونم لەگەڵ ژینگەی دەوروبەرم، وەچەندین مەبەستی لەو جۆرە کە دەتوانێ مرۆڤ دووربخاتەوە لە مەبەستە سەرەکیەکە، کە ترسانە لە پەروەردگارو ئارەزوویەکی ڕاستەقینەیە بۆ پەرستشی خواو بەهۆی هیچ مەبەستێکەوە نیە...سوێند بەخوا ئەمە خاڵێکی گرنگ بوو کە هەمیشە لە مپەر بوو لە بەردەم بەختەوەریەکەمدا..وە لەوانەیە باشترین نموونە بۆ ئەو بارو دۆخەی من نوێژ بێت، بەڵێ نوێژ، لەگەڵ شارەزاییم بەرامبەر واجب بوونی

و گرنگی و شوێنەواری نوێژ لە ئیسلامدا، بەڵام ئەنجامدانی نوێژەکانم هەرگیز بە شێوەیەکی پێویست نەبوە، نەبوونی مل کەچی (خشوع)پابەند نەبوون بە کاتەکانی نوێژەوە، سور نەبووم لە ئەنجامدانیان بەکۆمەڵ لە مزگەوتدا، هەندێ لە ڕۆژەکان (بەتایبەتی کۆتایی هەفتەکان)لە بەیانیەوە دەخەوتم هەتا عیشا، کاتێکیش هەڵدەستام لەخە بەیەك جار هەموو نوێژەکانم دەکرد!! لا حول ولا قوه إلا بالله..فەرمایشتی پەروەردگار (فويل للمصلين الذين هم عن صلاتهم ساهون) هیچ کاریگەریەکی نەبوو لەسەرم، وە فەرموودەی پێغەمبەر –درودی خوای لەسەر بێت– (لوعلم الناس مافي صلاة العشاء والفجر لأتوهما ولو حبواً) واتە( ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە نوێژی عیشاو بەیانی چەندە خێرو پاداشتی هەیە بەسکەخشێش بوایە دەهاتن بۆ ئەنجامدانی) ئەمە هیچ کارێگەریەکی نەبوو لەسەرم..من ئەوانەم دەخوێندەوەو گوێم لێیان دەبوو بەڵام نەیاندەبزواندم!! من لەسەرگەردانی و سەراسیمەییدا دەژیام، لە تیاچوون و نەزانیندا بووم، زۆر دووربووم لە پەروەردگارەوە نەمدەتوانی دەستەکانم بەرز کەمەوە بۆ دوعاکردن، شەرمم لە هەموو گوناهانەم دەکرد کە پێیان هەستا بووم...وە هەرگیز بەبیرمدا نەدەهات کە ڕۆژێك بێت بتوانم وازیان لێ بێنم...بە نارەحەتی دەمتوانی نوێژێك ئەنجام بدەم، چونکە دەمزانی کەپاش ئەم نوێژە ڕاستەوخۆ تاوان دەکەم!! یاالله، بەخوا ئەمەیە بێ ئاگایی و تێکەڵ کردن، وە ئەوەش شەیتانە کە یەك سەعات بێ ئاگا نەدەبوو لێم، هەرکە دەستم بە تاڵ دەبوو هەڵدەستا بە هەموو شتێك بۆ ئەوەی بمبات بەرەو تاوانێك یان زیاتر کە من بە تەنها پێیان هەڵدەستام..لا حول ولاقوه إلا بالله..لەگەڵ بەسەر چوونی ڕۆژگاردا و گەیشتنم بە قۆناغی هەرزەکاریی و هەرەتی لاوێتی، تاوان و گوناهەکان گەشەیان سەند، دەستم کرد بە تەماشاکردنی فیلمە ناشەرعیەکان.

وە ئەوانەی جەستەیان ماندوو دەکرد، وە گوێگرتن لە هەموو جۆرە گۆرانیەك ئەوانەی دەبوونە هۆی ماندوو کردنی سۆزو ڕۆح، هاوڕێکانم کاریگەریەکی زۆریان هەبوو لە بوار ڕەخساندنم بۆ ئەو گوناهانە، تکایە زۆر زۆر ئاگاداربن لەهاوڕێی خراپ، سوێند بەخوا تووشی هەڵوێستی وا بووم حەزم نەکردووە گوناهی تێدا بکەم، بەڵام خۆم بینیوەتەوە لە گوناهەکەدام ،تەنها لەبەر ئەوەی لەگەڵیاندا بووم!! پەروەردگارا

ڕێنوومایی لاوانی موسڵمان بکەم...شتێکی چاوەڕوانکراو بوو کە دەست بکەم بە هەوڵدان بە سەرنج ڕاکێشانی ڕەگەزی دووەم، بەتایبەتی لەگەڵ هەموو ئەو شتانەدا کە ئەمڕۆ دەیان بینین، پەنا بەخوا لە هەڵوەشاندنەوەو تێکەڵاوی و دوور لە باڵاپۆشی و پاکیزەیی ڕۆح، ئەوە بوو دەستم کرد بە گەڕان بەدوای بینینی کچان و ئافرەتان لە تەلەفزیۆن و لە سروشتدا وە لە بازاڕو شەقامەکاندا، لەوانەیە ئەوە ڕاشکاوانە نەبێت بۆ کۆمەڵگا، بەڵام هەروا بوو، هەرکاتێ ئافرەتێکم ببینیایە جەستەی زیاتر بەدەرەوە بوایە، پەنا بە خوا زیاتر لەزەتم لێ وەر دەگرت!!

ئەگەر سەفەرم بکردایە بۆ دەرەوەی شانشینەکەمان بۆ کار یان بۆ گەشت لەگەڵ هاوڕێکانمدا ئەوە نوقمی گوناه دەبووم و دەچومە تیاترۆخانەو مەلهاکانی شەوو ئەو جۆرە شتانە،...لا حول ولاقوە إلا بالله...پاشان ژنم هێنا، هەموو ئومێدێکم ئەوە بوو ئەو کارەم کەمێك دەمگەڕێنێتەوە بۆ لای خوا...بەڵام بەداخەوە، هەموو شتەکان کە ڕوویان دەدا بەتەواوەتی پێچەوانەی ئەوە بوو....وە حەزناکەم غەیبەتی بکەم و باسی ئەو ژنە تەڵاقدراوەم بکەم کە سێ ساڵ ژیانم لەگەڵیدا بردە سەر (ئێستە ئەوەی لە توانامدا هەبێت بۆی دووعا کردنە بۆی کە خوای گەورە ڕێنمایی بکات) بەڵام مەبەستی من لە باسکردنی ئەوەیە دەمەوێ ڕوونی بکەمەوە کە ئەویش بەشێکی ژیانمی بەهەدەر بردو نەمتوانی پابەندبم بە فەرمانەکانی ئیسلامەوە، بەتایبەتی بواری باڵاپۆشی و تێکەڵاوی، پێکەوە (من و ئەو) گەشتبووینە ئەو پەڕی نزمایی لە دوورکەوتنەوەمان لە خوا، لا حول ولا قوە إلا بالله، ئێمە کاتێ سەردانی هەندێك خێزانمان دەکرد (خوای گەورە ڕێنومایی ئێمەو ئێوەش بکات) بە بێ باڵاپۆشی و شەرم پێکەوە دادەنیشتین، وامان دەزانی خوشك و برای یەکترین و مەحرەمین!!

کاتێ سەفەرمان دەکرد دەچووین بۆ مەلهاکان من و ژنەکەم لەبەرچاوی هەموو خەڵکیدا سەمامان دەکرد بەبێ ئەوەی لە خوا بترسین!!، بەبێ باڵا پۆشی و بەبێ شەرمکردن، بەڵکو ژنەکەم پۆشاکی تەسك و کورتی لە بەر دەکرد!!...ئایا دەبێ یەکێکی وەکو من هەموو ئەو تاوانە بکات؟! ئەو پرسیارە بەردەوام هەراسانی کردبووم، هەموو خۆشیەکانی ژیانمی تاڵ کردبوو، وەڵامەکەشی ئەوە بوو: ئەوەی ئەوکارانە دەکات من نییە، بەڵکو کەسێکی ترە لە ناخی مندا، من لەسەر نموونەی ئەم

خراپە کاریانە گۆش نەکراوم ..ولەسەر نموونەی ئەم بەرەڵایی و سافیرەییە...کاتێ ئەو کارانەم دەکرد لەناخمدا هەستم بە شتێکی نامۆ دەکرد، هەستێك کەس نازانێ بۆچی وەچۆن وادەکات، وامدەزانی لە خەودام نەك لە واقیعێکی قیزەونی شەرماویدا...وە لەوکاتەدا هیچم لە دەست نەدەهات تەنها ئەوە نەبێ خۆم وا نیشان دەدا کە زۆر بەختەوەرم لەگەڵ ژنەکەمدا....بەڵام کێ زۆری لێ دەکردم بۆ ئەوە؟ وە بۆچی نەمدەتوانی بەسەر خۆمدا بێم و بەرەو شێوازێکی دروست؟ وەڵامەکەی تەنها لە دوو ووشەدا خۆی حەشاردا بوو دووریی لە پەروەردگار بەڵێ، ئەوە بوو تەوەرەی سەرەکی من کەبەرەو هەموو ئەو خراپە کاریانە دەیبردم، وە دەتوانین ئەمەش زیاد کەین بۆی کە لە ڕاستیدا ئەو ئافرەتەی خێزانی من بوو هەرگیز حەزی لە زەواج نەبوو!! بەڵکو هەر لە ڕۆژانی یەکەممانەوە بەڕاشکاوانە ووتبووی دواهەمین شت کە بیری لێ بکاتەوە زەواجە!! لا حول ولا قوە إلا بالله، پاشان هەڵەیەکی تر ئەوە بوو من تەنها بەو تاوانانەوە نەوەستا بووم کە دەمکردن و ڕاهاتبووم لەسەری، بەڵکو دەمگێڕایەوە بۆ ژنەکەشم، ئەویش ئەو خاڵەی قۆزیبویەوە لە موساوەمە کردن لەسەری کە منیش وازی لێ بێنم کە ئەویش لەسەر چی ڕاهاتووە هەر بیکات، وە من ناتوانم زۆری لێ بکەم کە واز لەهەموو شتێ بێنێ لە کاتێکدا من بەردەوام هەموو شتێ دەکەم!!، خاڵی لاوازی منی بۆ دەرکەوتبوو، من نەمدەتوانی زۆر لەخۆم بکەم و واز لەو هەموو گوناهانە بێنم تا زۆریش لەو بکەم کە گوناهو تاوان نەکات، بەڵام ئەمانە ڕێگر نەبوو لە بەردەم ئازارە دەروونیەکانمدا.. خەوو خۆراکیان لێ تێك دابووم، کاتێ دەمبینی چی بووتایە دەیکرد وەسوکایەتی بە هەموو کەسێکیش دەکرد کە پاڵاپۆش و داوێن پاك بوایە...ژیانمان بەو شێوەیە سێ ساڵ درێژەی کێشا، جارێك و دووجار هەوڵمدا تەڵاقی بدەم، بەڵام ئەو لە هەموو جارێکدا پەیمانی پێدەدام ئەگەر وا بکەم خۆی دەکوژێ و تاوانەکەشی لەگەردنی من دەبێت. ئەو دەیزانی کۆمەڵگای ئێرە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئافرەتی تەڵاقدراودا دەکات، ئەو ناتوانێ ئەو هەموو بارگرانییە لە ئەستۆ بگرێ، منیش وازم لە بیرۆکەی تەڵاقدان دەهێنا بە هێواشی و هەروەها ترسان لە ئازاری وویژدان ئەگەر ئەو شتێك لە خۆی بکات، ژیانمان بەو شێوەیە بردەسەر تا چەندین شتی نوێ ڕوویاندا، چەندین شت کە وای لەو کرد خۆی حەز بکات کە تەڵاقی

بدەم.. لەوە باشتر بوو کە بەردەوام گوزەران لەگەڵ مندا بەرێتە سەر، بۆیە ئەوەی درکاندو پێی ووتم.. منیش خێرا بڕیارمدا، ئەو کارەم کرد کەسێ ساڵە من چاوەڕوانی دەکەم ،و تەڵاقمدا بەڵام بەبێ ئەوەی هەست بە ئازاری وویژدان بکەم.....ساتی تەڵاقدان و ڕۆژەکانی دوای ئەوە هەنگاوی یەکەمی من بوو بەرەو گۆڕان، وام لێهاتبوو موناجاتی خۆم دەکردو لەگەڵ خۆمدا دەدوام ئەو هەموو گوناهانە چییە من کردومن؟ بۆچی ئەنجامم دەدان؟ هەموو جارێکیش وەڵامەکەی بریتی بوو لە دوو ووشەی (دووری لە پەروەردگار)هاوڕێیەکم (ناوی نابەم بەڵام دەڵێم خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە)..جار ناجارێك لەڕێی بەریدی ئەلیکترۆنیەوە هەندێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر -درودی خوای گەورەی لەسەر بێت- بۆ دەناردم، یان پەندو دوعای دیاریکراو، وە منیش هەموو جارێك دەمخوێندەوەو هەستم بە شیرینیی ماناو واتاکانی دەکرد، بەڵام لەهەمان کاتدا هەستم بە دڵتەنگی دەکرد چونکە ئەو بەڵێنانەی کە تیایدا بوو تارادەیەکی زۆر بەسەرمندا دەچەسپا.....وەکاتێك کە ژنەکەمم تەڵاقداو دوای مۆڵەتێکی هاوینەیی گەڕامەوە بۆماڵەوە، کەل و پەلی ماڵەکەمیان دزیی بوو، بەڵام سەیر لەوەدا بوو ئەو کەل و پەلانەی کە دزرا بوون، تەنها ئەوانە بوون کەمن لە گوناهکردندا بەکارم دەهێنا، بەڵێ سوێند بەخوا، ڤیدیۆ کاسێت و سی دی و ، تەسیجل بۆ گوێگرتن لە گۆرانی و کامێرای دیجیتاڵی تایبەت بە کۆمپیوتەر، ئەم چوار ئامێرە من هەموو کاتەکانم پێیان دەبردەسەر لەسەر پێچیی کردنی پەروەردگاردا بە شێوەیەك لە شێوەکان، وە خۆم دانابوو لەمیانی مۆڵەت وەرگرتنەکەمدا و کاتێ دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە زیاتر بەکاریان دەهێنم بە تایبەتی دوای حاڵەتی تەڵاقدانەکە بە تەنهام و بوارم زیاترە، بەڵام کە گەڕامەوە هیچیانم نەبینی ، هەموویان دزرابوون، لەسەرتادا زۆر توڕەو بێتاقەت بووم، سور بووم لەسەر ئەوەی سەر لەنوێ بیانکڕمەوە، بەڵام من لەو کاتەدا بێ پارە بووم، بۆیە بڕیارمدا دوایبخەم تا کەمێك پارە پاشەکەوت دەکەم، وە پرسیارم لەخۆم دەکرد چۆن ڕۆژانی داهاتووم بەبێ ئەو ئامێرانە بەسەر بەرم؟...مانگی یەکەم بەسەر چوو، هەر ڕۆژێك بەسەر دەچوو زیاتر هەستم بەوە دەکرد کە من دەتوانم بەبێ ئەو ئامێرانە بژیم کە پێشتر وا گومانم دەبر کە بەبێ ئەوانە ناتوانم بژیم، بۆیە بیرۆکەی کڕینی ئەو ئامێرانە وورده وورده بەرەو داڕوخان دەرۆشت،

تەلەفزیۆنەکە بەس بوو بۆ من کە برێك کەناڵی کەمی تێدا بوو کە وولاتی خۆمان بۆی دابێن کردبووین، وە من دوای سێ مانگ پاش حاڵەتی تەلاقدانەکە، لەگەڵ نەبوونی ئەو ئامێرانەی کە دزرا بوون، گوناهکردنەکانم گەشتبوونە رادەیەکی زۆر زۆر نزم، بەڵام بە هیچ شێوەیەك هەوڵم نەدەدا پەرستشەکان ئەنجام بدەم، لەگەڵ ئەوەدا کە لەناخمدا هەستم کردبوو کە زۆر گۆڕاوم و جیاوازیەکی زۆرم هەیە لەگەڵ ئەوکاتەدا کە ژنم هەبوو... لەو چەند مانگەدا رۆژێکیان بەکەناڵەکانی ناو تەلەفزیۆندا دەگەڕام، بە رێکەوت خستمە سەر کەناڵی (اقرا)بەرنامەیەکی پەخش دەکرد بەناوی (ونلقى الأحبة)لە پێشکەشکردنی بانگخوازی ئیسلامی مامۆستا عەمر خالید، لەو بەرنامەدا مامۆستا عەمر خالید بەسەرهاتی هاوەڵانی دەگێڕایەوە کە چۆن پێویستە ئێمەش چاو لەوان بکەین، وە ئەو وانانە چین کە پێویستە سودیان لێ ببینین لە چیرۆکەکانیان و هەڵوێستەکانیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا -درودی خوای لەسەر بێت- شێوازەکەی کاریگەرو خۆش بوو لەگەڵ عەقڵ و هەستی ئامادەبوان و بینەراندا دەدوا، وەزۆر بەراستگۆیانە لۆمەی دەکردن لەو حاڵەتەی کە تیایدا دەژین لە دوورکەوتنەوەمان لە ئیسلام و شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەرو ئیقتیدا کردن بە هاوەڵانەوە...تەماشامکرد حەز دەکەم بەتاسەوە گوێ لە زنجیرەکانی ئەو بەرنامەیە بگرم، وە لە هەفتەیەکەوە بۆ هەفتەیەکی تر چاوەڕوان بووم تا ئەو زنیجرەییە ببینم، زیاترو زیاتر گوێبیستی ژیانی هاوەڵانی پێغەبمەر -درودی خوای لەسەر بێت- دەبووم بەو شێوازە کاریگەرەی (عەمرخالید)...

.... رەمەزان هات، مانگی خێرو بەرەکەت هات، مانگی رەحمەت و لێبوردن و رزگار بوون لە ئاگر، ئەوە دواهەمین رووداو بوو کە گێڕامیەوە بۆ لای پەروەردگار، وە ئەو مرۆڤە سەرکەشەی لەناخی مندا دەژیا مرد تا مرۆڤێکی نوێ لەدایك ببێت، چۆن ئەوە روویدا؟ وە ئەوە چی بوو کە توانی ئەو بکوژێت؟...بەڵێ لەمیانی یەکێ لە زنیجرەکانی بەرنامەی (ونلقى الأحبە) عەمر خالید باسی یەکێ لە هاوەڵانی دەکرد، وە لەمیانی بەسەرهاتەکەیدا هاوەڵەکە لە کاتی گوێ بیستنی بۆ ئەم ئایەتە (وإن منکم إلا واردها) دەستی کرد بەگریان، کاتێ هۆکاری گریانەکەیان لێ پرسی، ووتی: خوای گەرە هەواڵی پێداوین (وە بە هەموو بەندەکانی)لە پردی (السراط)ەوە تێدەپەڕن بە ئاگردا،

وە ئەو هاوەڵە دڵنیا نەبوو کە ئایا دەتوانێ پردی سیراط ببڕێت!! یا الله...ئەو هاوەڵە بەهەموو ئەو پەرستشانەیەوە بۆ پەروەردگار دەگریا لەترسی ئەوەی کە نەتوانێت ئەو سیراطە تێپەڕێنێت، ئێمە چەندە دوورین لە خواوە کەچی بۆ تاکە ساتێکیش بیر لەو سیراطە ناکەینەوە، وەك ئەوەی کە نەیەتە ڕێگامان و لەقیامەتدا دوچاری نەبین!!

لێرەدا مامۆستا عەمر ووتی: پێویستە هەموو مرۆڤێ پرسیار لە خۆی بکات، و ڕاستگۆ بێت لەگەڵ خۆیدا، ئەمەش پرسیارە کەیە: ئایا ئەو کردەوانەی کە ئێستا من ئەنجامی دەدەم زامنن بۆ ئەوەی کە لە قیامەتدا بە ئاسانی پردی سیرات تیپەڕێنم؟!، ئەو سیراتەی باریکترە لە موو وە تیژ ترە لە شمشێر، ئەو سیراتەی دەورە دراوە بە ئاگری دۆزەخ..لەوکاتەدا، تەنها لەوکاتەدا، هەستم بە هەموو شتێك کرد، ئەو پرسارەم لەخۆم کرد، بینیم زۆر بە سانایی وەڵامەکەی بریتیە لە: نەخێر، ناتوانم پردی سیرات بەم شێوە ژیانەی ئێستام تێپەڕێنم، لەگەڵ ئەو هەموو گوناه و سەرپێیانەی کە دەیانکەم، ئەو کاتەهەستم بە ڕاستەقینەیی دووریم لە پەروەردگار دەکرد، بۆیە هەستامەوە، یان ڕاستر بڵێین: ترسم لێنیشت، نابێ کۆتایی من بەو شێوەیە بێت، پەنا بەخوا ئاگری دۆزەخ، خوای گەورە عەقڵێکی پێ بەخشیوم بیری پێبکەمەوە، بۆچی بەو شێوەیە بەکاری نەهێنم کە یارمەتیدەرم بێت بۆ تێپەڕاندنی سیرات؟ یان بەلانی کەمەوە بەو شێوەیەی ئەو پێم ببەخشێت کە بتوانم تیپەڕینم، بۆیە بڕیارمدا...خۆشترین و بەتامترین بڕیار لە هەموو ژیانمدا، بڕیاری تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا... هەستام نوێژم کرد بۆ خوا، ئیعلانی تەوبەم کرد، وە پەشیمانی لەسەر کردەوەکانم ئەو هەموو زیادەڕەویەی کە کردبووم، سووربوونم لەسەر ئەوەی نەگەڕێمەوە بۆسەر پێچیکردن چەندە هۆگری بووبم و ساڵانێکی درێژ ڕاهاتبووم لەسەری، تەنها لەوکاتەدا، ئەو مرۆڤە لە ناخمدا بوو مرد، وە مرۆڤێکی نوێ لە دایك بوو، مرۆڤێکی نوێ کە هەموو خەمێکی ئەوە بوو ملکەچی پەروەردگاری بێت وەسەرپێچی نەکات، وە یەکەم ئامانج و گرنگترینیان تێپەڕاندنی پردی سیرات و گەیشتن بە ڕۆژی بەهەشت بێت پشت بەخوای گەورە...شتێکی تر هەبوو کە هانی دەدام و عەزیمەتی زیاتر دەکردم، ئەویش چیرۆکی هاوەڵێکی تر بوو لە مامۆستا عەمر خالیدەوە گوێم لێ بوو (خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە بەوکارەی کە پێی

هەڵدەستێت بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسڵمانان) ئەیوش هاوەڵ (ذو الجوشن الضبابی)بوو، پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت پێی فەرموو: ئەی (ذو الجوشن) ئایا دەتەوێ ببیتە یەکەمەکان (واتە یەکەمینی ئەوانەی کە موسڵمان دەبن)؟ ئەمە لەسەرەتای بانگەوازکردندا بوو بۆ ئیسلام، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو، وە دوای ساڵانێکی درێژ، و کاتێك فەتحی مەککە کرا (ذو الجوشن)موسڵمان بوو، پەنجەی خویی گەست چونکە لە ڕیزی ئەو یەکەمانەدا نەژمار نەکرا کە موسڵمان بوو بوون، لەکاتێکدا فرسەت هاتە بەردەستی، ئەم چیرۆکە ئەو وانەیەمان پێ دەدات کەلە سەر مرۆڤ پێویستە هەوڵ بدات لەیەکەمەکان بێت لەگەڕانەوە بۆ لای خوا، چونکە من ڕاهاتبووم کە لە یەکەمەکان بم لە بەدەستخستنی زانستدا، ئێستەش فرسەتی ئەوەم بۆ هاتووە کە لە یەکەمەکان بم لە گەڕانەوە بۆ لای خوا لە ناو خێزانەکەم و ناو هاوڕێکانمدا...وە سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەم هەموو شتانە، وە دەپاڕێمەوە لە خوا ڕێنومایی براو خوشکانم و لاوانی موسڵمان بکات بە گەڕانەوە و ڕێنموونی...لەو ڕۆژەوە، هەموو شتێ گۆڕا، بە تەواوی ژیانم گۆڕا، وە بۆ یەکەمین جار، هەستم بە چێژ و شیرینی ژیانکرد، سوێند بەخوا شیرینیەك کە لە هەموو ژیانمدا هەستم پێ نەکردبوو...هەستم بە پاکیەتی دەکرد، هەستم بەمانای خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی دەکرد، ئەوەش بە شوێنکەوتنی ئەو شتانەی فەرمانمان پێ دەکرێت و دوور کەوتنەوە لەو شتانەی قەدەغە دەکرێت لێمان....هەستم بەسەراسیمیەیی و سەرسامی نە دەکرد لە ژیاندا، بەڵکو ژیانم گۆڕدرا بوو بۆ دڵنیایی و جێگیریی، بەدرێژایی (٢٦)ساڵی ژیانم، چاوەکانم یەك فرمێسکی پیادا نەهاتبووە خوار لە ترسی پەروەردگار، وە من هەمیشە لەخۆمم دەپرسی: مرۆڤەکان چۆن بە تاسەوە دەگرین کاتێك گوێیان لە دوعا یان خوێندنی قورئان دەبێت؟ بێهودانە هەوڵم دەدا فرمێسك بە چاوانمدا بێتە خوار لە هەندێ ساتدا تاوا هەست بکەم منیش وەکو کەسانی ترم، بەڵام هەوڵەکانم بێ هودە بوون، کەچی ئێستا، دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ لای پەروەردگارم، و هۆگر بووم پێیەوە، و ڕزگارم بووە لە سەرپێچیکردن، چاوەکانم ڕۆژانە فرمێسکیان پیادا دێتە خوارەوە کاتێك قورئان دەخوێنم یان گوێی لێ دەگرم یان گوێم لە دوعایەك دەبێت بە دەنگێکی خۆش، دەرکم بەوە کرد کە فرمێسك دێت بەچاواندا بەبێ ئەوەی مرۆڤ هەست بکات

یان زاڵ بێت بەسەریدا، وەڵڵاهی شیرینی یەك دڵۆپ فرمێسك لە ترسی خوا هەرگیز بە ووشە گوزارش ناکرێت، هێشتا یەکەمین ساتم لەیادە کە ئەو حاڵەتە هات بەسەرمدا، نە نوێژی (التجهد)دا بووم لە یەکێك لە دەهەمین ڕۆژەکانی کۆتایی ڕەمەزان، وە لەکاتی دوعای (القنوت)دا کە ئیمامی مزگەوت بەدەنگێکی خۆش دەیخوێند، بڕوام بەخۆم نەکرد، بڕوام نەکرد کە من لەو ساتانەدا دەژیم کە پێشتر بێ هودە خوازیاری بووم، تا نەگەڕامەوە بۆلای پەروەردگارم نەم دەتوانی بگریم، لەو ڕۆژەوە لەکاتی زۆرێك لە هەڵویستە جوانەکاندا زۆربەی ڕۆژ فرمێسك بەچاوانمدا دێت...ئێستەش، دوای بەسەر چونی نزیکەی مانگ و نیویك سەر ڕەمەزانی خێرو بەرەکەتدا، زۆرێك لەکارانی خێر فێر بووم، کە خوازیارم هەموو کەسێك بیانکات تا هەست بە لەزەتی ژیان بکەن وە ئەو لەزەت و چێژەی کە پێویستە مرۆڤ پاك بێتەوە لە گوناهو ملکەچی تەواوی پەروەردگار بێت...

وە لە ڕوانگەی ئایەتی (وأما بنعمة ربك فحدث) باس لە نیعمەتانی پەروەردگارت بکە کەمێك دەربارەی ئەو کارو بارو پەرستشانە دەدوێم کە فێریان بووم و ڕاهاتووم لەسەری، دەخوازم لە پەروەردگار ببێتە هۆی هاندان بۆ خوشك و برایانی خوێنەر تاوەکو تاقی بکەنەوە، بەتایبەتی لەگەڵ زانینی هەموو ئەو گوناهانەدا کە بەردەوام بووم لە سەریان وە چۆن مرۆڤ دەتوانێت سەرزەنشتی خۆی بکات و ئەو سەرپێچیانەی کردوویەتی بیانگۆڕێت بۆ پەرستش و بەندایەتی بۆ پەروەردگار ئەگەر بەڕاستگۆیانە پێدابگرێت لەسەری...من ئێستا نوێژەکانم لەکاتی خۆیاندا لە مزگەوتدا ئەنجام دەدەم، بە تیابەتی نوێژی بەیانی لەکاتی خۆیدا، ئەو نوێژەی کەوا گومان دەبەم بە درێژایی (٢٦)ساڵ لەکاتی خۆیدا ئەنجامم نەداوە تەنها چەند جارێك نەبێت کە بە پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن، لەخوا دەخواز کەلێم ببورێت، وە هەروەها خوێندنەوەی قورئان بە بەردەوامی، ئەو پەڕاوەی تەنها لە ڕەمەزاندا نەبوایە نەمدەکردەوە.ز نەمدەزانی لە کوێدایەو چی تێدایە!! لەمساڵەوە بۆ ساڵێکی تر کتێبی خوام نەدەکردەوە!! لا حول ولا قوە إلا بالله، وە هەروەها کردنی سوننەتەکان بە تایبەتی نوێژە سوننەتەکان، ئەمانەیان هەرگیز لە ژیانمدا نەمکردوون، زیکری زۆری خوای گەورەو تەسبیحات و ئیستیغفار، تا زمانم پاراو بێت بەزیکری خواوە، وە

بۆئەوەی دڵم ڕابێت بە زیکری پەروەردگار، ئەو شریتانەی کەگۆرانی بوون گۆڕیمن بۆ وانەو بابەتی ئاینی و زانستی، وە نەلە تەلەفزیۆنداو نە لە سروشتیشدا تەماشای ئافرەتم نەدەکرد، وە چاوپۆشین بە تامترینی ئەو گوێڕایەڵیانە بوو کەپێی هەڵدەستام، وە چەندین کاری ترو سوپاسێکی بێ پایانی خوای موتەعال دەکەم لەسەری....بەو شێوەیە خوشك و برای موسڵمان دەبینیت مرۆڤ ئەگەر بەڕاشکاوانە خۆی بدوێنێت و عەقڵی بەرقەرار بێنێت و لۆمەی دەروون و شەهواتەکانی خۆی بکات، ئەوە لەتوانایدا هەیە واز لە هەموو سەرپێچی و تاوانێك بێنێت، با ئەندازەی ڕاهاتنەکەشی لەسەری زۆر بێت و قەناعەتی وابێت کە ناتوانێ دەستبەرداری ئەو گوناهو تاوانانە بێت، سوێند بەو خوایەی پەرستراو نیە بێجگە لەو، شیرینی تەوبەکردن و ملکەچی بۆ پەروەردگار هیچ شرینیەکی تری پێ ناگات، هەرکەسێ بەڕاستگۆیانە بگەڕێتەوە بۆلای خواو پەنا بۆ خوا بەرێت پەروەردگاریش یارمەتیدەری دەبێت.. هیچ شتێ بەڕادەی ئەم فەرموودەیە ڕاست نیە کە پەروەردگار لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێ (من تقرب الى شبراً، تقربت إليه ذراعاً، ومن تقرب إلي ذرعاً، تقوبت إليه باعاً، ومن اتاني مشياً، اتيته هرولة، ولا يزال العبد يتقرب إلي بالنوافل حتى احبه، فإن احببته كنتُ بَصَرة الذي يبصر به، وسَمعة الذي يسمع به....إلى آخر الحديث) واتە: { ئەوەی بستێك لێم نزیك بێتەوە باڵێك لێ نزیك دەبمەوە، وە ئەوەی باڵێك لێم نزیك بێتەوە گەزێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەوەی بە پیادەبێت بۆلام، من بە هەروەڵە دەچم بۆ لای، بەندەی من بە نویژە سوننەتەکانی بەردەوام نزیك دەبێتەوە لە من تا خۆشم دەوێت، کاتێکش خۆشم بوێت من دەبمە ئەو بیناییەی کە پێی دەبینێت، وە دەبمە ئەو بیستنەی کە پێی دەبیستێ.....تاکۆتایی فەرمودەکە} . برایان و خوشکانم ئایا بینیتان؟ ئایا بینیتان چۆن خوای گەورە دڵخۆش دەبێت بەگەڕانەوەی بەندەکەی بۆلای و یارمەتی زیاتری دەدات بۆ نیزك بونەوە؟ ئیتر تاکەی؟ تاکەی بڵێین ناتوانین واز لەسەرپێچیەکان بێنین؟ تاکەی بڵێین ناتوانین پابەند بین بە پەرستشەکانەوە؟ تاکەی؟ ئایا چاوەڕوان بین تا مردن یەخەمان دەگرێت و ئێمەش هەر لە بێئاگاییدا بین؟ سوێند بەخوا مردن (سەکەرات)ی لەگەڵدایە، پەشیمانی لەکاتی مردندا دادی نیە، ئیتر تاکەی؟ هەمان پرسیار لەخۆتان بکەن ئایا کردەوەکانتان و ژیانی ئێستاتان

یارمەتیتان دەدات لە پردی (سیرات) تیپەڕ بن؟ ئێوە چیتان دەوێ لەم ژیانەدا؟ وە بۆچی دروستکراون تیایدا؟ لەوەڵامدانەوەدا ڕاستگۆبن لەگەڵ خۆتاندا...ئەمە بەسەرهاتی تەوبە کردن و گەڕانەوەی من بوو بۆ لای خوا.. دەخوازم هەرکەس کە دەیخوێنێتەوە سوودی لێ وەربگرێت، وە ئەم چیرۆکە و بەسەرهاتەم هۆکارێك بێت بۆ گەڕانەوەی زۆرێك لە خەڵکی بۆ لای خوا، کۆتایی قسەکانم دێنم بە یاد خستنەوەی ئەوەی لەسەرەتادا باسم کرد، داوا لە هەرکەسێك دەکەم کە دەمناسن لەخوا بپاڕێتەوە کە لەو مرۆڤە خۆش بێت کە لە ڕەمەزاندا لەدایك بوو، وە دوعای بۆ بکەن کە جێگیری بکات و بەردەوامی ببەخشێت بەو مرۆڤە تازەیەی لە ڕەمەزاندا لەدایك بوو...

## ٣٠- ﴿ناپاکی﴾

چیرۆکەکەم لەوانەیە کەمێك سەیر بێت .. من تەمەنم (٢٣) ساڵە لە قۆناغی چواری کۆلێژی بازرگانیدام، پێنج ساڵە زەواجم کردووە پێشتر ژیانم بریتی بوو لە کێوێك لە گوناه، لەکاتێکیشدا کە ژنم هەبوو پەیوەندیم لەگەڵ ئافرەتانی تریشدا هەبوو ، لەگەڵ ئەو ئافرەتانەیشدا دەچوومە دەرەوە و لە گوناهدا دەگەوزاین بەبێ هەستکردن بە تاوان و ترسان لە خوا.. من بیرم چوو بووەوە یان لە بیرم کردبوو کە پەندێك هەیە دەڵێ: چی بچێنی ئەوە دەدوریتەوە.. من ئەم پەندەم بیستووە بەلاَم هەستم بە بەهاکەی نەکردووە، رۆژێکیان بۆ زانکۆ دەچووم هەستم بە گۆڕانی سیمای ژنەکەم کردبوو، گومانی بۆ دروست کردبووم هاتمە دەرەوە لەماڵ بەلاَم پاش نیو سەعات گەرامەوە بۆ ماڵ، بینیم ژنەکەم بەتەلەفون لەگەڵ لاوێکدا باسی سۆزداری و خۆشەویستی دەکەن، هەمان ئەو تەلەفونەی کە من بەهۆیەوە پەیوەندیم دەکرد، بۆیە وەك سوونەتێکی خوایی چیم چاند دووریمەوە.. خەریك بوو بیکوژم بەلاَم خوای گەورە رەحمی بە من و ئەو کرد، بە توندی گریام، پاش ماوەیەك چووم بۆ ماڵی باوکی تا تەلاَقی بدەم.. بەلاَم لەوێ هەڵوێستی خێزانم بە تەواوەتی گۆڕا بوو، خێزانم پێی وتم: لەمەودوا بەراستی لە خوا دەترسم و تەوبە دەکەم ئەگەر تۆ لێم خۆش ببیت و دوا فرسەتم بدەیتێ.. پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی دۆخەکان دەگۆڕێت.. وەڵلاَهی ئێستا خێزانم بە حەزو ئارەزوی خۆی (نیقاب)یش دەپۆشێت، هیچ فەرزو سونەتێك فەرامۆش ناکات و شەونوێژیش دەکات.. وە منیش هەروەها، وە ئێستا خێزانەکەمان سوپاس بۆ خوا نموونەی دینداریی و پابەندبوونە، وە هەردووکمان پەیمانمان دا بە خوای گەورە کە هەرگیز نەگەڕێینەوە بۆ سەر تاوان و گوناه.. سوپاس بۆ خوا.

لە بیرتان نەچێت چی بچێنیت ئەوە دەدوریتەوە.

## ٣١- ﴿مـــردوو شـــــۆر﴾

مـن كـچێكم لـه تهمـهنی (١٨) ساڵیدام حـهز دهكـهم ئـهو بهسـهرهاتهتان بـۆ بگێرمـهوه كـه كاریگهریهكی گهورهی ههبوو لهسهر دڵم.. بهشێوهیهك نوێـژهكانم بـه رێكوپێكی نـهدهكرد، بـهڵام كـاتێ ئـهو چـیرۆكهم خوێنـدهوه هـهموو نوێـژهكانم لـهكاتی خۆیـدا ئـهنجام دهدا.. رۆژێكیان مامۆستاكهمان له وانهی (ئایین) دا، لاپهڕهیـهكی بچوكی بهسـهردا دابـهش كـردین كه باسی بهسـهرهاتی مـردو شـۆرێكی ئـافرهتی دهكـرد. وتـی: جارێكیـان دهیانـهوێت تـهرمی كـچێك بـشۆن تـا كفـن و دفنـی بكـهن، پهیوهنـدیان كـرد بـه مـردوو شـۆرێكی ئافرهتـهوه تـا بیشوات، ئافرهتهكهش رهزامهندی نیشاندا چونكه ئهوه كاری ئهوه، كاتێ دهڕواته ماڵهكهوه ، پێیان دهڵێ كوا لاشهكه؟ ئامـاژهی دهرگـای ژوورهكـهی بـۆ دهكـهن ئـهویش دهچـێته ژوورهوه، دوای ئهوه كهسوكاری مردووهكه دهرگای ژوورهكه لهسهر مردوو شـۆرهكه دادهخـهن، مـردوو شۆرهكهش دهترسێ و تهقه له دهرگاكه دهدات تا بۆی بكهنهوه بهڵام كهس وهڵامی ناداتـهوه، وه ههستی كرد كه ئاو و كفن له پاڵ لاشهكهدا ئاماده كراوه بۆی ...كـاتێ سـهری مردوهكـهی لادا تا لاشهكه ببینێت و دهست بكـات بـه شـۆردنی، لاشـهیهكی رهش داگیرسـاوی بینـی وهكو خهڵووز، سهری سوورِما لـهو شـێوهیهو هـهرگیز ئهوهنـده نهترسـابوو بۆیـه دهسـتی كـرد بـه خوێندنی (آیةالكرسی) و (المعوذتین). دهستی كرد به شۆردنی، بهڵام شۆردنی ئهو لاشهیه زۆر نارهحهت بوو چونكه لهشی وهكو خۆڵه مێـشی پـڕاوی لێهاتبوو ، هـهر شـوێنێكی لهشـی بگرتایه لـه دهسـتی بهردهبوویـهوه، بۆیـه بـه خێرایـی كارهكـهی خـۆیی ئهنجامـدا تـا بـچێته دردوه و ئیتر نهگهرێتهوه، كاتێ لێ بوویهوه له دهرگایدا و پێی وتن: تـهواو بـووم.. ئـهوانیش دهرگایان بۆ كردهوه.. ئافرهتهكه به خێرایـی لـه ماڵهكـه چـووه دهرهوه بـهرهو مـاڵی خۆیـان بهبێ ئهوهی هۆكاری ئـهوه لـه خـاوهن مردووهكه بپرسـێ.. دوای چـهند رۆژێ چـوو بـۆ لای شێخێكی گهوره، ئهو بهسهرهاتهی بـۆ گێرایـهوه كهچـی بهسـهر هـاتووه.. ئـهویش پێـی وت: برۆ بۆلای خاوهن مردووهكه و هۆكاری ئـهوهیان لێ بپرسـه ئـهویش رۆشـت بـۆ لایـان و پێـی وتن: دهمهوێ هۆكاری دهرگا داخستنهكهتان لێ بپرسم لهگهڵ ئـهو لاشـهدا، وتیـان: چونكه ههركاتێ مردوو شۆرێكی ئافرهتمان دههێنا تا بیشوات، كاتێ حاڵهتهكـهی دهبینـی رایـدهكرد، نزیكهی ده مردوو شۆری ئافرهتمان هێنـا تـۆ دواهـهمینیان بوویـت ترسـاین تـۆش رابكـهیت، مـردوو شـۆرهكه وتـی: باشـه، حـاڵی كـچهكهتان بۆچـی وابـوو.. ئـهوانیش وتیـان نوێـژی

نەدەکرد.. هیوادارم ئەم بەسەرهاتە جێگای سەرنجتان بێت و کاریگەریی هەبێت لەسەرتان وەك چۆن کاریگەری هەبوو لەسەر من.. وە پارێزگاری لە نوێژەکانتان بکەن چونکە ئایینتانە، ئەوەی نوێژ ئەنجام بدات دەستی بە ئایینەوە گرتووە.. ئەگەر ئەوە حاڵی مردوویەك بێت پێش ئەسپەردەکردنی ئەبێ دوای ئەسپەردەکردنی حاڵی چۆن بێت؟ نوێژ بکە پێش ئەوەی نوێژت لەسەر بکرێت.

## ٣٢- ﴿كتێبی خوا ڕزگاریکردم﴾

بەداخەوە من پێشتر جگەرەکێشێکی سەرسەخت بووم.. ڕاست نیە ئەگەر بڵێم ڕۆژانە ٢ بۆ ٤ پاکەت جگەرەم دەکێشا، بەڵام هیچ ڕۆژێ لە دووپاکت کەمترم نەدەکێشا.. لەتەمەنی ١٤ساڵییەوە خووم پێوە گرتبوو، بەدرێژایی (٢٤)ساڵ بەردەوام بووم لەسەر ئەو خووە پیسە، واتە پێش دووساڵ بەر لە ئێستا.

دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم: ڕۆژێك نەبووە لە ژیانمدا دەستبەرداری ئەو –هاوڕێ خراپەم–بووبم.. واتە دووکەڵی جگەرە بەدرێژایی چارەکە سەدەیەکی گرنگی ژیانم!! وە بەرپەرچی هەموو ئەوکەسانەم دەدایەوە کە دەیانەویست قسەیەکی خەیرم بۆ بکەن بۆ وازهێنان لەو ئەریتە خراپە..

لەکاتی لەشساغی و نەخۆشیدا دەستبەرداری نەدەبووم، وە لەڕۆژانێکی سەرماوسۆڵەی توندیشدا کە بە ئاسانی نەمدەتوانی هەناسە بدەم وازم لێ نەدەهێنا، بەکورتی، بەوەفابووم بەرامبەر بەو هاوڕێ نەگریس و نەگبەتە.. پێش دوو ساڵ لەمەوپێش و لەشەوێکدا، زۆر حەزم لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بوو، هەستام خۆم پاك کردەوەو قورئانێکی پیرۆزم هێناو لەبەردەمی خۆمدا دامنا لەسەر مێزێك لەپاڵ پاکەتێك جگەرەدا بە ئومێدی خۆئامادەکردن بۆ خوێندنەوەی، جگەرەیەکم داگیرساند بە نیازی ئەوەی دوای تەواوکردنی ئەو تاکە جگەرەیە دەست بکەم بە خوێندنەوەی قورئانەکە.. پاشان بەهۆی حەزی زۆرم لە جگەرە و بەو نیازەی دوایی بتوانم ماوەیەکی زۆر قورئان بخوێنم جگەرەیەکی تریشم داگیرساند.. پاشان دەروونم یان شەیتانی نەفرەت لێکراو خستیانە مێشکمەوە کە جگەرەی سێ یەمیش دایگرسێنم بەنیەتێکی پاکەوە ئەوەش بەو نیازەی زۆرترین ماوە بتوانم قورئانی تێدا بخوێنم.

پاشان بەهەمان نیەت و نیازی باشە جگەرەی چوارەم و پێنجەم و شەشەم و زیاترم داگیرساند.

دوای نزیکەی دوو سەعات، بینیم کە بڕێکی زۆر جگەرەم کێشاوەو یەك پیتیش لە قورئانم نەخوێندوەتەوە.. تەنها ئەوەم لە تواناداببوو تەماشای قورئانەکە لەلای ڕاستی مێزەکەوەو پاکەتە جگەرەکە لەلای چەپیەوە بکەم.. ترازووی ئەو دنیام هێنایە پێش چاوی خۆم ..لای ڕاستیەوەی قورئانی لەسەرەو لای چەپیشی ئەو پاکەتە جگەرەی

لەسەرە... بیرم کردەوە کە من بەدرێژایی ئەو دوو سەعاتە گرنگیم بەلای چەپی ئەو ترازووە داوە، بەخۆمم ووت: سوێند بەخوا دەچمە ڕیزی سەرگەردانەکانەوە ئەگەر لای ڕاستی ترازوەکە هەڵنەبژێرم بەدرێژایی ژیانم.. ئا لەوساتەدا، ئیتر جگەرەم نەکێشا، وە ئەگەر ڕەحمەت و فەزڵی خوای گەورە نەبوایەو نەیخستایەتە دڵمەوە کە ئەو بەراوردکاریە بکەم بەو شێوەیە، ئەوە هیچ ساتێك بیرم لەوە نەدەکردەوە کە واز لەو کارە گوناهە بێنم کە ژیانی خۆم و خێزانەکەمی یەکالآ کردبوویەوە لەڕووی تەندروستی و دەروونی و مادیەوە..

وە ئێستا، دوای دووساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا.. دڵنیاییم ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکات کە ئەگەر قورئانی پیرۆز نەبوایە هەرگیز رزگارم نەدەبوو لەو خووە پیسە.. داواکارم خوای گەورە لێم ببورێت.. ئەو نەریت و خوەی کە ئێستە بەلامەوە بریتیە لە بەکەم تەماشاکردن و بەکەم سەیرکردنی هەموو ئەو ساتانەی کە لەگەڵیدا بردوومەتە سەر.. زیانی گەیاندبوو بەتەندروستی خۆم و خۆشەویستانم و ئاستی ژیانم و توانام بۆ پەرستنی پەروەردگار، خوای گەورە لەمن و ئێوەش خۆش بێت.. ئەو پەروەردگارەی کە لێبوردەو بەسۆزە.

من ئەم بەسەرهاتەتان بەئومێدی ئەوە بۆ دەگێڕمەوە کە ببێتە دەروازەی ڕزگاربوون بۆ کەسانی تر ئەویش بەڕوکردنە قورئانی پیرۆز بۆ شیفا بەخشین پێی لەهەموو جۆرە ناتەواویەك.. وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على محمد سيد الأولين والآخرين وآله ومن والاه بأحسان إلى يوم الدين.

## ٣٣- «بـێـئـاگـا»

لەوانەیە چیرۆکەکەم ئاسایی بێت و ڕۆژانە دووبارە ببێتەوە، بەڵام پێم وایە لەهەموو چیرۆکێك پەند وەردەگیرێت، لەبەر ئەوە ئەو ڕووداوەی کە ڕوویداوە بەسەرمدا بۆتان دەنووسم..

من کچە گەنجێکی تەمەن (٣٠)ساڵم، لەناو خێزانێکی پابەند بە ئیسلامەوە گەورە بووم، لەئامێزی باوك و دایکێکی نوێژگەردا کە بەجوانترین شێوە هەڵدەستان بە ئەنجامدانی ئەرکە ئاینییەکانیان..

سەیرنەبوو کەلەتەمەنێکی منداڵیدا نوێژ بکەم و ڕۆژوو بگرم، سوپاس بۆخوا هەر لەتەمەنی دە ساڵیەوە دەستم کرد بە نوێژکردن بەهۆی هاندانی خێزانەکەمەوە بەڵام لەگەڵ تێپەڕاندنی ڕۆژان و ساڵاندا پەرستش وەك خوویەکی لێ هاتبوو لەلام، هەستم بە ملکەچی نەدەکرد، نوێژەکانم بەخێرایی دەکرد بەبێ نوێژی سوننەت، بەڵام سوپاس بۆخوا ساڵان تێپەڕین وازم لە نوێژکردن نەهێنا.. هەستم بەتەنگەتاوی دەکرد لە ژیانمداو نەبوونی حەوانەوەی دەروونی، حەزم نەدەکرد بچمە دەرەوە بۆ شوێنە گشتیەکان، کاتێکیش دەچوومە دەرەوە هەستم بەو تەنگە تاویە دەکرد کەسەردڵی گرتبووم و نەشمدەزانی چۆن تەفسیری بکەم! ئەم حاڵەتەم ساڵ بەساڵ لەگەڵ تەمەنمدا زیادی دەکرد، تا گەشتمە تەمەنی (١٧) ساڵی، خوای گەورە حەجی کرد بە نسیبم، هەستێکی ئەوەندە جوان بوو پێشتر هەستم پێ نەدەکرد، شایانی باسە کە چەندین جار بۆ (عەمرە) بەجێهێنان ڕۆشتووم پێش (حەج) کردن، بەڵام دوای ئەنجامدانی (حەج) هەستێکم لا دروست بوو بوو بەرامبەر کەمتەرخەمیم لە ئاست پەروەردگاردا... حەزم لە ئەنجامدانی هیچ کارێك نەبوو، بیرم لە باڵاپۆشی دەکردەوە ..بەڵام شەیتان لەمن بەهێزتر بوو ..ساڵان تێپەڕین و ئەو هەستکردنە کەمی دەکرد و زیادیی دەکرد بەپێی ڕووداوەکان، بەو مانایەی لەڕەمەزاندا دەگەشتە لوتکەو هەروەها کاتێکیش کە دەچووم بۆ عەمرە کردن، خۆم لە خۆمم دەپرسیەوە لەسەر ئەو هەموو کەمتەرخەمیە.. بەڵام بێ سود بوو..تا خوای گەورە لەڕەمەزانی ڕابردوودا بۆی ڕەخساندم کە بەرنامەی مامۆستا عەمر خالید ببینم، کەکاریگەریەکی ڕاستەوخۆی هەبوو لەسەرم بۆ لێپرسینەوەی دەروونم لەسەر ئەو هەمو کەمتەرخەمی و بێ ئاگاییە،

کاتیێ عەمر خالد لە زنجیرەیەکیاندا ووتی: کچ سالأنێکی زۆری پیێ دەچێت تا بڕیار لەسەر بالأ پۆشی دەدات، دامە پرمەی گریان، وەڵلأهی ڕاست دەکەیت.. بڕیاردانم لەسەر ئەوە (١٣) سالّی خایاند لەو ڕۆژەوەی کە حەجم کرد.. ئیتر لەو ڕۆژەوە پەیمانم دا بە خۆم کە هەنگاو هەڵبێنم و ڕۆژی بالأپۆشیم دیاریبکەم.. بڕیارمدا دوای چوونم بۆ عەمرە بێت لەگەڵ براکەمدا، ئەوەش لەکانوونی دووەمی ئەمساڵدا واتە پێش کاتی حەج کردن..

خوای گەورە عەمرەی کرد بە نسیبم و نیەتی بالأپۆشیم هێناو لەپەروەردگار پارامەوە جێگیرو چەسپاوم بکات لەسەر ئەو بڕیارەی کە داومە، خوای گەورە پشت و پەنام بوو ..موجاهەدەی دەروونم و شەیتانم کرد، کاتیێ بە فڕۆکە دەگەڕاینەوە بۆ وولأتی خۆمان بڕیاردانەکەم گێڕایەوە بۆ براکەم، ئەویش لەخۆشیاندا سەری ماچ کردم، وە ووتی: لە زووەوە چاوەڕوانی ئەوەت لیێ دەکەم، وە سوپاس بۆخوا، ئایا هەواڵت داوەبە دایکم و باوکم؟ پێم ووت: نەخێر، پێویستم بەوە هەیە خۆم بڕیار لەسەر ئەوە بدەم.. ووتی: واگومان دەبەم خۆشترین مژدە بێت بۆیان... بەڵیێ هەروابوو.. باوکم زۆردڵشادبوو بەو بڕیارە تائەو ڕادەیەی باوکم قەسەیکی کرد کە هەرگیز لەبیرم ناچێت ووتی:((بەڕاستی ئەمە جوانترین دیاری بوو کەلەماڵی خواوە – بیت الله– هێناتەوە بۆمن)) لەوکاتەدا هەستم بەوە دەکرد کە هەموو دنیا هی منە... من ئابەوساتە خۆمم دۆزیەوە و هۆکاری ئەو تەنگەتاویەی خۆمم بۆ دەرکەوت کە زۆربەی تەمەنی هەرزەکاریی داگیرکردبووم، ئەوەش بریتی بوو لەبیێ ئاگایی و دووریی لەخوای گەورەوە، ناتوانم وەسفی ئەو هەستە بکەم دوای پۆشینی حیجاب کەدەچوومە دەرەوە... بۆهەموو شوێنێك دەچووم، کەیف خۆشی و شادومانی دایگرتبووم... وورده وورده هەستم بەتام و چێژی نزیك بوونەوە لە خوا دەکرد، وە زیاتریش لەوە هەرکەسێك دوای بالأپۆشینم بیبینیمایە دەیوت (لەڕوخسارتا نورو ڕوناکی دەبینم دەگەشێتەوە) ئەوەش لە ڕەحمەتی خواوە بوو بۆ من و ڕازیی بوونی لیێم ..من هەمیشە لەخوا دەپارامەوە کە شێوازم بەم بالأپۆشیە شیرین بێت و هاندەربێت بۆ خەڵکی کە ئەو هەنگاوە بنێن کە بۆ من (١٣) سالّی پیێ چوو، خوشکانی بەڕێزم تکاتان لیێ دەکەم بڕیاری بالأپۆشین دوامەخەن ئەو نارەحەتیەی کە تیایدا

دەبینن هیچ نیە تەنها وەسوەسەی شەیتان نەبێت، ئەگەر توانیتان ئەو وەسوەسەیە تێبپەڕێنن ئەوە هەرگیز پەشیمان نابنەوەو هەست بەو حەوانەوەیە دەکەن کە ژیانتان لێی بێبەش بووە.. لەکۆتاییدا ووتەیەکم هەیە: ئایا خوای گەورە شایستەی ئەوە نیە ڕەزامەندی بکەیت بەپارچە قوماشێك سەرتی پێ داپۆشی؟؟ داواتان لێ دەکەم دووعا بکەن.. بێگومان خوای گەورە ئێوەی لەبیر نەکردووە وە ڕێنومایتان دەکات بۆ بالاپۆشی.. وە خوازیارم ئەو بڕیارەتان سیانزە ساڵ نەخایەنێت!!

## ٣٤- ﴿قەدەری خوا﴾

بە سەرهاتی من درێژەو کۆتاییەکەشی ناخۆشەو خەفەتبارە بە هۆی ئەو نەهامەتیەوە کە توشمان هات..ئێمە سێ خوشك و برایەك بووین، من و خوشکێکم و براکەم نوێژمان نەدەکرد، بەردەوام گوێمان لە گۆرانی و کۆنسێرتەکان دەگرت و تەماشای فیلمەکانمان دەکرد وە دەچوین بۆ بازاڕو زۆربەی ڕۆژمان لە دەرەوە دەبردە سەر.. کاتێکیش دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە تەماشای کەناڵە ئاسمانیەکانمان دەکرد، ئەگەر هیچمان تیادا شك نەبردایە، ئەوە تەماشای ڤیدیۆمان دەکرد...ئەگەر ئەویش شتی تازەی تێدا نەبوایە، ئەوە تەماشای گۆڤارمان دەکرد، ئەوی تریش خواردن و خواردنەوەو نوستن بوو، وەکو دووری خۆر هەڵات لە خۆر ئاوابوو دوور بووین لە ئاینداریەوە، نەماندەزانی کەی نوێژ دەکرێ و لە چ کاتێکدایە...هەموو ئەمانە هیچ حسابێکمان بۆ نەدەکرد..ڕابواردن و هەوس بازیی لە پێشینەی کارەکانماندا بوو...لەهاوینیشدا گەشتی دوورمان ئەنجام دەدا تاوەکو ئەو چالاکیەمان بێنینەوە کەلەکاتی خوێندندا لە دەستمان دابوو...باوکم لەکۆمپانیاو کۆکردنەوەی ماڵ و سەفەرکردن بە مەبەستی کار سەرقاڵ بوو...ئەو و دایکم ، زۆربەی کاتمان ئێمە دوور بووین لێیانەوە...ئەوان لەغەمی خۆیاندا بوون، ئێمەش هەروەها هیچ چاودێریەکمان بەسەرەوە نەبوو، کەس نەبوو بڵێ نوێژ بکە یان یادی پەروەردگارت بکە...کێ ئەوەت پێت بڵێ؟ ئەو کارەکەرەی کە حاڵی لە ئێمە خراپتر بوو... بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، لە ماڵماندا کەسێك هەبوو کە یادی خوا بکاتەوەو بیپەرستێت، ئەویش خوشکە گەورەکەم بوو..هەموو ژیانی هۆگر بوون بوو بە پەروەردگاریەوە..بە تەواوەتی پێچەوانەی ئێمە بوو، هەمیشە خۆی لە جێگەی دایك دادەنا و بە ئێمەو براکەمانی دەوت. نوێژ بکەن...بەڵام ئێمە گوێمان بۆ نەدەگرت و پێچمان لێ دەداو پێمان دەوت: تۆ هەقت بەکاری ئێمەوە نیە...تۆ بۆ خۆت لەگەڵ خوای خۆتا بە، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو خۆشیەی ژیاندا ماتی و پەژارەیی زاڵ بوو بوو بەسەرماندا...نەماندەزانی بۆچی....بێئاگا بووین لەوە، لەو بڕوایەدا بووین ئەگەر کاتمان بە شەونخونی و ئاهەنگەکانەوە بەرینە سەر ئەوە بەختیارو ئاسودە دەبین...بەڵام ئەو بۆچونەی ئێمە هەڵەیەکی زۆر گەورە بوو...هەموو ڕۆژێ هەمان

شتمان دووباره دەکردەوە..بێزار بوو بووین لە ژیانمان..بەڵام هەر بەردەوام بووین و زیاتر دوور دەکەوتینەوە لە خوا..هەرچەندە خوشکەکەمان بەیادی دەهێنایینەوە...بەڕاستی خوشکێکی نموونەیی بوو...زۆر کات نوێژی دەکردو بەڕۆژو دەبوو...وە خێری لەو بەشە پارەیە دەکرد کە باوکم بە هەمووماني دەدا...ئەو پۆشاکانەی ئێمە لە دەرەوەی ولات بۆمان دەهێنا دەیدا بە هەژاران و لێقەوماوان و باکی نەبوو...تەماعی بەو بەشە هەبوو کەلای خوا پارێزراوە..ڕۆژێکیان ئێمە ویستمان بچین بۆ ماڵی پورم و ئەویش هات لەگەڵماندا ئێمە هەر سێ خوشکە سواری ئۆتۆمبێل بووین، براکەشم شریتێکی گۆرانی خستە سەر..ئێمەش لەگەڵیدا گۆرانیمان دەوت...ئەویش بە براکەمی دەوت..ئەو شەیتانە خامۆشکە، بێدەنگی کە...بەڵام براکەم بە گوێی نەکرد ئێمەش بە گوێمان نەکرد.. بە توندی ڕەتی قسەکانیمان دایەوەو هیچ وەڵامێکمان نەدایەوە...ئەویش داوای لە براکەم کرد خێراییەکەی کەم بکاتەوە.. بەڵام ئێمە ڕازی نەبووین بە داواکاریەکەی...لە پڕ توشی ڕووداوێکی ترسناك بووین... ئۆتۆمبێلەکەمان چەند جارێ تەقلەی دا دوای ئەوەی کە خۆمان کێشا بە بەربەستێکی ئاسنیندا، ئۆتۆمبێلەکە تێکشکا...دوای هەوڵدانێکی زۆر ئێمەیان لەناو ئۆتۆمبێلەکەدا دەرهێناو زۆر بە پەلە گەیاندینیانە نەخۆشخانە، لە ڕاستیدا ڕووداوەکە زۆر ترسناك بوو، تووشی شکان و تێکترانجان و ڕوشانی مێشك بووین، بەڵام کاتێ پرسیارمانکرد دەربارەی خوشکەکەمان دوای ئەوەی بەهۆش خۆماندا هاتینەوە لەسەرەتادا پێیان ووتین: ئەو حاڵی باشە....بەڵام لە ژووری (بوژانەوە)بوو، چونکە حاڵەتەکەی سەخت بوو، دوای بیست و چوار کاتژمێر باوکم و دایکم هاتن بۆ لامان، دوای ئەوەی لەسەفەر هاتبوونەوە، کاتێ گەشتنە لامان پرسیاریان لە پزیشکەکە کرد دەربارەی خوشکەکەم...ئەویش هەواڵی پێدان کە خوشکەکەم گیانی سپاردووە...کاتێ ئەو هەواڵەمان بیست نەمانتوانی دان بە خۆماندا بگرین...بە کوڵ دەستمان کرد بە گریان و هاوار بەسەریدا...هەستمانکرد کە هەمووومان هۆکار بووین لە مردنیدا...ماوەیەکی زۆر لە نەخۆشخانەماینەوە...بەهۆی خەفەتباریم بۆی وازم لە خواردن و خواردنەوە هێنا بوو...لە ڕووی دەروونیەوە نەخۆش کەوتم..پزیشکەکان و باوکم و دایکم هەوڵیان دەدا بۆ چارەسەری من...دوای

نارەحەتیەکی زۆر من و خوشکەکەم و براکەم داوای لێخۆش بوونمان لەخوا کرد لەوەی کەبەسەر خۆماندا هێنابوو...تەوبەیەکی ڕاستەقینەمان کرد...خوای گەورەش ڕێنمایی کردین بۆ ڕێگای ڕاست و ڕۆشنایی کە پێشتر وونمان کردبوو.....ئەم وانەیە بۆ ئێمە زۆر سەخت بوو چونکە خوشکەکەمان بویە قوربانی، کە تەمەنی بیست و یەك ساڵی تێنەپەراندبوو، سوپاس بۆ خوا لە ڕەمەزاندا هەموومان چوین بۆ (عەمرە)باوکیشم حەجی کرد، ئێستا ئێمە زۆر بەختەوەرین بە بوونمان لەگەڵ پەروەردگاردا، دەستمانکرد بە کاری خەیرو چاکەو ئامادە بوون لە کۆڕە زانستیەکانداو بانگەواز کردن لە پێناوی خوادا...ئەوانەی کە دوورن لە خواوە بەڵکو خوای گەورە ڕێنوماییان بکات، وەك چۆن ڕێنومایی ئێمەی کرد بۆ پەرستنی، بەلاَم دایك و باوکم زۆربەی کاتیان لەگەڵ ئێمەدا بەسەر دەبرد دوای ئەوەی کەزانیان ماڵ و سەروەت و سامان هەموو شتێ نیە لەم ژیانەدا، بەڵکو پەرستنی خوای گەورە بەڕاستەقینەیی و پشت بەستن پێی هەموو شتێکە چونکە تەنها ئەو ڕۆژیدەرەو بە توانایە بەسەر هەموو شتەکاندا...دەخوازم لە خوای مەزن و پەروەردگار ڕێنومایمان بکات بۆ پەرستنی و ئەنجامدانی کردەوەکانمان بەپێی بەرنامەکەی و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ).

# ٣٥- ﴿ئافرەتێکی ئەمریکی﴾

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته، وأصلي على نبي هذه الأمة عليه الصلاة و السلام.

من ئافرەتێکی ئەمریکیم و ناوم ڤالانتینایە، لەویٚ لەدایك بووم و گەورە بووم، ئەو ئەمریکایەی کە جێگای هەموو ئاینەکانە وولاتی منە، وە من موسڵمان نەبووم و ڕۆژێك لە ڕۆژانیش پابەند نەبووم پێیەوە چونکە باوکم و دایکم زۆر بە توندی نەیاری ئەم ئاینەن، وە سەرسام نین پێی و نیازیان نیە ئەو ئاینەی خۆیان بگۆڕن، باوکم خاوەنی چەندین کۆمپانیای گەورەیە لەولاتی جیا جیا، دایکیشم هاوکاری باوکمی دەکرد لە کارەکەیدا، ڕاوێژ کارە ئابوریەکەی بە باوکمی ووتبوو کە چەند بەشێك لە خۆرهەلاتی ناوەڕاست بکاتەوە چونکە ناوچەیەکی باشە هەروەها ئایندەیەکی باشیشی هەیە، دوای چەندین هەوڵ و ڕاوێژ کرن باوکم ڕازی بوو... باوکم زۆر سەرسام بوو بەگەشتەکەی ..منیشی لەگەڵدا بوو، نزیکەی مانگ و نیوێك ماینەوە....ئاشنایەتیمان لەگەڵ هەندیٚ عەرەبدا پەیدا کرد....من سەرسام بوو بووم بەڕاستگۆییان و باش مامەڵە کردنیان و ڕەوشت جوانیان، بەهەمان زمانی من لەگەڵمدا دەدوان بەلام من بۆ ڕێز دانان بۆ ئەوان بە باوکم ووت: دەمەویٚ فێری زمانەکەی خۆیانم بکەن تا نزیك ببمەوە لەوەی کە دەیڵێن...وورده ورده فێری زمانی عەرەبی بووم.. وە هەستم کرد کە زۆر لە زمانەکەی من خۆشترە، وە ڕاستگۆیانە هاوڕێیەتیم لەگەڵدا پەیدا کردن ..ئێستەش کاتی ئەوە هاتووە کە ئەو وولاتە جیٚ بهێڵین کە زۆر بە جوانی میوانداریان کردین، یەکیٚ لە هاوڕیٚ کچەکان دیاریەکی پێشکەش کردم، و داوای لێکردم کە نەیکەمەوە تا ئەم وولاتە بەجیٚ نەهێڵم، منیش ڕەزامەندیم نیشاندا....گەشتینەوە وولاتەکەی خۆمان وە ئەو دیاریانەم نەکردەوە کە کەسانی تر پێیان بەخشی بووم تا یادیان بکەمەوە، وەدوای دوو ڕۆژ چووم بۆ لای چەند کەسێکی عەرەب بۆ ڕاهاتن لەسەر ئەم زمانە نوێیەو پەیبردن بە نهێنیەکانی، بەو شێوە زۆر بە خێرایی فێری ئەو زمانە نویٚ یە بووم و چومە پەیمانگایەك بۆ فێر بوونی خوێندنەوەو نوسینی زمانی عەرەبی، وە هەر کەفێری شتێك دەبووم داوای زیاترم دەکرد، لەم ناوەدا هەمووی تەنها ئەودیاریەم هاتەوەیاد کە ئەو کچە پێشکەشی کردبووم چومەوە بۆ ماڵەوە دەگەڕام بەدوایدا، بینیمەوەو کردمەوە تەماشامکرد

کتێبێکە دەربارەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ دەستم کرد بە خوێندنەوە...سوێند بە خوا دەستم کرد بەگریان کاتێك کە ناسیم و ئاشنا بووم بەجوان مامەڵە کردنی لەگەڵ خەڵکی ئیتر.. ئەو کەسە موسڵمان بێت یان ناموسڵمان نەبێت.. وە زۆر سەرسام بووم بەو خۆشەویستیەی بۆ خێزانی و چۆن خۆشی دەویست و ژنی نەدەهێنا بەسەریدا، ئەو کاتە نەبێت کە خەدیجە وەفاتی کرد وە هەروەها سەرسام بووم بە خێزانیشی کە هاودەم و یارمەتیدەرێکی باشی بوو... شان بەشانی وەستا بوو ،تاوەفاتی کرد...بڕوام بەو ئاسکی و سۆزداریە نەدەکرد...هەر کە ڕۆژ بوویەوە چووم بۆ یەکێ لە سەنتەرە ئیسلامیەکان داوای شارەزایی زیاترم کرد دەربارەی ژیاننامەی ئەو پێغەمبەرە...زۆر بەجوانی مامەڵەیان لەگەڵدا کردم و پێشوازیان لێکردم، دوای چەند ڕۆژێکی کەم گەڕامەوە بۆسەنتەرەکە...پرسیارم لەو کەسانە کرد کە لەوێ بوون: من چی بکەم بۆ ئەوەی موسڵمان ببم؟ ووتیان یەکەم جار پێویستە شایەتومان بێنیت (واتە بەدڵ بڕوا بێنیت کە هیچ خوایەك نیە بێجگە لە (الله)وە محمدیش پێغەمبەری خوایە) پاشان خۆت بشۆیت و خۆت پاك بکەیتەوەو فێری دەست نوێژو نوێژ کردنت بکەین...هیچ کەمتەرخەم نەبووم بەرامبەر بەو شتانە...ئیسلامبوونی خۆم ڕاگەیاند و فێری دەست نوێژو نوێژ کردن بووم...بەهۆی خۆش ویستنی زۆرم بۆ ئەو پێغەمبەرە ﷺ هەمان ڕۆژ دەستم کرد بە نوێژ کردن، من لەو پەڕی بەختەوەریدا بووم کە پێشتر هەرگیز تامی ئەو بەختەوەریەم نەکردبوو، وە هیچ هەواڵێکم بەدایکم و باوکم نەگەیاند، چونکە ئەوە مافی خۆمە، بەلاّم لەو ڕوانگەیەوە کە من خوازیاری ئەوەم ئەوانیش ئەو ساتە جوانانە بەسەر بەرن کەمن تێیدا دەژیم ...دوای بیر کردنەوەیەکی درێژ خایەن هەواڵم پێدان...زۆر بەتوندی بەرپەرچیان دامەوە، هەوڵیاندا ڕازیم بکەن کە بگەڕێمەوە سەر ئاینی باو باپیرانم...پێم ووتن فێری ئاینێکم بکەن کە ئەو هەموو مانا ناسك و جوانانەی هەڵگرتبێ، ووت وێژی زۆرم کرد لەگەڵیاندا....بەلاّم نەیانتوانی هەڵمبگێڕنەوە لەو شتەی کە خۆم بڕوام پێی هەیە...لەکۆتاییدا سەرکەوتم بەسەریاناو ووتیان: تۆ ئازادیت و ئەوە پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە....بە خێرایی چووم بۆ بازاڕ تا گەشتەکەی خۆم تەواو بکەم کە دەستم پێکردبوون ئەویش بالاّپۆشین بوو.... بالاّم پۆشی و زۆر دڵشاد بووم پێی، چونکە هەستم دەکرد کە من

مرۆڤێکی داوێن پاکم...ئەوەیە کە چەندین ساڵە من پێویستیم پێیەتی و سوپاس بۆ خوا دۆزیمەوە پێش ئەوەی کات بەسەر بچێت...بەڵام لەو پەڕی ماتەمی و پێ ناخۆش بوندا کاتێ هەندێ لە موسڵمانان دەبینم ئاینەکەیان ڕەت دەکەنەوەو شەرم دەکەن لێی، نازانم بۆچی؟؟ لەکاتێکدا جولەکەو مەسیحیەکان شەرم لە ئاینەکەیان ناکەن کاتێکیش دەزانن هەڵەیە، ئیتر بۆچی تۆ شەرم دەکەیت لەکاتێکدا کە لەسەر هەقیت، وە زۆرێك لە خەڵکی پۆشاکی شەرعی ناپۆشن چونکە شەرم دەکەن....باشە بۆچی؟؟

باڵاپۆشی و دینداری کەسایەتی مرۆڤ بەرز دەکاتەوەو خەڵکی بەڕێز و شانازیەوە تەماشات دەکەن کاتێ دەتبینێ ئێرەیی بە پۆشاکەکەت دەبات و دەخوازن کە ئەوانیش وەك تۆ وابن...من تکات لێ دەکەم کە ئەو پۆشاکە بپۆشە چونکە ڕازاوەترین شتە....شوێن خەڵکی ڕۆژئاوا مەکەوە ،ئەوان دەیانەوێ ژیانت داڕوخاو بکەن و بە فیکرەی ژەهراویی داتبڕوخێنن ئامانجی ڕۆژئاوا ئەمەیە، دەیانەوێ هەمیشە بەدوای مۆدێلا ڕابکەیت..هەموو ئەمانە جەنگن تاوەکو دورت بخەنەوە لە ئاینە مەزنەکەت...ڕێگەیان پێ مەدە بەو جۆرە شتانە...بگەڕێنەوە بۆ ئاینەکەتان...سوێند بە خوا ئێوە بەهێزترن...کە ئێوە لەگەڵ خوای گەورەدان هەزارو یەك حسابتان بۆ دەکات..ئەمەیە ئەوان دەترسێنێ..هەڵمەخەڵەتێن .. ئەوشارستانیەتە درۆینەیەو پڕیەتی لەکاری حەرام و پیس....دەبێ ئەوە بزانن کە ئەو کۆمەڵگایە دوچاری داڕوخان و نەریتی شازو نەخۆشی دەروونی بووە، چونکە گەیشتوون بە هەموو شتێك تەنها گرنگترین شت نەبێت کە ئەویش ڕۆحێکی ئارام و دڵنیایە لە بەرئەوە دەبینیت پڕە لەکاری تاوانکاری و خۆکوشتن...ئەمە پەیامێکە و ئاڕاستەی هەموو موسڵمانێکی دەکەم کە خەمخۆری ئاینەکەیەتی...تا بگەڕێتەوە بۆلای خواو پابەند بێت بە فەرمانەکانی و دوورکەوێتەوە لە خراپەکاری ..تاوەکو خوای لێ ڕازی بێت و بەختەوەر بێت...دەخوازم لە خوا کە چەسپاوتان بکات لەسەر ئاینە گەشاوە مەزنەکەتان کە هیچ ناتەواوی و عەیبێکی تێدا نیە چونکە پڕیەتی لە ڕەحمەت و دادپەروەردی کە ئاینەکانی تر بێبەشن لەمە، وەمن داواتان لێ دەکەم براو خوشکانم کە بگەڕێنەوە بۆلای ئاینەکەتان و بێگومان ئەو کاتەش هەست بە بەختەوەری و سەر فرازای دەکەن...

بەو بۆنەیەوە ناوێکی جوانم بۆ خۆم هەڵبژارد ئەویش (خدیجە)بوو ناوی خێزانی پێغەمبەر ﷺ داوا کارم لە خوای گەورە لێم وەربگرێت وە شایانی ئەو ناوە بم و شوێن پێی ئەو خاتونە هەڵبگرم ...وە داواکارم لە خوای گەورە ڕەزامەندبێت لێم و لەمن و لەهەموو برا و خوشکە موسڵمانەکان....تەنها ئەو نزیك و وەلامدەرەوەیە..لەکۆتاییدا خوا حافیزیتان لێ دەکەم..والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاتە.. خوای گەورە پاداشتی خێرتان بداتەوە بۆ ئەو سایتە کە پێش ماوەیەك ئاشنا بووم پێی لە خوشکێکی موسڵمانەوە و لێرەوە لە نیشتمانەکەم..دەخوازم لەخوای گەورە کۆمەکتان بێت بۆ ئەنجامدانی کردەوەی چاك و تێکۆشان لە پێناوی خوادا...داوای لێبوردن دەکەم...کاتی زۆرم گرتن....تەنها لەبەر خۆش ویستنمە بۆتان لە پێناوی خوای گەورەدا..

## ٣٦- ﴿گۆڕانکاریی﴾

لەوانەیە ناونیشانەکە ئاماژە بێت بۆ شێوازی ژیانی من، من بەبێ ئامانج و بەبێ دڵ ژیانم دەبردە سەر کە بەدەربوو لە هەموو مانایەك، یان هەموو ڕواڵەتێکی ئیسلامی، من هەوڵم دەدا بڕوا بە خۆم بکەم کە ژیانی من سوودی هەیە، بەڵام دیار بوو درۆیەکی شاخدارم دەکرد، بەشێوەیەك وام لێهاتبوو درۆم دروست دەکردو خۆیشم وا دەبینیەوە کە بڕوام پێی هەیە...ئای چەندە بێ عەقڵ و لەخۆ بایی بووم، من بەهێز بووم بەڵام لاوازیی زاڵ بوو بوو بەسەرمدا...هەموو شتێ زاڵ بوو بوو بەسەرمدا، من لەو جۆرە کەسانە بووم، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا یەك ڕاستەقینە هەبوو لە ژیانمدا، زۆر جار دەستم دەکرد بە گریان، دەمزانی کە تاوانبارم، بەڵام تەوبەم نەدەکردو هەرگیز پابەند نەدەبوو بە تەوبەکەوە...ئەوانەی هاوڕێم بوون.....دەترسام لەدەستیان بدەم بۆیە خوای گەورەم لە دەستدا...ئای چۆن هەڵبژاردنێکە، هاوڕێکانم هەڵدەبژارد و پشتم دەکردە خوای میهرەبان کە پەروەردگارمە...هەرچەندە من لەماڵێکدا پەروەردە بوو بووم کە زۆر دیندار بوون بەهەموو مانایەك، هەر لە باڵا پۆشیەوە بە نیسبەت خوشکەکانمەوە...هەتتا لە بۆنە ئیسلامیەکاندا شەویان زیندوو دەکردەوە، بەڵام من سەرسەخت بووم، هەوڵیان دەدا ڕێکم بکەنەوە، کەچی سەر سەخت بووم لەگەڵیان ..چونکە شێوازەکەیان بە شێوەیەکی زۆرکاریی بوو...زۆرکاریش تاکە شتێك بوو کە نەیدەتوانی زاڵ ببێت بەسەرمدا.. بەڵام تەوبە کردنی من چۆن چۆنی بوو....فەرموون ئێوەو سەر گوزشتە سەیرەکەی من.....پێم ووتن کە خێزانەکەمان دیندار بوون...خوشکێکم هەبوو پیشەکەی پزیشك بوو شوی بە ئەندازیارێکی ئایندار کردبوو وەکو خۆمان، خێزانەکەی ئەویش، برایەکی گەورەیان هەبوو کە پزیشکی هەناو بوو....تەمەنی (٣٦)ساڵ بوو، ڕوخساری هەر لە فریشتەی دەکرد، ڕوخسارێکی سپی درێژ ناوچاوێکی پان وەکو فریشتە،خەندەیەکی ناسك کە لە ڕوخساری دانەدەبڕا....هەنگاوی جێگیرو کردەوەی چاك ، ماوەی دوانزە ساڵ بوو نەیهێشتبوو یەك نوێژی بەیانی بفەوتێت لەمزگەوتا.. کەسێك نەمابوو لە بێوەژن و هەتیوو هەژارو کەم دەست و سواڵکەرو گەورەو بچوك کە ئەم نەناسن...هەتا ڕۆژێکیان من لەزیندەخەودا بووم لەسەر نوێنەکەم لەکاتی عەسردا لەمانگی ئابی (٢٠٠١)گوێم لە

کەسێکەوە بوو کە هاواریکرد دکتۆر فلانی کوڕی فلان کۆچی دوایی کرد....بە خۆم ووت: کەواتە درۆیە...ئەمە خەوە....بەڵکو کابوسەو هیچ مانایەکی نیە، دوای کەمێك هەستامەوە لەژوورەکەداو زۆر لەوە دڵنیا بووم کە ئەوەی بیستم خەون بوو....پاش چەند ساتێکی کەم تەقە لە دەرگا درا هەستم بە دڵە ڕاوکێ کرد...براکەم خۆی کرد بەژووورداو ماتەمینی ڕوخساری داگیر کردبوو...لەوکاتەدا هەستم کرد کە ئەوەی بیستم خەون نەبوو.. نەمتوانی لە جێگای خۆم هەستمەوە یان ببزوێم، لێم پرسی چۆن ئەوە ڕوویدا...ووتی: ئەو گەشتێکی کرد بۆ قاهیرە ترسی هەبوو کە بە ئۆتۆمبێلەکەی خۆی بڕوات چونکە تازە فێری شۆفێری بوو بوو، دەترسا توشی کارەساتێك ببێت..مایکرۆ پاسەکە خۆی کێشا بوو بە ئۆتۆمبێلێکی گواستنەوەدا کە بێ موبالات لە قەراغی ڕێگاکەدا وەستا بوو.. لە (بنها)ئەوو چوار کەسی تر لەو ڕووداوەدا وەفاتیان کرد...جەنازەکەی ڕێکخرابوو لەسەر نەریتی ئیسلامی..هەموو کەس دڵگران بوو بۆی و دوعای خێریان بۆ دەکرد، ئێمە لە ڕۆیشتنماندا بۆ گۆڕستان ئاگامان لەوە بوو کە بەگریانەوە جەنازەکە بەڕێدەکرا...لەسەر گۆڕەکەی وەستام و تەماشام دەکردو دەم ووت: خوایە گیان ئایا مرد؟ ناگەڕێتەوەو خەندەمان ئاڕاستە ناکات؟ دەستم کرد بە گریان...زیاتریش لەوە تا ئەوکاتەی کە مرد قورئانی دەخوێند..عادەتی وابوو ئەگەر سواری مایکرۆپاس ببوایە وای لە شۆفێرەکە ئەکرد شریتی قورئان بخاتەسەر لەجیاتی شریتی گۆرانی (سوپەرجێت)یان شتە بێ بەهاکان....لەسەر زاری یەکێ لە ڕزگار بوانی ئەو ڕووداوە کە ئافرەت بوو. ووتی:لاوێکی ئاکار جوان کە قژی لەهەردوو لاوە مووی سپی تێکەوتبوو کە زیاتر ڕێزو ویقاری پێدەبەخشی بەخەندەوە چاوی خۆی لەگوناە دەپۆشی..کە سوار بووین شۆفێرەکە شریتێکی گۆرانی خستە سەر، ئەم لاوە نورانیەش پێی ووت :چۆنە شریتی قورئان بخەینە سەر...شۆفێرەکە پێی ووت: شریتی قورئانم پێ نیە...ئەویش ووتی: کەواتە خۆم کەمێك قورئان دەخوێنم...ئافرەتەکە ووتی: دەنگی زۆر خۆش بوو..بەردەوام بوو لە سەر قورئان خوێندن تا کاتی پێکدادانەکە، لە دواییدا بۆم ئاشکرا بوو کە وەفاتی کردووە..دەستم کرد بەگریان و دوعای خێرم بۆ

کرد...بڕیارمدا لەگەڵ ئەو هەموو ئازارو برینداریەمدا بچم بۆلای کەسوکاریان و سەرخۆشیان لێ بکەم و ئەو هەواڵەیان پێ بدەم..

سەرەی من هات تاله خۆم بپرسم چی بخوێنم لە قورئان ئەگەر ئەجەلم هات، بەچی بدوێم لەگەڵ پەروەردگارم؟ ئەو پیاوە کاتێ کچەکەی کە تەمەنی (١٢)ساڵان بوو لێی دەپرسی: باوکە گیان، داواکاری لە خوای گەورە چیت پێ بدات؟ لەوەڵامدا دەیوت: بەتەمەنێکی کەمەوە بمرم، کچەکەیشی دەیپرسی: بۆچی باوکە؟ دەیوت: تاوەکو گوناهەکانم کەم و بچوك بن!!

ژیانی لە بانگەوازدا بردەسەر، کاتێکیش مرد بانگەوازی دەکرد بۆ لای خوا بە ئامۆژگاریی جوان. دەیەویست بڕوات بۆ (پەیمانگای ناصر بۆدڵ)تا لەنزیکەوە چاودێری حاڵەتەکان بکات بە خۆڕایی و تەنها لە پێناوی خوادا. ئەو مردو ڕێنومایی منیشی کرد... نوێژ نەبوو دوعای خێری بۆ نەکەم بۆ خۆی و کەس و کاری...تاوەکو خەیرو پاداشتی بۆ بنوسرێت لەکردەوەکانم کە ئەو هۆکاربوو لە نوێژ کردنی من لە مزگەوتا....خەتمی قورئان دەکەم و ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ دەخوێنمەوەو ئەوەی دەیخوێنمەوە جێ بە جێی دەکەم، هەڵدەستم بۆ شەو نوێژو سیلەی ڕەحم بەجێ دێنم، لەگەڵ خواناساندا دادەنیشم و بانگەواز دەکەم بۆ لای خواو ئاواتە خوازم شەهید ببم لە پێناوی خوادا....تەماشای سەرەتای بەسەرهاتەکەی من بکەن....من پێشتر لە بوکە شوشەوە نزیك بووم، بەڵام ئێستە لەخواوە نزیکم..ئێستا خاوەنی کەسایەتی خۆمم و پابەندم و هەموو ڕۆژێك بەهێزتر دەبێم، وە فێری ئەوە بووم ئەگەر ئیماندار کارە چاکەکانی لە زیادبوندا نەبێت، بێگومان بەرەو کەمی دەڕوات.

خوازیارم لە خوای گەورە کەتوانیبێتم مەبەستی دڵی خۆم گەیاندبێت پێتان، و ئەمە بانگەوازێك بێت بۆلای خوا....شایانی باسە پەروەردگار بێئومێد نابێت لەبەندەکەی یان لە تەوبەکردنەکەی تا بەندەکەی خۆی بێئومێد نەبێت...دەی بێئومێد مەبن و مەهێڵن بێئومێدی جێگەی خۆی لە دڵتان بکاتەوە.

نوێژ کردن پەیوەندیە لە نێوان بەندەو پەروەردگاریدا...دەی هەرگیز پەیوەندیت بە پەروەدگارتەوە مەپچڕێنە..ئیستغفارو تەوبەی زۆر ئەنجام بدەن...چونکە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژێکدا زیاتر لە سەد جار داوای لێخۆش بوونی لەخوای گەورە دەکرد....وە

بزانن كه پەروەردگار هیچ گۆڕانكاریەك بەسەر هیچ كۆمەڵگایەكدا ناهێنێت ئەگەر ئەو كۆمەڵگایە خۆیان گۆڕانكاری نەهێنن بەسەر خۆیاندا..وە بزانن هۆگر بوون بە دنیاوەو ترسان لە مردن گەورەترین دەردو نەخۆشیە كە تووشی دڵ دەبێت...وە برا موجاهیدەكانتان لە بیرمەكەن لە هەموو شوێنێك و لە فەلەستین و... من دوعای خێرو سەركەوتنیان بۆ دەكەم چونكە خوای گەورە پەیمانی داوە كە زوڵم لێكراوان سەر دەخات و دەفەرموێ (وعزتي وجلالي لأنصرنك ولوبعد حين)سوێند بە عیزەت و جەلالی من سەرت دەخەم با پاش ماوەیەكی تریش بێت..وە بەرهەمەكانی جولەكەو ئەمریكا مەكڕن، و مەپرسن بۆچی نەیكڕین؟ بەڵكو بپرسن بۆچی بیكڕین؟ خوای گەورە پاداشتتان بداتەوەو ڕێنموونی من و ئێوەش بكات.

## ٣٧- ﴿ماڵ ئاوایی﴾

مـن موسـڵمانێکی سـاده بـووم چـاکەو خراپـەم هـەبوو، ماوەیـەك نوێـژم دەکـردو ماوەیـەکیش نەمـدەکرد، لەگـەڵ ئەوەشـدا سـور بـووم لەسـەر ئـەوەی منداڵـەکانم ڕابێن لەسەر نوێژ کردن...لەوانەیە بەهۆی ئەوەوە بوو بێت من بەمنـداڵی ڕانەهێنرابم لەسـەر نوێـژ کـردن، لەگـەڵ ئـەوەدا شـتی زۆرم دەربـارەی ئـەم ئاینـە خوێندبوویـەوە لـە هـەموو بوارەکانیـدا.. بـەڵام شـەیتان وازی نـەدەهێنام... ژیـانم بـەم شـێوەیە بـەردەوام بـوو تـا بەهۆی ڕووداوێکەوە ژیانم بـە تـەواوی گـۆڕانی بەسـەردا هـات... مـانگی ڕەمـەزان نزیـك بوویەوە، سور بووم لەسەر ئەوەی بە بـەردەوامی نوێـژەکانم بکـەم بۆیـە بـۆ مـاوەی دوو هەفتە بەبەردەوامی نوێژەکانم ئەنجام دەدا.. پاشـان خـوای گـەورە ڕاسـپاردەکەیخۆیی بردەوە و باوکم وەفاتی کرد.. ئەو ڕووداوە ژیانـی بەتـەواوی هـەژاند لەگـەڵ ئـەوەدا کـە باوکم (٧٧)ساڵی تێپەراند بوو بەڕەحمەت بێت نەخۆش بوو، بـەڵام ڕوداوی مردنەکـەی نـاخمی هەژانـدو شـتێکی چاوەڕوان نـەکراو بوو تـا ئێستەش سـەختی ئـەو ڕووداوەم پێوە دیارە...لەگەڵ ئەوەدا کە باوکم ڕەحمەتی خوای لێبێت سوپاس بۆ خوا حـەجی کـردووەو بـەردەوام بـوو لەسـەر نوێـژەکانی و سـوننەت و خوێنـدنی قورئـان...نـازانم بۆچی دوای ئەو گۆڕانم بەسەردا هات؟ ئایا لەبەر ئەوەیە کە نـەکات بە دیداری خـوای گەورەو کچێکی هەبێت نوێژ نەکات یان لەترسی ئەوەی کەمنیش دەگەم پێـی...لەگـەڵ ئەوەدا من لەسەرەتای وەفاتکردنەکەیدا ئاواتە خواز بووم لەگەڵ ئەودا بمردمایە.

لەوانەیە هۆکارەکە ئەوەبێ کە تابتوانم دوعای خێری بۆ بکەم و قورئانی بۆ بخوێنم و خەیرو پاداشتەکەی هەدیە بکەم بۆی.. ناتوانم هۆکارەکە دیاری بکەم...بەڵام سوپاس بۆخوا بۆ ئـەم حاڵەتـەی ئێستام..سوپاس بـۆ خـوا فـەرزەکان لـەکاتی خۆیـدا ئـەنجام دەدەم وە هـەروەها سـوونەتەکان و شـەو نوێـژو تەسـبیحات...خوایـە گیـان کـردەوە چاکەکانمان لێ وەربگرێت و چەسپاومان بکەیت لەسـەری..وەك چۆن مامۆستا عـەمر خالید یارمەتیـدەرم بوو بۆ ئـارامگرتن لەسەر وەفاتی بـاوکم لەیەکێك لـە زنجیرەکـانی شـەوانی ڕەمەزانـدا باسـی وەفـاتی منداڵـەکانی پێغەمبـەر ﷺی کـرد.. کوڕەکانی...هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ زۆری خۆش دەویستن...هەستم دەکرد مامۆستا عـەمر خالیـد قسە لەسـەر کارەسـاتەکەی مـن دەکـات...وە ئەمـە قەزاوقـەدەری خوایـەو

پێویستە بەسنگێکی فراوانەوە ڕازایی بین پێی و زۆر زۆر ماتەم نەبین لەسەری.. خوای گەورە پاداشتی بداتەوە.

## ٣٨- ﴿تۆوی خێر﴾

لە سەفەرێکی دوور دەگەڕامەوە...قەدەری خواو وابوو لەناو فڕۆکەکەدا کۆمەڵێ گەنجی هەرزە دەورەیان دابووم دەنگە دەنگ و هەراو پێکەنینیان لێ بەرز دەبوویەوە، ئەو ناوەیان پڕ کردبوو لە دوکەڵی جگەرەکانیان، حیکمەتی خوایش وابوو فڕۆکەکە پڕ بوو بوو لە نەفەرو نەمدەتوانی شوێنەکەی خۆم بگۆڕم..هەوڵمدا خۆم دەرباز بکەم لەوقەیرانە بۆیە پەنام بردە بەرئەوەی کە بخەوم، بەڵام..هاوار بە حاڵم....خەوی چی...کاتێ ئیتر زۆر بێتاقەت بووم لەو هەراو هوریایە...قورئانەکەمم کردەوەو بە دەنگێکی هێواش دەستم کرد بە قورئان خوێندن...چەند ساتێکی نەبرد زۆرێك لە لاوەکان هێور بوونەوەو هەندێکیان ڕۆژنامەیان دەگرت بەدەستەوەو دەیانخوێندەوە، وە هەندێکیشان خەو دەیبردنەوە...لە پڕ یەکێکیان کەلە تەنیشتمەوە بوو...بەدەنگێکی بەرز ووتی...بەسە، بەسە!! وا گومانم برد کە بەهۆی دەنگی منەوە بێزار بووە، بۆیە داوای لێبوردنم لێکرد، پاشان دەستم کردەوە بە خوێندنەوەی قورئان بە دەنگێکی زۆر هێواش کە تەنها خۆم دەمبیست، بینیم سەری خستوەتە ناو هەردوو دەستیەوە، پاشان لەدانیشتەکەیدا زۆر دەجوڵێت..پاشان سەری بەرز کردەوەو زۆر بە نارەتی پێ ی ووتم: تکایە بەسە...بەسە...ناتوانم ئارام بگرم!! پاشان لە شوێنی خۆی هەستاو، بۆ ماوەیەك لەبەرچاو ون بوو پاش کەمێك گەڕایەوە، داوای لێبوردنی لێکردم. من بێدەنگ بووم و نەمزانی چی ڕوویداوە! ... دوای کەمێك لە بێدەنگی لای کردبەلامداو چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك..بە چپە پێی ووتم: سێ ساڵ یان زیاتر ئەبێت تەوێڵم نەکێشاوە بەزەویدا و تەنها ئایەتێکیشم نەخوێندوەتەوە! ئەوە مانگێکی تەواوە لەم گەشتەمدا بەسەرم بردووە خراپە نەماوە تێی نەگەوزابم...پاشان تۆ دەبینم قورئان دەخوێنی..بۆیە دنیا لەبەرچاوم ڕەش بوو، سنگم هاتەوەیەك و هەستم بە هەناسە تنی کرد، بەڵێ..هەستم دەکرد کە هەر ئایەتێك دەیخوێنێت وەکو قەمچی دەکێشێت بەلاشەی مندا!! بۆیە بەخۆمم ووت: تاکەی ئەم بێ ئاگاییە؟! وەتاکەی بەم ڕێگایەدا بڕۆم؟! دوای ئەم هەموو بێ هودەیی و ڕابواردنە بەتەمای چیم؟ پاشان ڕۆیشتم بۆ تەوالێت، دەزانی بۆچی؟! هەستم دەکرد زۆر حەز دەکەم کە بگریم، وەشوێنێکیشم شك نەبرد خۆم لە چاوی خەڵکی بشارمەوە ئەوێ نەبێ!!

بۆیە منیش شتێکی گشتیم بۆ باسکرد لەسەر تەوبە و گەڕانەوە بۆلای خوا..پاشان بێدەنگ بوو.. کاتێ فڕۆکەکە لە فڕۆکەخانە نیشتەوە، وەستاندمی وەك ئەوەی کە بیەوێت لە هاوڕێکانی دوور کەوێتەوە، بە ڕوخسارێکی زۆر لێبڕاوانەوە لێی پرسیم: ئایا گومان دەبەیت کە خوای گەورە لێم خۆش ببێت؟ پێم ووت: ئەگەر تۆ ڕاستگۆبیت لەتەوبەکەتداو سور بیت لەسەر گەڕانەوەت ئەوە بێگومان خوای گەورە لەهەموو گوناهەکانت خۆش دەبێت وە ووتی: بەڵام تاوانی زۆر گەورەم کردووە....زۆر گەورە!! پێم ووت: ئایا گوێت لەم ئایەتە نەبووە (قل یا عبادی الذین أسرفوا علی انفسهم لاتقنطوا من رحمة الله، إن الله يَغفر الذنوب جميعاً، إنه هو الغفور الرحيم) (الزمر:٥٣) واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پێی یان بڵێ: خوا دەفەرموێ: ئەی بەندەکانم ئەوانەی کە خۆتان گوناهکار کردووە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا (چونکە ئەگەر بەڕاستی تەوبە بکەن)خوا لە هەموو گوناهەکانتان خۆش دەبێت چونکە ئەو خوایە زۆر لێبوردەو میهرەبانە...بینیم خەندەی بەختەوەریی نیشاندا وە چاوانی پڕ بوو بوون لە فرمێسك، پاشان خواحافیزی لێکردم و ڕۆیشت! سبحان الله العظیم! مرۆڤ هەر چەندە بگاتە ئەوپەڕی فەسادو نوقم بوون لەگوناهدا لەدڵیدا هەر تۆوی خێری تێدایە، ئەگەر بتوانین بگەین بە دڵی و چاودێری بکەین پشت بەخوای گەورە بەردەگرێت وبەرهەمدار دەبێت.

تۆوی خێر بەردەوام لە ململانێدایە لەگەڵ دەروونی مرۆڤدا، وە دەردەکەی بریتیە لە ڕوو پۆشی ئارەزوو، ئەگەر خوای گەورە بیەوێت خێر دەستگیری بەندەکەی بکات ئەوە نورەکانی ڕێنمایی لە دڵیدا دەگەشێنێتەوەو دەیخاتە سەر ڕێگای ڕێنومایی کەران...پەروەردگار دەفەرموێ (فمن يرد الله أن يَهديه يَشرَح صَدرَه للإسلام ومن يرد أن يَضله يَجعل صَدرَه ضيقاً حرجاً كأنما يصعد في السماء).

واتە: ئەوکەسەی (خێری تێدابێت)و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات ئەوە سینەی ساف و پاك و ئامادە دەکات بۆ ئاینی ئیسلام، ئەو کەسەشی خوا بیەوێت گومڕای بکات ئەوە دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەکات، هەروەك ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرزبێتەوە.

# ٣٩- «گوێیەکی بیمار»

دوای نوێژی عیشا لەژوورەکەی خۆیدا دانیشتبوو، سەرقاڵی حەزەکانی خۆی بوو، خۆشترین کاتی لەگەڵدا دەبردە سەر... ئاگای لەم دنیایە نەمابوو... گوێی لە گۆرانیبێژە کورەکە گرتبوو ئەمیش بۆی دەسەمندەوە... خۆشترین گۆرانیبێژ بوو بەلای ئەمەوە... سەماعەکانی دەخستە گوێیەوە... ئاگای لە بانگ و ڕووداوی دەوروپشتی نەبوو... بەهۆی قورسایی ساڵانەوە.

-کچی خۆم پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی ڕەجم کراو... و ئەمڕۆت کۆتایی پێ بێنە بەدوو رکات نوێژ لە بری ئەم گۆرانی و بەزم و ڕەزمە... بە بێتاقەتیەوە وەڵامی دایەوە: باشە.. باشە.. دایکی چوو بۆسەر بەرماڵ ودەستی کرد بە گەشتە بەردەوامەکەی لە شەونوێژدا... بە ووردی تەماشای دایکی کرد... گۆرانیەکە تەواو بوو.. بە دڵتەنگیەوە بەرەو پێخەفەکەی ڕۆی... دانیشت تا خۆی ئامادە بکات بۆ خەوتن... دواهەمین شت کە حەزی دەکرد گوێی لێ بێت دەنگی ئەو گۆرانیبێژە بوو... قژی بەردایەوە... سەماعەکانی دوور خستەوە لە گوێی... تەماشایەکی پەنجەرەکەی کرد... ئۆه... خۆکراوەتەوە... پێش ئەوەی ببزوێ بۆ ئەوەی پەنجەرەکە دابخات... شتێکی وەك تیر بینی بەرەو ڕووی هات... وە زۆر بەووردەکاریەوە ئامانجی پێکا... زۆر بە ووردەکاریانە بەری پەردەی گوێی کەوت... لەتاو ئازار هاواری لێ بەرز بوویەوە... وەك شێت دەسوڕایەوە.. مێشکی سەری ئەزرنگایەوە.. خشە خش کەوتە گوێی... دایکی بەپرتاو هات..

-چیتە کچم... زۆر بەخێرایی بەرەو فریاگوزاریی ڕۆشتن... پزیشك پشکنینی گوێکەی کرد... پەرستارەکانی بانگ کرد.. لەناو گەرمەی ئازاردا پزیشکەکە دایە قاقای پێکەنین، پاشان پەرستارەکانیش... ئەمیش زۆری پێ ناخۆش بوو.

-چۆن پێ دەکەنن لەکاتێکدا من بەئازارەوە دەتلێمەوە.

پزیشکەکە پێی ووت: سیسرکێکی باڵدار چووەتە گوێتەوە... ترسی ناوێ و بە ئاسانی دەردێت... بەڵام من ناتوانم دەری بێنم پێویستە پزیشکی پسپۆڕ ئەم کارە بکات و سبەینێ سەعات حەوت سەردان بکە! چۆن بەرگە بگرێت لەکاتێکدا ئەو سیسرکە لە گوێیدا دەجوڵێتەوەو دەیەوێ بێتە دەرەوە؟ ئازارەکەش سات لە دوای

سات زیاد دەکات... پزیشکەکە پێی ووت: ئەو بەیەك شت یارمەتی دەدات ئەویش بێهۆشکردنی مێروەکەیە تا بەیانی بۆ ئەوەی نەجوڵێتەوە.. مادەی بێهۆشکردنی کردەگوێ یەوەو لە جوڵەی خست.

وەك شێت گەڕایەوە بۆماڵەوەو سەریشی لەتاو ئازار خەریك بوو دەتەقی... ئەو شەوە بوو بەسەدەیەك و هەر تەواو نەدەبوو.. هەر کەنوێژی بەیانی کرد بەپەلە لەگەڵ دایکی چوونەوە بۆ نەخۆشخانە.. پزیشکەکە پشکنینی بۆ کرد.. بەڵام بێئومێدی پێوە دیار بوو.. چونکە دەرهێنانی سیسرکەکە ئاسان نییە.. کلێنسێکی سپی دانا.. و جفتەی ئامادە کرد.. کردی بە گوێیدا.. پاشان دەری هێنا.. تەنها کلکی مێروەکە بوو... جارێکی تر هەوڵیدایەوە... ئینجا سکی دەرهێنا... پاشان... سنگی... پاشان سەری... ئایا تەواو؟ هێشتا هەست بە ئازار دەکات! پزیشکەکە دەستی کردەوە بە پشکنین.. مێروەکە کەڵبەکانی گیرکردبوو لەپەردەی گوێی! ئەستەم بوو دەرهێنانیان چونکە زۆر بەسەختی نوسابوون بەپەردەی گوێ یەوە! پزیشکەکە پارچە لۆکەیەکی هێناو مادەی پاکژ کەرەوەی پێوە کرد و کردی بە گوێیدا... داوای لێکرد دوای پێنج ڕۆژی تر بێتەوە.. بەڵکو کەڵبەکان دوای نەمانی گیان تیایاندا شی ببنەوە.. لەماوەی ئەو پێنج ڕۆژەدا.. وردە وورده هەستی بیستنی لاواز دەبوو... تاوای لێهات لێوی خەڵکی دەبینی دەجولایەوە بەڵام نەیدەزانی چی دەڵێن و باس لە چی دەکەن.. خەریك بوو شێت دەبوو! لەکاتی دیاریکراودا گەڕایەوە بۆ لای پزیشکەکە.. بەڵام... زۆر بەداخەوە هیچی بۆ نەکرا.. .جارێکی تریش لۆکەی خستە ناو مادەی پاکژکراوەوەو خستیەوە گوێی.. ووتی: دوای پێنج ڕۆژی تر وەرەوە.. زۆر گریا... هەستی بە پەشیمانی و پەژارەیی کرد کاتێ کە خەڵکی دەبینی قسە دەکەن و پێدەکەنن.. ئەم ناتوانێت هەتتا گوێی لە دەوروبەریشیەوە بێت و قسەیان لەگەڵدا بکات.. دوای پێنج ڕۆژەکە گەڕایەوە بۆلای پزیشك... دووبارە سوودی نەبوو... دەبێ نەشتەرگەریی بۆ ئەنجام بدرێت بۆ دەرهێنانی کەڵبەکانی.. خەریك بوو لە تاو ترس و خەفەت دەمرد..

داوای لە پزیشکەکە کرد پێنج ڕۆژی تر مۆڵەتی پێ بدات.. دوای پێنج ڕۆژەکە دیسان گەڕانەوە.. خوای گەورە دەروی لێکردەوەو پزیشکەکە توانی هەردوو کەڵبەکە دەربێنێ بەبێ ئەنجامدانی نەشتەرگەری.. وورده وورده بیستنی ئاسایی بوویەوە...

تەنها لەو کات و ساتەدا.. هەستی کرد کە هەر هەموو ئەو شتانەی بەسەریدا هاتووە زللەیەك بووە بۆ بە ئاگا هاتنەوەی.. ئێستا ئەو یەکێکە لەوانەی گەڕاوەتەوە بۆلای پەروەردگار.

خاوەنی چیرۆکەکە ئێستا یەکێکە لە بانگخوازانی ڕێگای خوا.. دەخوازێ لەپەروەردگار ئێمەو ئەویش جێگیرو چەسپاو بکات.. سبحان الله.

## ٤٠- ﴿منداڵێکی بەهەشتی﴾

هاوڕێ کچەکەم کاتێ لە گەڵمدا دەدوا فرمێسکی غەم و پەژارەیی بەچاوانیدا دەهاتە خوارەوە.. وەخت بوو دڵی دەسوتاندم.. وتی: بڕوام بە قسەکانی پزیشکی منداڵان نەکرد زۆر سەرسام بووم کاتێ کە هەواڵی پێدام منداڵە جوانەکەم توشی کەمئەندامیی هاتووە.. قسەکانیم وەرنەگرت و بڕوام پێ نەکردو تۆمەتبارم کرد کە بەهەڵەدا چووە، بۆیە کچەکەمم برد بۆ بەناوبانگترین نەخۆشخانەی جیهانی، لەوێیش وەك هەورە گرمە هەواڵەکەیان ئاراستەی دڵم کرد: کچەکەم لە ڕووی جەستەییەوە کەمئەندامەو لەڕووی ژیریەوە دواکەوتووە، بۆیە توشی شۆك و غەم و پەژارەیەکی زۆر بووم، شەوانێکی زۆرم بەناڕەحەتی دەبردە سەر.. بیرم لەحاڵی منداڵەکە دەکردەوە، دنیا لەبەرچاوم گۆڕا بوو.. لەلای من هیچ بەهایەکی نەبوو، هەستم بە تاوان دەکرد.. چونکە بە گریان و ناڕەحەتیەوە هەواڵی سکبوونم پێ گەشت.. ئەوەی بەسەر ئەودادێت سزایەك بوو بۆ من، پاشان هەوڵمدا خەفەت زۆر نەخۆم و پشت گوێی بخەم، هەوڵمدەدا کچەکەم ڕابێنم لەسەر هەندێ شارەزایی کە لە ژیانیدا سوودی لێ ببینێت، بەڵام ئەو ڕاستیەی کە زۆر تاڵ بوو ئەوە بو کە کچەکەم توشی سەختترین جۆری کەمئەندامی بوو بوو.. بۆیە هەرگیز سوودی لەو مەشق و ڕاهێنانانە وەرنەدەگرت.

پەژارەیی وورده وورده هەموو دڵمی داگیر کرد.. بومە دیلی خەمێکی قوڵ، بۆیە کچەکەم و منالەکانی ترم و خۆیشم پشتگوێ خست.. بومە دیلی ماتەمی و هەستە نادروستەکان و تێکیان شکاندبووم.. تووشی چەند شتێکی سەیر بوو بووم.. تەمەڵی و بێ توانایی.. بەڵکو بێزاریی لە ژیان و وەسوەسەو گۆشەگیریی، هەستانێکی سەیر و ئازاراوی، تەواو کاری کردبووە سەر ژیانم ..بووبوە هۆی سەرهەڵدانی بۆچونی نادروست و وەسەوەسەو گوێ پێنەدانێکی تەواو بە کچەکەم و منداڵەکانی ترم.. ئێرەییم پێ دەبەن، بەڵێ خەڵکی بەهۆی ئەو ڕۆژیەوە خوا پێی بەخشیوم ئێرەییم پێ دەبەن.. پێویستە بچم بۆلای شێخێك خوێندنەوەم بۆ بکات..

بەدوای شێخێکدا دەگەڕام کە ڕزگارم بکات لەم نەهامەتیەم، بەڵام بۆچی نەچم بۆلای فلانە ئافرەتی بانگخواز.. هەرچی کەس و کارمە بەباشە ناوی دەبەن.. بۆیە منیش چوم بۆلای ..بەڵام وەڵامەکەی سەیر بوو بەلامەوە.. دوای ئەوە ئاشنا بوو بە

حاڵەتەکەی من ووتی: خوشکی بەڕێزم تۆ ئێرەییت پێ نەبراوە بەپێی گومانی خۆت.. بەڵام ئەوەی تووشی تۆ هاتووە تەنها لاوازیی ئیمانە.. من ئیمانم لاوازە.. نا.. من موسڵمانم و نوێژ دەکەم..

ئەوەی تۆ کۆڵەواریت پێیەوە ..نیشانەکانی دووریە لە خوای گەورەو لاوازیی ئیمانە، وە ئەگەر دەتەوێ لەو شتانە ڕزگارت بێت، بگەڕێوە بۆلای خواو تەوبەیەکی ڕاستگۆیانە بکە، دڵت پڕکە لە خۆشەویستی خواو یەکلا ببەرەوە بۆلای خوای گەورە؟ ئایا دەزانی یەکلایی بوونەوە چیە.. بریتیە لەڕاستگۆیی لەگەڵ خوادا پاش پەرستنی و پەناگرتن پێی، بە ملکەچیەوە نوێژ بکەو شەونوێژ ئەنجام بدەو بە ڕۆژووبە لەبەر خوای گەورە، داوای زانستی بەسود بکە و ڕازیبە بەبەشی خوای گەورەو ئارامبگرە لەسەری.. ئاە.. ڕاست دەکەیت.

ئەی خاتونی بانگخوازی دڵپاك: پێویستە ئارام بگرم و ڕازی بم بە قەزاو قەدەری خوای گەورە، وورده وورده لەخوای گەورە نزیك بوومەوە بەتەوبەکارانەو خواپەرستانەوە.. قورئانی پیرۆز لە نارەحەتیەکانمدا هاودەمم بوو... زیکری خوا توێشووم بوو لە تەنیاییمدا، گەڕانەوەی کارەکان بۆلای خوا عیزەت و لەززەتی من بوون.. چەند ڕۆژێکی نەخایاند تاریکایی و ماتەمی پوکایەوەو نوری ئیمان لەدڵمدا گەشایەوە.. ئەوەندە بەتام و لەزەت بوو هەرگیز پێشتر هەستم پێنەکردبوو..

تامی ژیان لەلام گۆڕا.. بەڵێ بەچاوی ئیمانەوە بینیم و تام و چێژی تایبەتی هەبوو، نزیکی لەخواوە بەڕەزامەندیەوە.. هەستەکانی تورەیی و دڵڕەقی گۆڕان بۆ ڕازیی بوون بە قەزاو قەدەری خوا.. دڵنیابووم ئەوەی تووشم هاتووە بۆ ئەوە نیە بە هەڵەمدا بەرێت، بۆیە دەروونم هێور بوویەوە و دڵم ئارم بوو، مەلەم دەکرد لە کەش و هەوای ئیمان و زانستی شەرعیدا.. دڵنیابووم لەڕەحمەتی خوا.. کۆستەکان (المصائب) تەنها سزانین لەلای خوای گەورەوە بەڵکو لەوانەیە بەرزبوونەوەی پلەو ئەجرو پاداشت بێت.

وە بێگومان ئەوە لەڕۆزی خواییەوەیە بۆ سەرمن کە ڕێنمایی کردم قوتابخانەیەك بکەمەوە کە تایبەت بێت بەوانەی تووشی کەمئەندامیی سەخت بوون.. وە سوودی هەبوو بۆ موسڵمانان، هەرچەندە کچەکەم سودی لێ نەدەبینی چونکە تووشی

کەمئەندامیـەکی سـەخت بـوو بـوو، بـەڵام مـن دڵـشادم بـەهۆی سـودگەیاندنەوە بـە موسڵمانان..

دەخوازم لەخوای گەورە لە هەموانی وەربگرێت.

ئێستا هەرچەندە کچە کەمئەندامەکەم دەبینم دەڵێم سوپاس بۆ خوا

(لەماڵەکەماندا منداڵێکی بەهەشتی هەیە)

# ٤١-﴿بەرەو ڕێگای ڕووناکی﴾

حەزمکرد بەسەرهاتی خۆم باسکەم ،بەڵکو ببێتە هۆی ڕێنومایی هەندێ کەس بەرەو ڕێگای ڕووناکی.. من ئافرەتێکی زۆر سادەم.. حیجابم نەدەپۆشی.. هەرچەندە ڕەچاوی ڕەوشتە گشتیەکانم دەکرد لە پۆشینی جل و بەرگدا، وە زۆر کەم و بەدەگمەن نەبوایە ئارایشت و میکیاجم نەدەکرد، هەمیشە شوێن پێی سوننەتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)م هەڵدەگرت و پابەندبووم بە جوانترین ئاکارو ڕەوشتەوە.. تەنها حیجام نەدەپۆشی، دەترسام بۆ نمونە لە ڕۆژی شوکردنمدا نەیپۆشم.. وە چاوەڕوان بووم تاوەکو شوو بکەم.. ساڵان گوزەران و شوم نەکرد و لەو بڕوایەدا بووم ئیمانەکەم هیچی کەم نییە حیجاب نەبێت.. وە هەمیشە گوێم لە خەڵکیەوە دەبوو کە بە ئاکارو پابەندبوونی منیاندا هەڵدەدا، هەرچەندە دژی ڕەوتی دنیایی بووم، چونکە من درۆم نەدەکرد لەژێر هەر بارودۆخێکدا بوایە، زۆرێك لەوانەی منیان دەناسی سەرسام بوو بوون لە پابەندبوونم لەگەڵ ئەوەدا کە باڵاشم نەپۆشی بوو.

دەمزانی کە خوای گەورە خۆشی دەوێم، چونکە سوپاس بۆ خوا هەمیشە خەونی بۆ دەناردم هەرچەندە من هەستم بە شەرمێکی زۆر دەکرد لەگەڵ خوادا.. چۆن بەغالەت بە خۆم بەرم لەپەرستنیداوله کاتێکدا شەرم لە خەڵکی دەکەم بەڵام شەرم لە خوای گەورە ناکەم.. خەوێکم بینی مرۆڤەکان بوو بوون بە دوو بەشەوە پابەندەکان و بێ ئاگاکان لە ئایین.. منیش لەنێوانیاندا حەیران مابووم، لەناو هەردوولادا کەسانی باشی تێدابوو دەیانەویست بچم بۆلایان، وە ڕەمزێکیش لە ئارادا بوو بۆ تەواوبوونی تەمەن.. لەیادم بێت دووجار ڕەمزەکەم دووبارە بوویەوە..شوکردنی خوشکەکەم ڕاستەوخۆ دوای جەژنی ڕەمەزان بوو.. منیش سووربووم لەسەر باڵاپۆشینم، بەڵام هەموان پێیان دەوتم، دوای شوکردن تاوەکو جوانترین پۆشاك لەبەر بکەم، وە لە جوانترین شێوەدا دەرکەوتبووم، بەڵام لەخەوەکەمدا ئەجەلم هات.. هەستامەوە دەستم کرد بە گریان پێش چوونم بۆ سەر کارەکەم.. پاڕابووم.. وە زۆر دڵنیابووم ئەگەر لە ماڵ بچمە دەر ئەوە دەمرم بەبێ ئەوەی بەندەیەکی ملکەچی خوابم.. لەمردن نەدەترسام، بەڵام شەرمم دەکرد بەخزمەت پەروەردگارم بگەم بەسەر ڕووتی.. شتێکم نەبوو بیپۆشم بەسەرمەوە بۆیە لەماڵەوە کڵاوێکم کردە سەرم هەرچەندە جوانیش

نەبوو.. بۆیە بەڕێگای ڕووناکیدا ڕۆیشتم.. بەبێ گوێ پێدان ئەگەر خوای گەورەش دوای چەند ساتێك بەرەو بارەگای خۆی بمباتەوە.. لەڕۆژی شایی خوشکەکەمدا پۆشاکی جوانم لەبەرکردو شانازیم بە بالاپۆشینمەوە دەکرد.. لەو ڕۆژەدا زۆر دڵخۆش بووم، وە قسەم لەگەڵ خوشکەکەی ترمدا کرد تاوەکو چەند سەرپۆشێکم بۆ بکڕێت.. ئەمە لە دەهەمینی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا.. سوپاس بۆ خوا نزیکەی ساڵێکم بەسەر برد بۆ ساتێکیش هەستم بە پەشیمانی نەدەکرد، بەڵکو سوپاسی خوام دەکرد کە بالاّم پۆشیوە، هەرچەندە زۆر پەشیمان بووم بەهۆی ئەو هەموو ڕۆژانەوە کە بەبێ بالاّپۆشین بەسەرم بردبوو، وە دڵم تەنگ دەبێت بۆ هەموو ئافرەتێکی باش کە تائێستا دەرکی بە ڕێگای ڕوناکی نەکردبێت.

خوشکی ئازیزم شتێکی تر هەیە،ئەی ئەو کەسەی کە دڵت لە نێوان دنیاو قیامەتدایە، بەڕێگای ڕوناکیدا بڕۆ، بێگومان خوای گەورە کۆمەکت دەبێت.. هاوڕێکەم زۆر دڵشاد بوو پێم.. پێی ووتم: من وویستم بێم بۆلات کە داوات لێبکەم حیجاب بپۆشیت.. بەلاّم سەرسام بوو بە قسەکانی من.. کاتێ کە ووتم ماوەی هەفتەیەکە بالاّم پۆشیوە.. پێی ووتم: پیرۆزت بێت، چونکە بەڕاستی خوا پەرستی لەڕەمەزاندا خێرو پاداشتی چەندبارەی کاتەکانی ترە.

چیرۆکێکی جوانم دەربارەی پیاوچاکێ خوێندەوە کە بەدوای جەنازەیەکەوە بوو، پرسیاری لەوەی پاڵی کرد: ئایا وای دەبینی ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ دنیا کردەوەی چاك بکات.. پیاوەکەش وەلاّمی دایەوە: بەڵێ.. پیاوچاکەکەش پێی ووت: ئەی ئەگەر ئەو وانە بوو تۆ وابە.

فرسەت بقۆزەرەوە بۆهەر خواپەرستیەك بێت کە دەتوانی پێی هەستی لە بەخشش یان زیکر یان هەر شتێك، چونکە بێگومان ڕۆژێك دێت ماڵ شك نابەیت بۆ بەخشینی یان تەندروست نیت شەو نوێژ بکەیت، کێ دەزانێ بەڵکو خوای گەورە بەپەرستشەکانمان قەرەبومان بۆ بکاتەوە.

دوای بالاّپۆشینم بینیم کە ئیمانی من کۆتایی نەهاتووەو بەمە تەواو نەبووە بەڵکو بەپێچەوانەوە بینیم دوای بالاّ پۆشینم کاروانی من دەستی پێکردووە.. ئێستا هەستم دەکرد کە نوێژەکانم لە ئاستی پێویستدا نیە، وە پەرستشەکانی ترم لە چاکەکردن

لەگەڵ دایك و باوك یان غەیبەت نەكردن و ناوناتۆرە یان باڵاپۆشینەكەم لە ئاستێكی پێویستدا نیە، پێویستی بەگۆڕانێكی زۆر هەیە.. بەڵام پێم داگرتبوو كە بەردەوام بەم ڕێگا ڕووناكەدا بڕۆم، تا لەكۆتاییدا بگەم بە دیداری خوای پەروەردگارو ڕووناكی ڕاستەقینە.

خوایەگیان لێم وەربگرەو دامەزراوەكەو هەموو ئەوانە دامەزراوكە كە بەڕێگاكەی تۆدا دەڕۆن و چەسپاومانكە لەسەر پەرستن (پەروەردگارا دوای ئەوەی ڕێنوماییت كردین دڵمان گرفتار مەكە و ڕەحمەت بڕژێنە بەسەرماندا چونكە تەنها تۆ زۆر بەخشندەی).

## ٤٢- ﴿ڕێگای ڕێنمایی﴾

بینیم زۆر شت هاندەری منن کە وورده وورده بەرەو ڕێنومایی دەمبەن.. من کچێکی بێئاگابووم ڕۆژێك نوێژم دەکردو دە ڕۆژ نەمدەکرد، وە سور نەبووم لەسەرکردنی نوێژی بەیانی، ونەدەهات بەبیرمدا کە بیگێڕمەوە.. قورئانم نەدەخوێندەوە تەنها لەڕەمەزاندا نەبێت.. وام دەزانی ڕەوشت جوانیم و خۆش مامەڵەکردنم لەگەڵ خەڵکیدا دەبێتە کەفارەتی ئەو جۆرە کەمتەرخەمیانەم.. کاربەو شێوەیە بەردەوام بوو.. من بێئاگا بووم وام دەزانی لەسەر هەقم تا ساڵی ڕابردوو نەخۆش کەوتم زۆر بەسەختی.. کەس نیاشانەکانمی نەدەزانی.. ملم ئاوسابوو.. پلەی گەرمیم بەرزبووبوویەوە، لەناو دەممدا زیپکەی سپی دەرکەوتبوون، نەمدەتوانی بەهۆیەوە خواردن بخۆم، بۆیە لاواز بووبووم.. پزیشکەکان سەرسام بووبوون لەنەخۆشیەکەم.. هەموو پشکنینەکانیان بۆ ئەنجامدام.. بەڵام سوودی نەبوو. لەکۆتاییدا بڕیاریاندا نەشتەرگەریم بۆ ئەنجامبدەن بۆ ئەوەی ئەندازێك لەو (وەرەم)ی ملم ببەن بۆ پشکنین.. دەروونم لەو ماوەیەدا زۆر لەبارێکی ناهەمواردا بوو.. وام هەست دەکرد مردن زۆر نزیکە لێمەوە.. بۆیە لێپرسینەوەی خۆم دەکرد، ڕاستییەکان لەبەردەممدا دەرکەوتن.. من هەمیشە بیانوی ئەوەم دەهێنایەوە کە هێشتا منداڵم و تەمەنم نەگەشتووەتە بیست ساڵی و کاتێکی زۆرم بەدەمەوە ماوە.. بەڵام ئەم نەخۆشیە پەیامێك بوو لە خوای پەروەردگارەوە تا بە ئاگام بێنێتەوەو هەواڵم پێبدات کە مردن لەوانەیە لە هەموو ئان و ساتێکدا بەرۆکم پێ بگرێت.. سەرکەوتووش ئەو کەسەیە کە خۆی ئامادە کردووە بۆی... بە ئامادەباشیەکی تەواوەوە.. نەشتەرگەریەکەم بۆ ئەنجامدرا.

سوپاس بۆ خوای گەورە دەرکەوت کە خانەکانی (وەرەم)ەکە پیس نین، بەڵام لەئەنجامی ڤایرۆسێکەوە بووە کە تووشی گرێی بەڵغەمیی بووە.. دەستم کرد بە خواردنی دەرمانی گونجاو.. وورده وورده نەخۆشیەکەم هێور بوویەوە.. بەڵام دیار بوو ئەم وانەیە بەس نەبوو بۆبەئاگا هێنانەوەم بەتەواوی لەو بێ ئاگاییەم.. تامانگی پیرۆزی ڕەمەزان هات.. شەوێکیان کە ناتوانم هەرگیز لەیادی بکەم لەژیانمدا..لای پورێکم بانگهێشت کرابووم بۆ بەربانگ کردنەوە.. دوای ئەوەی نانمان خوارد.. پورم پێشنیاری بۆ کردم کە لەگەڵیدا بچم بۆ مزگەوت تا نوێژی تەراویح بکەین، پێم ووت:

مـــن لەژیانمـــدا نوێـــژی (تـــەراویح)م نـــەکردووە.. پێـــی ووتم :وەرە هەمووشـــتێك سەرەتایەکی هەیە..

بۆیە ڕۆشتم لەگەڵی، نوێژمانکردوو هەستم بە شتێکی جوان دەکرد کە پێشتر هەستم پێ نەدەکرد.. دڵنیایی و بەختەوەریی.. لێی پرسیم ئایا سبەینێش دێیتەوە.. منیش بەپەلە ڕەزامەندیم نیشاندا بەتایبەتی ڕێکەوتی بیست و حەوتی ڕەمەزانی دەکرد.. چوین بۆ یەکێ لە مزگەوتە ناودارەکان کە ئیمامی مزگەوتەکە لەتەراویحدا یەك (جزم) قورئانی دەخوێند.. ئەوەندە نوێژگەری لێ بوو تا ئەو ڕادەیەی من لەسەر پلیکانەیەك وەستابووم و نوێژم لەسەری دەکرد.. دوای لێبوونەوە.. ئیمام دەستی کرد بە دوعا خوێندن.. خەڵکەکە دەستیان کرد بە گریان.. منیش هەستم بەگریانێکی توند دەکرد، بەڵام نەمدەتوانی بگریم.. لەوکاتەدا هەستم دەکرد کە هەڵەیەك لە ئارادایە.. هەموان دەگرین و منیش ناتوانم یەك فرمێسك بڕێژم.. لەوساتەدا هەستمکرد کە من زۆر دوورم لە پەروەردگارمەوە.. بۆیە دەستم کرد بە پاڕانەوە لەپەرەوەردگارم تا لێم خۆش بێت و ڕازیی بێت لێم و ڕێنومایيم بکات بۆ ڕێگاکەی... ئەو شەوەم زیندوو کردەوە.. وام هەست دەکرد سەرلەنوێ لەدایك بوومەتەوە..

لەوڕۆژەوە سوپاس بۆ خوا نوێژێکم لە کیس نەچووە و سوورم لەسەر نوێژە سوننەتەکان و ئێستا هەوڵدەدەم فێری باش خوێندنەوەی قورئان ببم تاوەکو پشت بە خوای گەورە بتوانم قورئانی پیرۆز لەبەربکەم..

ئامۆژگاریم بۆ ئێوەی ئازیز ئەوەیە هیچ بانگهێشتێ ڕەت نەکەنەوە کە ئاراستەتان دەکرێت بۆ پەرستشی خوا، بڕوام پێ بکەن بەڵنیاییەوە ئەم بانگەوازە وەکو سەری پەتێك وایە ئەگەر گرتان بەدەستەوە خوای گەورە یارمەتیدەرتان دەبێت، وە دەخوازم لە خوای گەورە کە من و ئێوەش دامەزراو بکات لەسەر ڕێگای ڕێنومایی.

## ٤٣- ﴿كچەكەمم لەدەستدا﴾

بەسەرهاتی من بەسەرهاتی باوکێکە کە فرمێسکی حەسرەت و پەشیمانی دەرژێت، دوای ئەو خەوەی کە بینیم دەربارەی کچە گەنجەکەم کە پێش ماوەیەکی کەم وەفاتی کرد لە ئەنجامی نەخۆشیەکی ئازاراویدا.. کچەکەمم بینی تەماشام دەکات و دەڵێت(حسبی الله و نعم الوکیل)..

بەردەوام ئەوەی دەوتەوە... سوربوومەوە و زۆر بەتاسەوە لێم پرسی: دەتەوێ تۆڵە لەکێ بکەیتەوە تامن تۆڵەی لێ بکەمەوە؟

وتی: لەتۆ باوکە.. ئەی ئەوکەسەی زیادەڕەویت کرد تیامداو، نەتپاراستم، ئەی ئەوکەسەی ناپاکیت کرد لەو ڕاسپاردەیە.. تۆ هاوکار بوی لەوەی کە من ئێستا تیایدام.. (حسبی الله علیك) سەرسام بووم بەوەو بە ئەبڵەقیەوە پرسیم: ئەی تۆ ئێستە لە کوێی؟

لەوەڵامدا وتی: ئایا ئەزانی من لە کوێم؟ لەوکاتەدا ڕوخساری پاراوی و گەشاوەییەکەی گۆڕا بۆ ڕوخسارێکی ترسناك و ناشرین.. وە چاوەکانی وەکو دوو چڵۆسکیان لێ هاتبوو کە ئاگر بپڕژێنن، وتی:من ئێستا لە چاڵێکدام لە چاڵەکانی دۆزەخ، پێم ووت :بۆچی؟بۆچی وات لێ بەسەرهات؟

وتی: تۆ هۆکاربوویت.. تۆ من و خوشك و براکانمت دەبینی دادەنیشتین بەدیار فیلمە بێ بەهاکانی شەوەوە و ڕێگات لێ نەدەگرتین، وە کاتی نوێژی بەیانی دەخەوتین، هەوڵت نەدەدا خەبەرمانکەیتەوە، بەڵکو دەتبردین بۆ ئەو دوکانانەی کاسێتی ڤیدیۆ دەدەن بە کرێ.. فرۆشیارەکە ووتانێکی ئاراستە دەکردین کە جەستە پارچە پارچە دەبێت لەشەرماندا، ئێمەگرنگیمان دەدابەوە.. بەڵکو پێدەکەنین.. دەچووین بۆ بازاڕ خۆمان دەڕازاندەوەو بۆنمان لەخۆمان دەدا بەبێ ئەوەی مەحرەممان لەگەڵدا بێت تاسەرنجی کوڕان ڕابکێشین، بەبێ چاودێری یان گرنگی پێدانی تۆ، تۆ بوونت نەبوو..

لەوکاتەدا لەخەوەکەم ڕاچڵەکیم و بەترسەوە بەئاگا هاتم.. بڕوام پێبکەن..

لەگەڵ پەرێشانیم بۆ ئایندەی کچەکەم.. ئاواتیشم دەخواست بەخەبەر نەهاتمایە تاکچەکەم قسەکانی تەواو دەکات، چونکە من دەمویست ئەو هەڵانە ڕاست بکەمەوە کە

لەگـەڵ کـچەکەمدا ئـەنجامم دابـوو تـا کـچەکانی تریـشم وایـان بەسـەر نەیـەت، وە پـەروەردەیان بکـەم لەسـەر پەروەردەیـەکی دروسـتی ئیـسلامیانە.. وە ئێـستا داوا لـە هەموو ئەوانە دەکەم کە ئەم بەسەرهاتە ناخۆشەی من دەخوێننـەوە دەستەکانیان بـەرز بکەنەوە بۆ ئاسمان و داوا لە خوای گەورە بکەن کە لـە کچەکەم خۆش ببێت کە پاش خوای گەورە بوو بەهۆی ڕێنمایی کردنی من.

## ٤٤- ﴿ڕێنمایی﴾

دەمەوێ خۆمتان پێ بناسێنم، من کچێکم لەناو خێزانێکی بەڕێزدا گەورەبووم، بەڵام هیچ پەیوەندییەکی بە ئاینەوە نەبوو.. دایکم باڵاپۆش نەبوو، وە نەمدەبینی باوکم و دایکم نوێژ بکەن..

هەموو ئەوەی کەمن دەمزانی من موسڵمانم و لەقوتابخانەیەکی فەرەنسیدا لای((ڕاهیبەکان)) پەروەردە بووم.. هەموو خەمی من پۆشاك و یانەو هاوڕێ و ئاهەنگ بوو.. هەموو جۆرە جلێکی ناپۆشتەم لەبەر دەکرد.. وەوا تەماشای باڵاپۆشەکانم دەکرد کە دواکەوتوو و کۆنەپەرستن.. دەموت ئایا قژو هەردوو دەست و پێ جێگەی سەرنج و وروژاندنن؟ تا ئەوکاتەی خوشکە گەورەکەم شوی کرد بە هاوڕێیەکی خۆی کە کەمێك دیندار بوو.. هانی خوشکەکەمی دەدا کە نوێژ بکات و قورئان بخوێنێت، خوشکەکەم حیجابی پۆشی.. بەزۆر شێوە بانگەوازی منیشی دەکرد، بەڵام هەموو هەوڵەکانی توشی شکست دەبوون.. خوشکەکەم لەپێناوی مندا دەگریا.. دایکیشم هانی منی دەداو لە خوشکەکەم توورە دەبوو.. لەمانگی ڕەمەزاندا خوشکەکەم دەچوو بۆ نوێژی تەراویح لە مزگەوت.. ڕۆژێکیان لەگەڵیدا ڕۆیشتم، بۆ نوێژ کردن نا، بەڵکو تەنها بۆ چوونە دەرەوە و گەڕان.. کاتێ چوومە مزگەوتەوە ترسێك هات بە جەستەمدا.. شوێنەکە بە نیسبەت منەوە نامۆ بوو.. ئافرەتان قورئانیان دەخوێندو دەگریان.. کۆمەڵێکی تریش بەملکەچییەوە نوێژیان دەکرد.. کۆمەڵێکی تریش لەناو مزگەوتا خوێنیان دەبەخشی.. ئیمام نوێژی دابەست.. بەهۆی بیرکردنەوەوە تەرکیزم لەسەر هیچ ووشەیەك نەبوو..

دوای تەواوبوونی نوێژ ئیمام دانیشت کە لە شێخە ناسراوەکان بوو باسی ژیانی پێغەمبەر (ﷺ) و خێزانەکانی دەکرد.. حەزم لەو بەسەرهاتە بوو.. بۆ ڕۆژی دوایی چوومەوە تاگوێم لە تەواوی باسەکەوە بێت.. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر ئاشنا دەبووم بە ئیسلام.. هەوڵمدا قورئان بخوێنمەوە، بەڵام بۆ من سەخت بوو.. نارەحەت بوو کە لێی تێبگەم، نەمدەزانی بیخوێنمەوە.. داوایەکی زۆرم لە خوای گەورە کرد تاوەکو مێردێك بکات بە نسیبم وەك مێردی خوشکەکەم تاوەکو ڕێنومایم بکات بۆلای خوا...

گەڕامەوە بۆ ماڵ، لە ماڵەوە کۆنە هاوڕێیەکی دایکمم بینی کە هاوڕێی قوتابخانە بوون ... هەردووکیان زیاتر لە (٣٠) ساڵ دەبوو دابڕابوون لەیەکتر، بەڕێکەوت دایکمی بینی بوو، بۆیە هاتبوو بۆ دیدەنی و کوڕێکی خۆیی لەگەڵدا بوو کە تەمەنی (٢٦) ساڵ بوو.. کوڕێکی ڕۆح سوک و بە شەخصیەت بوو... دەرچوی زانکۆ بوو.. لەوڵاتێکی عەرەبی فەرمانبەر بوو بە بڕێک پارەی باش، لەماوەی هەفتەیەکدا دەبوو سەفەری بکردایە... من جیٚ سەرنجی بووم ..بۆیە داوای کردم.. بەڵام دانمان پیادا نەنا، بەهۆی بچوکی منەوە.. لەدواناوەندی گشتیدا بە پلەی زۆر باشە دەرچووم و پەیوەندیم کرد بە کۆلێژی گەشت و گوزارو ئوتێلەکانەوە کە بەدرێژایی ژیانم خەوم پێوە دەبینی.. پلانم بۆ دانابوو کە بەتەنها وڵاتانێکی زۆر بگەڕێم، ئاشنابیم بە کۆمپانیاکانی گەشت و گوزار، و ئۆتۆمبێل و پارەو شتی زۆر، بەڵام ئەو لاوە گەڕایەوەو سور بوو لەسەر ئەوەی من بخوازێت، هەرچەندە کەس و کارم دانیان پیادانەدەنا بەبیانوی تەواو نەکردنی خوێندنەکەمەوە.

نامەویٚ درێژەی بەمیٚ.. شووم پێکرد و لەگەڵیدا ڕۆشتم بۆ (جدّة) دوای هەفتەیەک (عەمرە)م ئەنجامدا.. وە دوای سیٚ مانگ حەجیشم کرد، بۆیە باڵا پۆشی و پابەند بووم بە ئاکاری ئیسلامییەوەو نزیک بوومەوە لەخوای گەورە.. دوومانگ جارێک دەچووم بۆ شاری مەدینە، هەموو ڕۆژیٚ نوێژی مەغریب و عیشام لە مزگەوتا دەکرد.. شریتی قورئانم دەست خست و فێری خوێندنەوەی قورئان بووم و چوار جزمم لەبەر کرد، دەربارەی ژیاننامەی پێغەمبەرو فەرموودەکان و فیقە و خەلیفەکان کتێبی زۆرم کڕی و شوێن پێیانم هەڵدەگرت، من ئێستا تەمەنم (٢٦) ساڵەو سوپاس بۆ خوا باڵاپۆشم و میکیاج ناکەم و ڕەنگی والا لەبەر ناکەم، ڕۆژانە ئەمڕۆم لە دوێنیٚ باشترە.. بوومەتە بانگخواز لەناو کەس و کارمدا، لەبارەی ئاینەوە ڕاوێژم پێدەکەن.. تا ئێستا نازانم ئەم زەواجەی من چۆن تەواو بوو وە چۆن هاوڕێیەکی دایکم دوای تێپەڕ بوونی ساڵانێکی درێژ دەرکەوت چۆن ڕازی بووم شوبکەم بەو شێوازە کلاسیکیە بە پیاوێک کە هیچ دەربارەی نازانم ..چۆن بەو ئاسانیە وازمهێنا لەخوێندەکەم کە ئاواتم بوو.. لە پێناوی پیاوێکدا کە نەمدەناسی.. چۆن ڕازی بووم زەواجم تەواو بێت لە میانی سیٚ مانگدا.. چۆن ڕازی بووم سەفەر بکەم بۆ وڵاتێکی غەریبی کە کەسی تیادا ناناسم،

لەگەڵ پیاوێکدا کە نایناسم.. بەڵام لەکۆتاییدا دەڵێم: خوای گەورە ویستی چاوم ببەستێت لەو شتانە،وەکارم بۆ ئاسانکات تا ڕزگارم بکات لەو ڕێگایەدا کەمن دەمویست پیایدا بڕۆم ،وە بمخاتە سەر ڕاستە شەقام (الطريق المستقيم).

سوپاس بۆ ئەو خوایەی ڕێنومایی کردین بۆ ئەمە، وە ئێمە ڕێنومایی نەدەکراین، ئەگەر ئەو زاتە ڕێنومایی نەکردینایە وە من شایەتی دەدەم بە خواو بە هەڵگرانی عەرشی و بەفریشتەکانی و بە پێغەمبەرەکەی و بە هەموو دروستکراوەکانی و ئێوە دەگرم بە شایەت کە من گەڕاومەتەوە بۆ لای خواو تەوبەم کردووەو خۆم بەری دەکەم لەوەی کە کردوومەو پەشیمانم، وە دەخوازم لە خوا کە لەمن و ئێوە خۆش بێت و لە قیامەتدا پێکەوە کۆمان بکاتەوە..

## ٤٥- ﴿ڕۆزیی خوا﴾

بەسەرهاتی ڕێنماییم لە مانگێکدا تەواو بوو.. بەڵام سەختترین مانگ بوو کەبەسەرمدا ڕابورد.. ئەگەر فەزڵی خوای پەروەردگار نەبوایە ئێستا ئابەم شێوەیە نەدەبووم.. سکم هەبوو، لەمانگی هەشتەمدا بووم، ئای چەندە چاوەڕوانیم کردو ساڵانێکی درێژ چارەسەرم بەکار دەهێنا، ویستی خوای گەورە وابوو کە حاڵەتی تەندروستیم بەشێوەیەکی بەرچاو بەرەو لاوازیی دەچوو.. پزیشکە گەورەکان دەستەوسان بووبوون لەچارەسەرکردنی من و کۆرپەکەم، چونکە ئەستەم بوو من و کۆرپەکەشم پێکەوە ڕزگارمان ببێت.. بەڵکو زۆر بەڕاشکاوانە بۆ ئەو کۆرپەیەی کە چاوەڕوانم دەکرد سوجدەی شوکرم نەبرد و هیچ نوێژێکم نەکرد کە پەروەردگارم ئەم ڕۆزیەی پێ بەخشیوم دوای گرتنەبەری چەندین چارەسەری قورس.. بەشێوەیەکی بەرچاو حاڵەتم بەرەو لاوازیی دەچوو.. گەشەی سروشتی منداڵەکە وەستابوو، لە ئەنجامی هۆکارانێك کە لەتوانای مرۆڤ بەدەر بوو.. لێرەدا هەڵوێستەیەکم کردو دڵنیابووم کە خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، هیچ کەس لەم گەردوونەدا ناتوانێت سودێکت پێ بگەیەنێ یان زیانێکت پێ بگەیەنێ ئەگەر لای خوای گەورە لەچارەت نەنوسرابێ.. ئای چەندە لاوازبووم.. هیچم پێ نەدەکرا نە من و نە پزیشکەکان، ئەوانیش دەستەوسان بوون لە پێشکەشکردنی یارمەتی تەواودا..

ئەی ئادەمیزاد ئای کە چەندە لاوازیت!! ئای کەچەند پێویستت بە پەروەردگارت هەیە!! چەندە لە لوتکەی لاوازیدایت لەکاتی کۆست و ناڕەحەتیدا.

بەڵام دنیای فانی لەخۆبایی کردبووین، من بەبەرچاومەوە خەونەکەی خۆم دەبینم ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەدەست دەچێت، بۆیە پەنام برد بۆ ئەو خوا تاك و تەنهایەی لەکاتی ناڕەحەتیدا پشتی پێ دەبەستین ..ئای کە چەندە پەروەردگارێکی بەخشندە بوو بەرامبەرم.

چەندە میهرەبان بوو بەرامبەرم.. بەخوا خوشکان و برایانم حەز دەکەم وێنای حاڵەتی دەروونیم بکەن لەو کاتەدا، بەڵام لەگەڵ زیکرو قورئان و نوێژ و دوعاو لەگەڵ دڵنیاییم کە خوای گەورە وەڵامم دەداتەوە لەگەڵ ئەوەدا کە من شایانی ئەوە نەبووم چونکە لەکاتی خۆشی و تەندروستیدا یادم نەدەکردەوە.. بەڵام یادم کردەوەو من

پێویستیم بەرەحم و بەزەیی ئەو زاتە بوو، کەواتە لە زاتێکی پیرۆزو لێبوردەو ڕۆزیدەرو شیفابەخش و پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی چاوەڕوانی چی دەکرێت..

بێگومان دڵئارامی و حەوانەوەی پێبەخشیم هەرچەندە ئەو واقیعەی منی تیادا دەژیام هیچ مژدەیەکی خێری تیادا نەبوو بۆ من..من لێرەدا هەڵوێستەیەکم هەیە کە دەخوازم پەندی لێ وەربگیرێت، ئەویش ئەوەیە کە خوای گەورە بەتوانایە وات لێ بکات و زۆرت لێ بکات کە بیپەرستی و یادی بکەیت.. هەمیشە لەیادت بێت کە خوای گەورە تواناداره بەسەر هەموو شتەکاندا.. بێگومان ئێمەی دروستکردووە تاوەکو بیپەرستین و سوپاسی بکەین لەسەر ئەو هەموو ڕۆزیە کە پێی بەخشیوین.. ئەگەر ئەو ڕۆزیانە نەبوایە بۆ ئەم ژیانە نەدەشایت.. دەی کەواتە بیپەرستەو نوێژی بۆ بکەو بزانە کە تۆ بەبێ خوا ژیانت خۆش نابێت، نە بەسەروەت و سامانیش، چونکە سەروەت و سامانت و دنیا دووشتن تەواو دەبن، با پشتیوان (رصید)ێکت هەبێت تەواو نەبێت..

توێشوی زۆر بخەن چونکە سەفەرەکە درێژەو ڕۆژی دوایی خێردارترەو نەبڕاوەیە.

بەکورتی ویستی خوا وابوو منداڵەکەم ببێت لە مانگی هەشتەمدا، بێتە سۆمای چاوم و بە وویستی خوای گەورە لە مردنێکی چاوەڕوانکراو ڕزگاری ببێت.. خرایە نەخۆشخانەوە بۆ چەند ڕۆژێکی دیاریکراو تاوەکو حاڵەتی تەندروستی جێگیر ببێت.. سوپاس بۆ خوا لەسەر ئەو هەموو بارانە.. ناومنا (مەریەم) چونکە بەزۆریی لەکاتی سکەکەمدا ئەو سورەتەم دەخوێندەوە، وە دەپاڕامەوە لە پەروەردگار ڕزگاریکات بۆم و چاوانم بەدیدەنی شاد بێت، ئای کە چەندە دەپاڕامەوە کە خوای گەورە بیپارێزێ لە هەموو ناڕەحەتیەك.. بڕیارمدابوو کە ناوی بنێم (مەریەم) بەهۆی منەتباریی ئەو سورەتە پیرۆزەوە، ئێستا کەدەیخوێنمەوە بەکوڵ گریانم دێت، دێتەوەیادم کە خوای گەورە بەخشندەیەکی بێ سنورە.. وە هیچ دەروازەیەك نیە بێجگە لەگەڕانەوە بۆلای خوا.. ڕێنومایی کرام و زانیم کە خوای گەورە بێ نیازەو ئەو زاتەیە لەکاتی ناڕەحەتیدا پشتی پێ دەبەسترێت، ناتوانین دەستبەرداری ببین.. دەپاڕێمەوە لەخوا کە ڕەحمم پێ بکات و لێم خۆشبێت و ڕێگام و دڵم ڕوناك کاتەوە بە نوری ئیمان و پەرستنی ڕەحمان.. ئەو باشترین کۆمەك و سەرخەرە.. وە داوا لە خوای گەورە دەکەم

که ڕۆژیی عەمرەم پێ ببەخشێ و چاوم ڕوناك بێتەوە بە بینینی مەککەی پیرۆز، وە بتوانم نوێژ لە پیرۆزترین خاکی ئەم زەمینەدا بکەم...

## ٥٦- ﴿بەرەبەیان﴾

ئەوەتا ڕووناکی بەرەبەیان هەڵدێت و ئەوەش دەنگی کچە بچوکەکەمە، هەستامەوە بەدەمیەوەو شیرم پێدا شیری خواردو بەئارامیەوە خەوتەوە.. هێشتا نوێژی بەیانیم نەکردبوو.. بەڵام بێئاگابووم لە نوێژەکە وام بینی وەك چۆن کەسێك خەو دەبینێ من بەتەنها دەڕۆم و بەدوای کچەکەمدا وێڵم.. ئەوە لەکوێیە؟ ئەگەڕێم بەدوایداو نایبینمەوە ...لەخەوەکەم بە ئاگا هاتمەوە، لە نزیکمەوە بوو، دوو سەعات تێپەڕی کردبوو بەسەریدا پلەی گەرمایی بەرز بووبوویەوە..!!

بۆچی وا؟ بەبێ پێشەکی بەبێ هۆ، چی لێهاتبێت؟ بۆچی ئەم ؟ نەخۆش کەوت.. کوڵمەکانی لەڕەنگی سوری ئاڵەوە گۆڕا بوون بۆ زەردێکی نەخۆشاوی.. پزیشك پێی ووتم: تەندروستی باشەو پێویستی بەهەندێ پشکنینە.. کۆمەڵێ پشکنینم بۆ ئەنجامدا.. هەموویان دەریاندەخست کە نەخۆشە، بەڵام نەخۆشیەکی سەخت نیە.. داوام لە خوای گەورە کرد شیفای بدات و بەدوری بگرێت لە نەخۆشی.. بەڵام بە چ ڕوویەك بچمە بەردەم بارەگای خوا.. چۆن داوای کۆمەکی لێ بکەم کە لەش ساغی بکات چونکە بەهۆی منداڵەکەمەوە بێئاگابووم لە نوێژی بەیانی، بەڵێ لەیادمە پێش لەدایك بوونی ئەم منداڵە هەرگیز نوێژی بەیانیم نەفەوتاوە.. بێگومان منداڵەکەم هۆکارە.. نا نەخێر ئەو نیە، من شەونخونی دەکێشم تا درەنگانێ تا دواهەمین ژەمی بەمێ و پاشان دەنووم و بەو شێوەیە نوێژی بەیانیم دەفەوتێ.. نوێژەکەم پەیوەست کرد بە نەخۆشی منداڵەکەمەوە، لەوانەیە خوای گەورە بیەوێت سزام بدات بەهۆی وازهێنانم لە نوێژی بەیانی، هەوڵمدا کاتەکانم ڕێك بخەم و هەستم بۆ نوێژی بەیانی.. یەکەم ڕۆژ و دووەم ڕۆژ هەستام.. دوو ڕۆژ دواکەوتم.. دوای ئەوە خۆم ڕێکخستەوەو منداڵەکەم بردەوە بۆلای پزیشك.. هەموو پشکنین و شیکارەکانم بۆ ئەنجامداو پزیشکەکە پێی وتم منداڵەکەت سەلامەتەو هیچی نییە، وەك ئەوەی پشکنین و شیکارییەکانی پێشوو هەڵە بووبن.

داوای لێبوردنم لە خوای گەورە کرد و دەستم کرد بە دوعای خێر و ئیتر لەو ڕۆژەوە بێئاگا نەدەبووم لە نوێژەکانم.

## ٤٧- ﴿ئایا پەروەردگارمان شایەنی ئەوە نیە﴾

ساڵی ڕابردوو لە قوتابخانەیەکی بیانی بڕوانامەم بەدەست هێنا، وا فێرکرابووم کە هەموو شتێ لەم دنیایەدا ئاساییەو ڕێگە پێدراوە.. ئەگەر من لەخێزانێکی میسری و موسڵمان نەبوومایە نەمدەزانی ئێستە حاڵم بەچی دەگەیشت.

ئارەزووی وەرزشم هەبوو.. خەونی گەورەم هەبوو بە ئایندەوە.. هاوڕێیەکی کچم هەبوو کە هەمان حەزو ئارەزووی هەبوو. پاڵەوانی وەرزشی عەرەبی و ئەفریقی بوو.. ڕۆژێکیان هاوڕێیەکی پابەند بە ئاینەوە (خوای گەورە پاداشتی بداتەوە) پێی ووت: ئایا ئێستا کاتی ئەوە نەهاتووە تا وازبێنیت و باڵا بپۆشیت؟

ئەویش ووتی: هێشتا خەونێکی زۆرم هەیە کە نەمهێناونەتە دی! کوڕەکە بەزیرەکیەکەوە کە ئەو هەستی پێ نەکرد ووتی: باشە ئایا ئەگەر کوڕێکی چاك لە هەموو ڕوویەکەوە خوازبێنیت بکات بەمەرجێك کە وازبێنیت و باڵا بپۆشیت ئایا ڕازی دەبیت؟ بەخێرایی ووتی: بەڵێ (ئەگەر شایانی ئەوەبێ؟) ڕازیی دەبم! ئەمیش پێی ووت: ئایا پەروەردگاری ئێمە شایانی ئەوە نیە؟؟ بێگومان نەیتوانی وەڵام بداتەوە.. بەڵام سەیر لەوەدا بوو ئەم قسەیە کاری تێنەکرد.... سوپاس بۆ خوا شوێنەوارێکی قوڵی لەناخی مندا بەجێهێشت.. تا ئەو ڕادەیەی کە چوومەوە بۆ ماڵەوە خۆم تاقی دەکردەوە بەسەرپۆشەوە! هەرچەندە سەرسامیش نەدەبووم بەخۆم، وە جلی گونجاوم نەبوو.... بۆ ڕۆژی دواتر هەنگاوێکم بۆنا ئەویش نوێژکردنی هەینی بوو.. سوور بووم لەسەر ئەوەی هەرچەندە ڕەخنەم ئاراستە بکرێت ئەوە بۆ ساتێکیش وازناهێنم لەو ڕێنومابییەی خوای گەورە پێی بەخشیوم، لەوانەیە ئەو لاوە هەتا ئێستاش نەزانێت کە هۆکارێکی ڕاستەوخۆبووە بۆ ڕێنومایی کردنی من.. من ئێستا وازم لە وەرزش هێناوە کە حەزیشم لێ دەکرد.. پەیمانەکەی خوا ڕاست بوو گێڕامی بە ئیماندارێك کە هەست بە شیرینیەکەی بکەم لە دڵمدا...

## ٤٨- ﴿كتێبێك ڕێنمایی كردم﴾

بەبێ باسكردنی سەرگوزشتەی درێژیی خۆم.. بەهۆی چەند هۆكارێكەوە كە خوای گەورە دەیزانێت.. ئەگەر یەكێكتان ویستان تێبگات لە نهێنیەكانی ژیانی و حەقیقەتی شتەكانی بۆ دەركەوێت و چەندین حەقیقەتی تریش لەناخیدا، وە ئاشنابێت بە كۆمەڵێ كەس كە فریشتەش نەبوون و مرۆڤیش بوون، بەڵام دەیانزانی بۆچی دروستكراون و چارەنوسیان بەرەو كوێ دەڕوا و كام ڕێگایە بگرنەبەر كە دەرونیانی پێ ڕەزامەندبێت.. هاوڕێی ئازیزم ئەگەر دەتەوێ هەموو ئەمانە بزانیت ئەوە پێویستە كتێبی ((رجال حول الرسول-پیاوانی دەوری پێغەمبەر)) بخوێنیتەوە كە لە نوسینی (خالد محمد خالد)ە لەوكاتەوەی ئەو كتێبەم خوێندوەتەوە ژیانم بەتەواوەتی گۆڕانی بەسەردا هاتووە..

سوپاس بۆ خوا شەرمم لەو پیاوانە دەكرد كە بە دەوری پێغەمبەرەوە ﷺ بوون.. پاشان شەرمم لە پێغەمبەر خۆی دەكرد پاشان شەرمم لە خوای پەروەردگار دەكرد.. هەموو دوعا و داوایەكم ئەوەیە كە من و ئێوەش وەربگرێت لە ڕیزی بەندە باشەكانی.

## ٤٩- ﴿سەرپێچی﴾

کاتێ چاوم بەدنیادا کرایەوە باوکمم بینی نوقم بووە لە ئارەزواتدا.. رادەبوێرێ و دەچێتە دەرەوەو لەگەڵ هاوڕێکانیدا مەی دەخواتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، داوای هەرچییەکمان لێ بکردایە دەستی نەدەنا بەڕوومانەوە، بەڵام بەمەرجێك سەرپۆش نەکەین، هەمیشە گاڵتەی بەو ئافرەتە دەهات کە باڵای دەپۆشێت.. سووربوو لەسەر ئەوەی هەر مۆدێلێکی تازەبێت بیکەینە بەر.. ئیتر ئایا بگونجێت لەگەڵ نەرتماندا یان نا.. بەتەواوی سەربەستی کردبووین (بەتایبەتی چوونە دەرەوەو شەو بێداریی).. پێی وابوو هاوڕێیەتی نێوان کوڕو کچ شتێکی شارستانیە، لەبەر ئەوە ئێمە لەگەڵ هاوڕێی براکانماندا دادەنیشتین.. بەڵام لەولاشەوە دایکم ئەم هەڵس و کەوتەی بەتەواوەی پێ خۆش نەبوو.. واتە لەهەندێکیدا قسەی دەکردو لە هەندێکیشیدا بێدەنگ دەبوو .. بەحوکمی ئەوەی باوکم زۆر حەزی لەسەفەرکردن بوو لەگەڵ هاوڕێکانی (بۆکاری خراپەو ڕابواردن) دایکیشم بەمەی دەزانی بەڵام دەیوت مادام دوور لە ماڵەوە کاری خراپ دەکات قەیناکا؟ باوکم سەفەری کردو سەفەرەکەی زیاد لەمانگێ درێژەی کێشا.. دوای ئەو ماوەیە، هاوڕێیەکی لەو شارەوە کە سەفەریان بۆ کردبوو پەیوەندی پێوە کردین تاوەکو هەواڵمان پێ بدات کە باوکم سبەینێ دەگاتەوە لامان بەڵام... بەمردوویی!... دوای بیستنی هەواڵەکە وامان لێ هاتبوو بڕوامان نەدەکرد؟ ئەو لەوپەڕی تەندروستیدا بوو.. ڕۆژێ لە ڕۆژان گرفتاریی شتێك نەبوو بوو؟ زۆر گریاین.. بەتایبەتی من چونکە بچوکی هەموان و نازپێدراوبووم و هیچ داواکاریەکم ڕەت نەدەکرایەوە..

هەرکە تەرمی باوکم گەشتەوە کەوتم بەسەریداو زۆر بەخەستی دەگریام.. ڕۆژانی تەعزیەو ماتەمینی تەواو بوو.. پەیوەندیم بەهاوڕێ خۆشەویتەکەی باوکمەوە کرد کە سەفەری کردبوو لە گەڵیدا... پێیان ووتم لەمزگەوتەو جیانابێتەوە لێی زۆر کەم نەبێت منیش سەرم سوڕمابوو لەو هەڵوێستە کت و پڕە کەبەسەریدا هاتووە کاتێ هەوڵی زۆرم دا بیبینم.. هاتەوەو ڕوخساری تێك چوو بوو پێم ووت مامەگیان: دەمەوێ پێم بڵێی باوکم چۆن مردووە... دەستی کرد بە گریان.. سوێندم بۆ خوارد و پێم ووت: من بڕوا بەو قسانە ناکەم کە لەبارەی باوکمەوە دەڵێن. (بە ڕووداوی ئۆتۆمبێل بووە)

...دوای پێداگرتنێکی زۆر.. کارەساتم بیست.. وتی: من و ئەو شەومان بەسەر برد و مەیمان دەخواردەوە و کچانمان لەگەڵدابوو.. ووتم: ئەو کچەی لەگەڵ مندایە جوانترە لەو کچەی کە دێت و لەگەڵ تۆدا دادەنیشێت.. ووتی: تۆ هێشتا نەت بینیوە.. ئێستا دێتە ژوورەوە.. کاتێ هاتە ژوورەوە لەوپەڕی جوانیدا بوو.. باوکت هەستایەوەو پاشان سوجدەیەکی برد بۆ جوانی ئەو ئافرەتە.. کاتێ کە لەسوجدەدا بوو.. من بانگم دەکرد بەڵام وەڵامی نەدەدایەوە.. زیاد لە جارێ بانگم کرد هیچ نەبزوا.. چووم رایوەشێنم بینیم مردووە.. لەکاتی سوجدەبردن بۆ ئەو کچەدا مرد.. دوای ئەوەی گوێم لەو کۆتاییە چارە ڕەشەبوو زۆر گریام...

چەند ڕۆژێك هەر دەگریام، پاشان دەست نوێژم گرت و نوێژمکرد.. وە داوای لێخۆشبوونم بۆ کرد.. پاشان حیجابم پۆشی.. داوام لە پەروەردگارم کرد کە ئایندەی کردەوەکانم بەچاك بگێڕێت... خوایەگیان... ئامین

## ٥٠- ﴿مردنم بینی﴾

ژیانی مرۆڤ بەچەندین هەڵوێستدا دەڕوات کە بەشێوەیەکی دروست کاریگەریی دەبێت لەسەری (با کاریگەریەکەش کاتیی بێت).. وای لێدەکات بگەڕێتەوە بۆلای خواو هەست بە مەزنی و گەورەیی و فەزڵ و ڕەحمەتی ئەو زاتە بکات بەسەر بەندەکانیەوە.. لەم بەسەرهاتەدا یەکێ لەو هەڵوێستانەتان بۆ باس دەکەم تاوەکو ئاشنابین بە فەزڵی خوای گەورە بەسەرتانەوە..

لەڕۆژێکی وەرزی هاویندا من ماوەی مەشقکردنم بەسەر دەبرد لەیەکێ لە کۆمپانیا مەزنەکانی داودەرماندا، یەکەم ڕۆژی مەشقکردنم بوو.. لەنیوەڕۆدا هەستم بە کەمێك ناڕەحەتی و بێتاقەتی کرد، بەڵام دانم گرت بە خۆمداو وام زانی بێتاقەتیەکی سادەیە، بەڵام لەکاتی ڕێگاکردندا ماندوێتیەکەم زیادیکرد و هەستم بە لەرزینێکی سەخت کرد لە جەستەمدا، تا ئەو ڕادەیەی نەم دەتوانی ڕێبکەم، پەیوەندیم کرد بە براکەمەوە، بۆ ئەوەی بێت و بمگەیەنێتەماڵەوە، هەرچەندە ئەوشوێنەی من قسەم تیادا دەکرد لەگەڵ براکەمدا نزیك بوو لە ماڵمانەوە، زۆر دواکەوت نازانم هەر بەڕاستی دواکەوت یان نا.. بەڵام من هەستم کرد کە ناتوانم چاوەڕوانیشی بکەم، زۆر بە ناڕەحەت ئۆتۆمبێلێکی تەکسیم ڕاگرت تا بمگەیەنێتە ماڵەوە، کاتێ چوومە ژوورەوە هیچ قسەم نەکرد، بەڵکو چوومە ژورەکەی خۆم و خۆمدا بەسەر جێگەکەمدا.. وورده وورده هەستێکی سەیرم لا دروست بوو.. ئەوە مردنە!!!

هەستمکرد خەریکە گیانم لە جەستەم جیا دەبێتەوە تا ئەو ڕادەیەی هەست بە بوونی قاچم و دەستم ناکەم.. هەستێکی سەیرم لا دروست بوو.. هەرچیم خواردبوو هەڵم هێنایەوە... زۆر بەناڕەحەتیەوە هەستام تاوەکو دەست نوێژ بگرم و دوو ڕکات نوێژ بکەم.. ئاە، مردن چەندە نزیکە لێمانەوە، لەهەر ساتێکدا بێت یەت... ئایا کاتێك بۆت دێت کە تۆ گوێڕایەڵی خوا دەکەیت، یان پەنا بەخوا سەرپێچی خوا دەکەیت؟

دوای نوێژ هیچم شك نەبرد بیکەم تەنها ئەوە نەبێ خۆم بدەم بە دەستەوەو تەواو دڵنیابووم کە ئەوە مردنە... لەسەر زەویەکە خەوتم و ڕوومکردە قیبلە ((ڕەوگە)) هەستم دەکرد بەگیانم کە دەردەچێت لە قاچمەوە بۆ ئەژنۆم پاشان لەدەستمەوە تا گەیشتە بینەقاقام...

لێدانی دڵم وەستاو هەروەها هەناسەدانیشم وەستا.. لەوکاتەدا دایکم و خوشك و براکانم خۆیانکرد بە ژووردا.. زۆر بەهێزەوە ڕایان دەوەشاندم و بانگیان دەکردم.. بەڵام تازە پاش چی.. وەڵام نەبوو.. دایکم بە براکەمی ووت کە بڕوات پزیشك بێنێت.. من بەخۆم دەوت پزیشك چی دەکات؟.. نەڕۆی برام هیچ سودێکی نیە. شریتی یاداوەری بە بیروهۆشمدا دەسوڕایەوە.. من چەندجار گوێڕایەڵی خوامکردووەو چەند جار سەرپێچیم کردووە؟ چیم کرد بە دنیا؟ ئایا دنیا مەبەست بوو یان هۆکار بوو؟ کوا هاوڕێکانم؟ کوا ئەو هێڵە وەنەوشەییانەی بۆ ئایندەی خۆت دەتکێشا؟ چی.. و چی.. و چی.. پزیشك هات.. دوای پشکنین و تەماشاکردن ووتی: بێئومێد مەبن.. من هەستم دەکرد کەبەتەواوی چووم بۆ ئەو دنیا.. ئەم پیاوە هیچ سودێکی نییە.. پزیشکەکە ئیسپرتۆی بەکارهێنا تا بەئاگا بێمەو.. بۆچەند ساتێ بەئاگاهاتمەوە بەڵام جارێکی تر کەوتمەوە.. چەند ووتەیە بەزارمدا دەهات بۆ نموونە.. تەواو.. وازم لێبێنن.. جارێکی تر بە ئاگا هاتمەوە و دووبارە کەوتمەوە.. بۆ جاری سێیەم بەئاگا نەهاتمەوە، پزیشکەکە جارێکی تر هەوڵی دایەوە و منیش بە ئاگا هاتمەوە.. بەڵام هەستم لێبڕابوو، هەستم کرد کە چەند ساتێکی کەمەو مەرگ بە دڵنیاییەوە بومتە میوانم.. نەمزانی دوای ئەوە چی ڕوویدا بەڵام بۆ نزیکەی (١٥) سەعات خەوتم پاشان بە حاڵەتێکی کەمێك باشترەوە خەبەرم بوویەوە.. چووم بەقۆناغی چارەسەرکردندا...

پاشان ڕاهاتنەوە لەگەڵ دنیادا.. بەڵام هەرکاتێ قیامەتم بیردەچێت بیر لەو کارەساتە دەکەمەوە تاوەکو بزانم کە چەندە پەروەردگارم میهرەبانە.. وەچەندە مردن نزیکە.. لەگەڵ ڕێزم بۆ هەموو تیبێبینی پزیشکەکان.. چونکە من دڵنیابووم کە ئەو کارەساتە ئاگادارکردنەوەیە بوو لە خوای گەورەوە بۆ من تاوەکو لە تاوان دوور بکەومەوە و لەکۆتاییدا بگەڕێمەوە بۆلای پەروەردگارم.. داواکارم لێتان ئەم چیرۆکە بێتە پەند و ئامۆژگاریی و تێگەشتن لە ماناکانی و هەموو شتێك تەواو دەبێت (پشت بەخوای گەورە) تەنها کردەوەی چاك نەبێت..

## ٥١- ﴿تەوبەیەك دڵی لاوێك لە تاریكیەكانی (بانكۆك) دا ڕووناك دەكاتەوە﴾

لاوێك بیست و سێ ساڵی تەمەنی تێ نەپەڕاندبوو ، سەفەری كرد بۆ بانكۆك بە دوای چێژ و تامی كاری حەرامدا ... لەوێ دەستی كەوت بەڵام ئەگەر فەزڵ و تەدارەك و چاودێری خوای گەورە نەبوایە كە لە دواهەمین ساتدا فریای كەوت تیادەچوو ....

لاوە كەنداویەكان لە (بانكۆك) ئاشنایان كرد بە حەشیش ، چونكە جگەرەی حەشیش جیانەدەبوویەوە لە پەنجەو لێوی .

بۆیە لە ئەنجامدا وازیشی لە خوێندنی زانكۆ هێنا .... ئەو حەشیشە ئالەبارە ناچاری كرد خۆی سەرقاڵ بكات بە پیشەیەكەوە ... بەڵام چ پیشەیەك ؟

خۆی دەڵێت ئێمە یانزە برا بووین ، من یەكێك بووم لەو برایانەی كە لە ناو هەمویانەدا سەفەرم كرد بۆ ئەوێ ... سەفەری یەكەمم پێش نزیكەی ساڵێك بوو دوای دانیشتن لە گەڵ هاوڕێكانمدا كە باسی خۆشیەكانی (بانكۆك) یان دەكرد !!! لە میانی یەك ساڵدا حەوت جار سەفەرم كرد ، كە هەمووی دەیكردە نۆ مانگ !!!!

سەرەتای گەشتی من لە گەڵ مادە هۆشبەرەكاندا لە یەكەم گەشتدا بوو بۆ ( بانكۆك ) لە ناو فڕۆكەكەدا ، كاتێك یەكێك لە هاوڕێكانم كە پێنج كەس بوون و منیشیان لە گەڵدا بووم، پەرداخێك بیرەی یا بە دەستمەوە ، منیش گوێم نەیایە،بۆیە پێی ووتم: ئەم پەرداخەی تریش بگرە و ئەمەیان جۆرێكی تر دەبێت بەلاتەوە ، منیش لە دەستم گرت ، بۆیە ئەمە سەرەتای موعتاد بوونم بوو بە مادە هۆشبەرەكان ، چونكە جۆرێك لە جۆرەكانی مادە هۆشبەرەكانی تێدا بوو كە پێیان دەووت (كنشە )

هەر كە گەشتمە وولاتی خۆمان ئۆتۆمبێلەكەم فرۆشت و گەڕامەوە بۆ بانكۆك ... هەركە گەشتمە ئەوێ پرسیاری (كنشە) م كرد ... زۆر بە خەستی دەمكێشا ... وازم نەهێنا بەڵكو ئەگەڕام و جۆرەكانی تری مادە هۆشبەرەكانم بەكاردەهێنا ، بۆیە ( كۆكاین ) یشم تاقی كردەوە بەڵام سەرسام نەبووم پێی ، وە هەروەها حەبی ( كبتیجۆل) یشم تاقی كردەوە ، بەڵام هەر حەزم لێ نەدەكرد . من بە دوای چێژو تامێكی تردا دەگەڕام كە لە كنشە بكات یان لەو باشتربێت بۆیە دەستم نەكەوت ،

سەرەنجام گەڕامەوە بۆ وولاتی خۆمان !!! لە مالی یەکێك لە هاوڕێکانم کە یەکەمجار گەشتم کردبوو لە گەلیدا ، لەوێ حەشیشم دەست کەوت و بەکارم هێنا.

نرخەکەی گرانتر بوو .. بە هۆی کەم دەرامەتیەوە ناچاربووم کە براکەم هەلخەلەتێنم ، وای نیشان بدەم کە یەکێ لە هاوڕێکانم داوای پارەم لێ دەکات کە پێشتر قەرزم کردبوو لێ .... بۆیە براکەیشم ئۆتۆمبێلەکەی خۆی فرۆشت و پارەکەی پێدام ... منیش بڕێك حەشیشم پێ کڕی و سەفەرم کردەوە بۆ بانکۆك .

کاتێك گەڕامەوە بۆ وولاتی خۆمان ، بە دوای جۆرێکی تردا دەگەڕام کە بەهێزتربێت لە (حەشیش ) ... سەفەرم کرد بۆ وولاتێکی عەربی بۆ بەدەست خستنی زەیتی حەشیش ، لە گەل زەیتی حەشیشدا منیش بەرەو تیاچوون ڕۆشتم ... نەمدەتوانی دەست بەرداری ببم ...ڕۆچووبووم لە بەکارهێنانیدا ... لە گەل خۆم بردم بۆ بانکۆك ... ئەو جگەرەیەی کە چەورم دەکرد پێی لە لێوەکانم نەدەبوویەوە ... لەوێ هەموان منیان بە موعتاد بوو بە حشیشەوە ناسی بوو ، لەشم توشی نەخۆشی مەترسیدار بوو بوو بە هۆیەوە .... سوپاسی خوا دەکەم کە شیفای پێ بەخشیم ...

هەرگیز بە بیرمدا نەدەهات کە ڕۆژێ لە ڕۆژان چاك دەبمەوە و ڕزگارم دەبێت لە زەیتی حشیش .

پارە تاکە کێشەی من بوو ... لە کوێوە دەستم دەکەوێت ؟ ناچار بووم پەنا بەرمە بەر ڕێگای دزی و ڕاو و ڕووت کردن ... تا ئەو ڕادەیەی ریشم هێشتبوویەوە و پۆشاکم کورت کردبوویەوە تاوەکو نیشانی خزمانمی بدەم کە من گەڕاومەتەوە و تەوبەی تەواوم کردووە ... بۆیە دەستم کرد بە قەرزکردنی پارە لێیان ... دزیشم کرد لە خالم و مامم ... هەندێ هاوڕێشم هاندا کە سەفەر بکەنەوە بۆ بانکۆك تا منیش لە سەر خەرجی ئەوان سەفەر بکەم لە گەلیاندا .... بەلکو لە بانکۆکیش بووبوومە جەردە و دەستبڕ ، دزیم لەو لاوانە دەکرد کە لە کەنداوەوە سەفەریان دەکرد و دەهاتن و دەستم دەگرت بە سەر کەلوپەلەکانیاندا ..... پیاوە بە تەمەنەکانی خەلکی کەنداوم هەلدەخەلەتاند و فێلم لێ دەکردن، پارەکانیانم چنگ دەخست هەتا تایلەندیەکانیش بە زمانێکی تایلەندی شەق و شڕ هەلم دەخەلەتاندن و پارە و پولم لێ دەسەندن !!!

بانکۆکم جێ نەهێشت ، چونکە کارەکەم ( مەبەستم پیشەی چەتەییە ) لەوێ بوو

بەراستی بیرم لەژیانێکی سەقامگیری و هاوسەرگیری دەکردەوە لە گەڵ ئافرەتێکی تایلەندیدا، تا ڕەگەزنامەی تایلەندیم دەست بکەوێت و هەتا بەردەوام لەوێ بمێنمەوە.

لە بواری حەشیشدا بووبووم بە پسپۆڕ ، دەمتوانی حەشیشی ساختە و حەشیشی ئەصلی لە یەکتری جیا بکەمەوە ... ڕۆژگار تێ پەڕین و هەرچیم هەبوو لە دەستمدا ، کەسم شك نەدەبرد قەرزی لێ بکەم ... هەموو براو هاوڕێ و خزمەکانم زانیبویان کە من دەستبڕم، کەسم شك نەدەبرد تا چاو ساغم بێت بۆ ماڵ و سامانێك کە بیدزم دنیا لە بەرچاوما تەسك بوویەوە و پەتم هەڵخست خۆم بخنکێنم ، دوای ئەوەی شوشەیك عەترم خواردبوویەوە تا سەرخۆشم بکات ... بەلأم براکەم پێی ووتم تۆ بێ ئەقڵیت ، بۆیە بەو کارە توڕە بوو، دابەزیمە خوارەوە تا ووتوێژ بکەم لەگەڵیدا ، لە ئەنجامدا بۆی سەلماندم کە خۆکوشتن هیچ سودێکم پێ ناگەیەنێت .

سواری ئۆتۆمبێل بووم، سەرخۆش بووم و دوو شت لە مێشکمدا بوو، یان پۆلیس دەستگیرم بکات یان بڕۆم بۆ نەخۆشخانە و چارەسەری خۆم بکەم لەو حاڵەتی موعتادبوونەم کە گیرۆدەی کردبووم .

سوپاس بۆ خوا چووم بۆ نەخۆشخانە و چارەسەریان کردم ...

ئەوەتا ئێستاش من تەندروستیم زۆرباشە و ڕزگاربووم لەو ڕەفتارە پیسە .... تۆبەم کردووە و ئیتر هەرگیز ناگەڕێمەوە سەری .

کتێبی (قصص مؤثرة للشباب)

## ٥٢- ﴿لاوێك﴾

ئەم چیرۆكەتان لە ڕێگەی بانگخوازێكی متمانەپێكراوی باوەڕ بە خواوە بۆ دەگێڕمەوە .... باسی لاوێك دەكەین نكوڵی لە ئاینەكەی دەكات و پەروەردگاری خۆی فەرامۆش كردووە و بێئاگا بووە لە خۆیشی ... لە خراپی و سەرەڕۆییدا بە نمونە باسیان دەكرد ، هەتا بە هۆی ئەوەوە كە ئازاری زۆری خەڵكی دەدا خەڵكێكی زۆر دوعایان لێ دەكرد كە بە هیلاكا بچێت و تیا بچێت تا ڕزگاریان بێت لە خراپەكانی .

هەندێ لە بانگخوازان ئامۆژگاریان دەكرد بەڵام وەری نەدەگرت ، گوێ ی نەدەگرت لێیان ، لە ناو تاریكیەكانی شەهوەت و ئارەزوودا دەژیا .... یەكێ لە بانگخوازان چوو بۆ لای و ئەو بانگخوازە كەسێكی كاریگەری ڕاستەوخۆ بوو چەند ئامۆژگاریەكی كرد هەتا هێنایە گریان و وا گومانی دەبرد كە هاتووە بە دەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەكەیەوە (ﷺ) بەڵام سودی نەبوو ، دیسان وەك خۆی لێ دەهاتەوە وەك ئەوەی هیچیشی نەبیستبێت ... نەیدەزانی مزگەوت چیە ، بەڵكو لە ڕۆژی هەینیشدا ... دوای عیشا لە گەڵ پێرێكی وەكو خۆیدا دەچووە دەرەوە و كەمێك پێش بەرەبەیان دەگەڕایەوە و پاشان بە درێژایی ڕۆژ دەخەوت ، وازی لە فەرمانبەری و كارەكەی هێنابوو ... لەم دنیاو لەو دنیاشدا تاپول (افلاس) بوو بوو ، دایكی هەمیشە چاو بە فرمێسكەوە دەبوو بۆ ڕەنجەڕۆیی و واقیعی كوڕەكەی بەڵكو زۆر حەزی دەكرد كە بمردایە .

بەدەم گۆرانیەوە دەخەوت و هەر بەوەیش خەبەری دەبوویەوە .... چەندین وێنەی سێكسی و ڕەوشت نزمی لە لا بوو .. كە ئیمانی خەڵكی شارەكەی لە ناو دەبات . بەڵكو دەركەوتبوو كە موعتاد بووە بە مادە هۆشبەرەكانەوە و عەقڵ و ڕۆحی مەست بووە ..

سەرەڕۆییەكەی بەرامبەر بە خوا درێژەی كێشا بوو، خوای گەورەش مۆڵەتی پێدابوو ... تاوانەكانی زۆربوو بوون و ڕۆژی خوای گەورەش دەورەی دابوو، گوێی لە هەموو شتێك دەگرت بێجگە لە قورئانی پیرۆز ، وە لە هەموو شتێك تێدەگەیشت تەنها لە ئاین و دینداری دا نەبێت .... حەزی لە هەموو شتێك بوو تەنها زیكری خواو ئەو جۆرە شتانە نەبێت .

سبحان الله دڵ چۆن سەرگەردان دەبێت ئەگەر خوا نەناسێت ... سبحان الله چۆنە هەست و نەست بێئاگاو گێل دەبێت ئەگەر پشت بکاتە خوای گەورە .... ڕۆژە ڕەشەکانی بە تاوان و سەرپێچی دەبردە سەر ، یەکێ لە بانگخوازە پیاو چاکەکان بیری لە ڕێگایەکی خۆش دەکردەوە تا ئەو سەرگەردانە بێنێتەوە ڕێگای ڕاست ، کە بەڕاستی ڕێگایەکی داهێنراو بوو، من لێرەدا ئامۆژگاری بانگخوازان و شاگردانی زانست و ئامۆژگاریکاران دەکەم کە ڕەچاوی ئەو شێوازە بکەن ، ئەویش ڕێگای بە دیاری پێشکەش کردنی کاسێت و سیدی ئیسلامیە کە لە ماڵەکانداو لە ئۆتۆمبێلەکاندا هەبێت ... کاسێت و سیدی ئیسلامی کە زانست و سەدا و کاریگەری قسەکەر دەگوازێتەوە بۆ گوێگر ...بۆیە چەند کاسێتێکی پێشکەش بەو لاوە کرد کە کاریگەربوون ، ئەویش وەری گرت و خستیە ئۆتۆمبێلەکەیەوە و گوێی نەدەدا بە گوێگرتن لێیان .. گوێی لە گۆرانی و شتی بێ کەڵك دەگرت و بە ڕێگای خراپدا گوزەری دەکرد ... پاشان ویستی کاسێتێکی ئیسلامی تاقی بکاتەوە و گوێی لێ بگرێت ، تا بزانێت ئەو جۆرە کەسانە چۆن قسە دەکەن و شێوازی ووتار و قسەکردنیان چۆنە کاسێتەکە دەستی کرد بە ناردنی شەپۆلە زیندووەکانی ئیمان لە هەوایەکی ڕاستگۆیانەدا ڕاستەوخۆ بە کاریگەری و دڵسۆزی و بە شەپۆلێك کە پانتاییەکەی پەیامێکی نەرمە بۆ گوێگرانی .

لاوەکە گوێی لە شریتەکە گرت ، ووتارەکە باسی ترسان لە خوای گەورەی دەکردو هەواڵی ئەوانەی کە لە خوا دەترسن .... قسەکان گەیشتنە دڵی لاوەکە و لە دڵیدا سەقامگیربوون .. شریتەکە کۆتایی هات و لاوەکەش خۆی ئامادە باش کرد و پێداچوونەوەیکی خۆی کرد لە گەڵ خوای گەورەدا و هاتەوە بە خۆیدا و دەستی کرد بە لێدانی کاسێتی دووەم ....کاسێتی دووەم باسی تەوبەکردن و تۆبەکاران بوو ، لاوەکە بیری لە ڕابردووی خەفەتاوی و گریاناوی خۆی دەکردەوە ، بەردەوام گوێی لە شریتەکە گرت ... گریانیش نمایشێك بوو بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاریەکان لە بەردەم دڵداو وەك ئەوەی زمانی حاڵ ئەمە بڵێتەوە ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ الأنفال/٢٤ واتە :﴿ ئەی ئەو کەسانەی

باوەڕتـان هێنـاوە وەڵامـی خـوا و پێغەمبـەری خـوا بەنـەوە، کاتێک کـە بانگتـان دەکـەن بۆلای ئەو ئەو ئاینەی کە زیندووتان دەکاتەوە﴾

لە شاری (دەمام) نزیك بوویەوە ، خەریك بوو کۆنترۆڵی ئۆتۆمبێلەکەی بۆنەدەکرا بۆ هۆی کاریگەری ئەو شەپۆلە ئیمانیەوە کە بە تەواوی هێنابوویە لەرزین ....

چووە شارەکە و پێش ئەوەش ئیمان چووبووە دڵیەوە ... ژیان لە دیدو بۆچونیدا گۆڕا ، بە تێڕوانینێکی بەندەیەکی تۆبەکارەوە تەماشای دنیای دەکرد کە پێشتر وەك کەسێکی سەرسەخت و سەرەڕۆ دەیڕوانیە دنیا .

سەرەتا چووە مزگەوتەوە و ژیانێکی نوێی بە نوێژ دەست پێکرد و دەستی کرد بە تەمـەنێکی نـوێ {وَقُـلْ جَـاء الْحَـقُّ وَزَهَـقَ الْبَاطِـلُ إِنَّ الْبَاطِـلَ كَـانَ زَهُوقـاً } الإسـراء/٨١.واتـە﴿ وە بڵـێ ئاینی راسـت هـات و ئاینی ناهـەق و بەتاڵنـەما و رۆشـت، بەراستی بەتاڵ هەمیشە لەناو چووە﴾

گەڕایەوە بۆ نـاو کـەس و کـاری بە بێ زیانی و بە دەسکەوتێکی مەزنەوە ... بێ زیانی لە تاوانەکانی و دەسکەوتنی پەرستشەکان .... چووەماڵەوە بە ڕوخسارێکەوە جیا لـەو ڕوخسارەی کـە پێـی هـاتبووە دەرەوە، چونکە بـە ڕوخسارێکی تاوانـاوی و گوناه و سەرکەشیەوە هاتبوویە دەرەوە و بە ڕوخسارێکی سپی و نوری و پەرستش و تەوبە و گەڕانەوەوە گەڕاوەتەوە .

کەسوکاری سەرسام بوون ( فلأن کەس ئەوە چیت بە سـەر هـاتووە ؟ چی ڕوویـداوە ؟ ) باسی مەزنترین ڕووداوی ژیانی خۆی بۆ کردن:گەڕامەوە بۆ لای خواو تەوبەم کردو ئاشنا بوو بە ڕێگای گەڕانەوە بۆ لای خوا ... چاوەکانی پڕ بوو بوون لـە فرمێسك و ئەوانیش لە خۆشیاندا دەستیان کرد بە گریان ...

بەڵێ فرمێسکی خۆشی و شادی .

طفح السرور علي حتى انني * من عظم ماقد سرني ابكاني

واتە: خۆشی لێوان لێوم بوو بوو هەتا * لە مەزنی ئەو خۆشیەدا منی هێنایە گریان

ماڵەکـەیان ڕوونـاك بـوو بوویـەوە و خـەڵکیش پیرۆزباییـان لـە تۆبەکارەکـە دەکـردو مژدە بێت لێ ی بۆ تەوبەکردنی و گەڕانەوە بۆ لای خوا ....

خوای گەورە لە فەرمودەیەکی قودسیدا دەفەرموێ ( یا ابن ادم انك ما دعوتني و رجوتني الا غفرت لك ما كان منك و لا ابالي : يا ابن ادم لو بلغت ذنوبك عنان السماء ثم استغفرني غفرت لك و لا ابالي يا ابن ادم لو اتيتني بقراب الارض خطايا ثم لقيتني لا تشرك بي شيئا لاتيتك بقرابها مغفرة) رواه الترمذي

واتە﴿ئەی نەوەی ئادەم بێگومان تۆ هەرکاتێ لە من پاڕابیتەوە و داوات لە من کردبێت لە هەموو گوناهەکانی تۆ خۆش بووم و گوێشم نەیاوەتێ، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر گوناهەکانت گەشتبنە ئاسمانیش پاشان داوای لێخۆش بوونت لێ کردبم ، لێت خۆش بووم، و گوێم نەیاوەتێ ، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر بە پانتایی زەوی بە گوناهەوە هاتبیت بۆ لام و پاشان گەشتبیتبیت بە من و هیچ هاوەڵێکت بۆ من دانەنابێت منیش بە رادەی ئەوە دێم بۆ لای تۆ بە لێخۆش بوونەوە﴾

شباب عادوا الى الله

قصص مؤثرة للشباب

# ٥٣- ﴿ڕێگای مادە هۆشبەرەکان﴾

ڕێگایەك زۆرێك لە لاوان نوقم بوون تیایدا ... مەگەر کەسێك خوای گەورە ڕەحمی پێ کردبێت..

یەکێك لەو لاوانە بە سەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ دوای ئەوەی ئامادەیم تەواو کرد بووم بە فەرمانبەر لە یەکێ لە کۆمپانیا بازرگانیەکاندا ... بە هۆی زۆر غائیب بوونمەوە و ناڕێکیشەوە دەرکرام لە سەر کارەکەم ... دوای ئەوە چووم سەر چەندین کاری جیاواز لە بیناسازی و بازرگانی و شتی تر .... تا بتوانم خۆم دروست بکەم ...و برێك پارە پێکەوە بنێم ... ڕۆژێکیان لاوێك پێشنیارێکی بۆ کردم ... ئەویش سەفەرکردن بوو بۆ یەکێ لە وڵاتانی ئاسیا ... سی سەیرو سەمەرە و بەسەرهاتی خۆی بۆ کردم لەو وڵاتانە ... پەنا بە خوا بە ئاشکرا باسی کارە خراپەکانی خۆی دەکرد ... لاوەکە وتی : هاوڕێکەم باسی لەزەتە حەرامکراوەکانی دەکرد ... وەك ئەوەی هانم بدات بۆ سەفەرکردن ... هەتا توانی زاڵ ببێت بە سەرمداو شەیتانیش فریوم بدات ... هاوڕێکەم یەکەم کەس بوو پێشوازیم لێ بکات ... بەڵکو هەستا بە کڕینی بلیتی گەشتەکە ... بە مەرجێ من خۆم لەوێ هەستم بە هەموو خەرجیەکانی تر .

پێکەوە شتمان کڕی ... لەوێ چەند کۆمەڵێ لە لاوانمان بینی ... هیچ خەمێکیانە نەبوو .... تەنها هەوڵدان نەبێت بۆ کاری حەرام ... ئەمڕۆ (مسجد الاقصى ) هاوار دەکات و لاوانیش لە گۆماوی تاوان و سەرپێچیدا نوقم بوون

لاوەکە وتی : لەوێ کۆمەڵێکی زۆرمان لە لاوان بینی هەموو خەمێکیان تەنها موتعەی حەرام بوو ... منیش لە لاوەکانەوە فێری بووم ... گوێ بگرە (لە لاوەکانەوە فێری بووم) فێری جگەرەکێشان و مەشروب خواردن و پاشان زیناکردن و پاشان بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان ... کەوتینە ناو هەموو گۆماوە قێزەونەکانەوە .. تا پاشان گەڕاینەوە .... دوای ماوەیەك ... بڕێك پارەی ترمان کۆکردەوە پاشان سەفەرمان کرد بۆ وڵاتێکی تر کە زۆر لەوەی پێشوو فەساد تربوو... هەموو شتێکمان تاقی کردەوە ... شەوێکیان یەکێ لە لاوەکان ڕازی نەبوو ئەو مادە بێهۆشکەرەم بیاتێ کە موعتاد بووم پێیەوە ... بۆیە لە ئوتێلەکە هاتمە دەرەوە ...

گەشتم بە کۆمەڵێ کەس کە برەویان بە مادە هۆشبەرەکان دەدا ... ئەوانیش بانگیان کردم بۆ بنکەکەی خۆیان ... منیش چووم لە گەڵیاندا ... ئەوانیش چەند جۆرێکی زۆر لە مادەی بێهۆشکەریان نیشاندام ... من ئاشنا نەبووم بە هەندێکیان و ڕادەی کاریگەریان لە سەر لەش ... دوای پێدانی مادەی هۆشبەر و مەستکەر ... یەکێکیان بانگی کردم بۆ ژوورەکەی تەنیشتمان ... بۆ کردنی زینا ... دوای ئەوەی کە فەرمانی پێدام لە پێشدا پارە بیەم ... منیش زۆر سەرخۆش بووم نەم ئەزانی چی ئەکەم ... بۆیە پێشنیارەکەم قبوڵ کرد ...

وە نەم ئەزانی کە بەڕاستی من بە پێی خۆم بەرەو فەوتان ئەچم ... پاشان دوای چەند ڕۆژێك .. گەڕاینەوە لە گەشتەکەمان دەستم کردەوە بە ژیانی سروشتی خۆم ... بەڵام دیوەزمەی مادە هۆشبەرەکان لە هەموو لایەکەوە هەراسانی کردبووم .. هەندێ لە کەسانی دڵسۆز هانیان دەدام و ئامۆژگاریان دەکردم کە بچم بۆ نەخۆشخانە بۆ چارەسەکردن ... منیش بەڵێنم دەیانێ و بەڵام نەدەڕۆیشتم ... گەشتەکانم بەردەوام بوون بۆ موماڕەسەکردنی ئەو کارە نا بەجێیانە ... کە بوو بوون بە بەشێك لە ژیان و بێ ئومێدی و داڕوخانی من ...تا پارەم پێ نەما ... ئینجا لێرەو لەوێ فێری پیشەی دزی بووم .... فێری هونەری جەردەیی و ڕوتکردنەوە بووم .... تا پارە بۆ کارە ناشەرعیەکانم کۆبکەمەوە ... لە پڕ هەستم بە ناتەواویەکی تەندروستی کرد بۆیە چووم بۆ بنکەیەکی تەندروستی ... بۆ گەڕان بە دوای چارەسەردا دوای ئەوەی شیکاری خوێنەکەمیان کرد ، پێیان ووتم کە من ڤایرۆسی ئایدزم هەڵگرتووە ... بۆیە دنیا لە بەرچاوما بچوك بوویەوە ... ئای چ کارەساتێکە ... چ مەینەتیەکە ..

بەڕاستی ئەو خۆشی و ڕابواردنانە لە دەست چوون ...

..

هیچ نەمایەوە بێجگە لە ئازار و حەسرەت و دادو بێدادی نەبێت ... ئای دادو بێداد لە هاوڕێیانێك کە سوودیان نەبوو بۆم .... دادو بێداد لە دۆستانێك شەفاعەتیان بۆ نەکردم ... دادو بێداد لەو ڕۆژانەی کە شەوە سوورەکانمان تیا دەبردە سەر ....توێشووم پێ نەبوو بۆ ناو گۆڕەکەم .... ئای دادو بێداد لەو تەمەنەی بە سەر چووە ، وە لەو زەمەنەی ڕۆیشت و ناگەڕێتەوە ... وە خۆم نەپاراست لە گەرمای ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ ... دادو بێداد... بەڕاستیەکان دەرکەوتن لە

گوناهەکانی زمان و سەرپێچی ئەندامەکان ... دادو بێداد لەو تاوانانەی کە لە نامەی کردەوەکانمدا تۆمارکران ... دادو بێداد لەو نوێژانەی کە لە کیسم چوون و لەو زەکاتەی کە نەم دەبەخشی و لەو ڕۆژوانەی کە نەم دەگرتن و لەو کاتانەی کە بە بێ سود بە سەرم دەبرد و لەو تاوانانەی ئەنجامم دەیا ... دادو بێداد لەو بێرەوشتیانەی ئەنجامم ئەیا ... دادو بێداد لەو ڕۆژانەی کە تیایدا هەرگیز یادی خوام نەدەکرد و ئەندامەکانم سوپاس گوزار نەبوون ... حەسرەت بۆ ئەو ڕۆژەی صالحان بە پلەکانیان سەردەکەون... حەسرەت بۆ ئەو ڕۆژەی زاڵمانیش دەخرێنە کەلێنەکانی دۆزەخەوە ...

خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ﴾

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ﴾

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ﴾

﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ(٣٩)إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ الأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ(٤٠)﴾ مريم

واتە﴿ ئەی محمدﷺ ئەو ستەمکارانە لە ڕۆژی داخ و خەفەت بترسێنە، کاتێ کاروباری خەڵی کۆتایی پێ دەهێنرێ لە کاتێکدا ئەوان لە بێئاگاییدان و باوەڕیش ناهێنن بە ڕۆژی دوایی، بەراستی هەر ئێمە دەبینە میراتگری زەوی و ئەوەی لەسەریەتی، وە هەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە﴾

لاوەکە ووتی : ئەو خۆشیانە و ئەو خۆشی و لەزەت و چێژانە ڕۆشتن و هیچ نەمایەوە بێجگە لە ئازار و حەسرەت نەبێت ... هیچ نەمایەوە تەنها تاوان و گوناە و خراپە نەبێت ئەمە بە سەرهاتی من بوو بە کورتی ...

هەموو ئەو شتەی کە من بیزانم .. ئەوەیە کە بەڕاستی من تووشی ئایدز بووم ... و بەڕاستی چاوەڕوانی مردن دەکەم ... هەرچەندە من بە خێرایی بەرەو مردن دەڕۆم ، قەیناکە ... چونکە من لەو بێئاگاییەم خەبەرم بوویەوە ... و ئامۆژگاری هەموو لاوێکی ژیر دەکەم ... کە پابەند بن بە تەعالیمەکانی ئاینی پیرۆزەوە ... ئەو تەعالیمەی کە هەمیشە گوێمان لێیەوە دەبوو ، بەڵام شوێنی نەدەکەوتین ، بەڵکو شوێنی دەروون و

هەواو ئارەزوو و شەیتان ... دەکەوتین .. بەڕاستی سەرگەردانە ئەو کەسەی کە ( شوێن ئارەزوەکانی دەروونی دەکەوێت و هیوا و ئاواتەکانیشی لە خوا دەخوازێت)

بە برادەرەکانم دەڵێم ... ئاگاداربن .. مادە هۆشبەرەکان و کاری ناشەرعی و خراپە کاری سەرەنجامی تیاچوون و نەمانە ... ئاگاداری هاوڕێی خراپ بن ... چونکە بە ڕاستی ئەوانە سەربازی ئیبلیسی نەفرەت لێکراون .

دەڵێت : دەتان سپێرم بەو خوایەی کە سپاردە زایە ناکات... بەڵکو ئەو ووشانەی من بخوێننەوە کاتێك کە من لە ژێر گڵدام ... داوا لە خوا بکەم بەزەیی پیاما بێتەوە و ڕەحمم پێ بکات.

بەڵکو ئەم ووشانەی من بخوێننەوە کاتێك منە لە ژێر گڵدام و ڕۆحم لە جەستە جیابۆتەوە و ڕۆح بەرزبۆتەوە بۆ لای پەروەردگاری

پەروەردگارا ... ئەی ئەو زاتەی کە ڕەحمەت و بەزەییت هەموو شتێکی گرتۆتەوە بەزەیت بە بەندەی لاوازی هەژاری خۆتدا بێتەوە ...

کتێبی﴿قوافل العائدین﴾

# ٥٤- ﴿خوشكی خۆمم كوشت﴾

(حەنان) كچێكی هەرزەكاری تەمەن ١٨ ساڵ بوو.. بە خۆشی و شادی و دەوڵەمەندی لە گەڵ كەسوكاری دەژیا ، هەموو خەون و ئاواتێكی ئەوەبوو ببێت بە مامۆستا یان پزیشك كە بە پەنجە ئاماژەی بۆ بكەن و هاورێكانی و خزمانی بە چاكە لە كۆڕ و كۆبونەوەكاندا باسی بكەن ، لە سەرەتای قۆناغی زانكۆدا ئاشنا بوو بە هاورێیەكی خراپ كە خاوەنی رەوشتێكی خراپ بوو لە گەڵ كەسوكاری ، ئەم پەیوەندیەی لە گەڵ هاورێكەیدا ، یەكەم جار بە پەیوەندیەكی تەلەفونی دەستی پێكرد و لە رێگەی مۆبایلەوە ، پاشان سەردانی یەكتری لە ژێر ناوی شاراوەدا بە ناوی ئاهەنگ و شتی ترەوە !!! ئاستی خوێندنی حەنان دابەزی بە شێوەیەكی ئاشكرا دەركی پێ دەكرا لە لایەن دەوروبەرەكەیەوە ... بە تایبەتی خوشكە گەورەكەی ... ئەو كچە دەڵێت : لە یەكێ لە ساتە جەرگبڕەكاندا هاورێكەم سەری لێیام ، منیش شەكەت بووم بە هۆی سەرئێشەوە لە ئەنجامی سەعی كردنی بەردەوام و كەمی خەو لە تاقی كردنەكاندا ... ئەویش حەبێكی پێیام و پێی ووتم : نیو سەعاتی تر دەبیتە (حەنان)ێكی تر ... بۆیە بە گوێم كرد و حەبەكەم خوارد ... لەو ساتەوە موعتادبوونی من دەستی پێكرد كە بەراستی نەم نەتوانەی دەست بەرداری ببم بۆ ماوەی دوو رۆژ ... بۆیە بەردەوام داوام دەكرد لە هاورێكەم بۆم پەیدا بكات .... ئەویش پێی ووتم : دەرمانی تر هەیە زۆر خۆشتر و بەهێزترە لەوە . ماوەكەیشی درێژ خایەنترە ... بەڵام نرخەكەی گرانترە ، منیش پارەیەكی زۆرم پێدا ... هەموو ئەو پارەیەش لە رێگای دایكمەوە بوو كە هەندێ جار درۆم لە گەڵدا دەكردو هەندێ جاریش لێم دەدزی ... درێژەی پێ نایەم ... كارەكە پەرەی سەند ... خوشكە گەورەكەم پێی زانیم كە موعتاد بووم بە مادە هۆشبەرەكانەوە ... بۆیە هەرەشەی لێكردم كە بە دایكم و باوكم دەڵێت ... منیش رام دەكرد لێی ... بۆ سبەینێ هەواڵی ئەوەم یا بە هاورێكەم ... هەردوكمان ترساین كە كارەكەمان ئاشكرا بێت و لە قسەی خەڵكیش دەترساین ... بۆیە بیرمان لە بیرۆكەیەكی شەیتانی كردەوە ... ئەویش ئەوە بوو خوشكەكەم تێوە بگلێنین بە خۆمانەوە و بە بێ ئاگای خۆی حەبێك بكەمە چاكەیەوە ... كە لە كاتێكدا ئەو خوشكێكی دڵسۆزی من بوو، هەرگیز خراپەی منی نەدەویست ... بەڵام لە راستیدا

هاوڕێ خراپەکەم و ڕاوێژە گلاوەکەی لە سەدا سەد سەرکەوتنی بە دەستهێنا ، بۆیە منیش بە کوڵ گریام و پێش ئەوەی فرمێسك بە چاومدا بێتە خوارەوە خەریك بوو ڕۆحم دەرئەچوو ...

چیم کرد بە خوشکەکەم ؟؟ و بۆچی ؟؟ کێ سودمەندە لێرەدا ؟؟ من زۆر گریام خوشکەکەم هات و فرمێسکەکانی سڕیم و ووتی : مەگری خوشکی خۆم ، بە خوا هەرگیز ناڵێم بە دایك و باوکم، من تۆم خۆش ئەوێ !! لەو کاتەدا لە پاکی و سۆز و دڵە بێگەردەکەی دەستی کرد بە گریان ، وە لە بیرم چوو کە خوشکەکەم ئێستا موعتادە و کەسوکارم دەزانێت و ئەی چی بکەم ؟

زۆر ترسام و شڵەژام، من و خوشکەکەم کەوتینە گێژاوێکەوە کۆتایی نەبوو ، دەرگاکەم لە سەری داخست هەتا حاڵەتی ناتەواویەکەی هێور بێتەوە .. لە پڕ باوکم خۆی کرد بە ژووردا و زانی کە مادەی بێهۆشکەری خواردووە ، بۆیە لە بەردەممدا زۆر بە توندی لێیدا ، کە دەبوایە یەکەم جار بە توندی لە منی بدایە ... چونکە خوشکەکەم بێتاوان بوو ... دایکمی بانگ کردو لە بەردەمماندا ئیهانەی کرد ... خوشکەکەم لە حاڵەتێکی زۆر نالەباردابوو، باوکم لە ماڵەوە بەندی کرد تا کەس بەو حاڵەتە نەزانێت و حەیامان نەچێت ... بەڵام لە ژێر داکۆکیکردنی دایکمدا تەنها ڕێگەی پێدرا بڕوات بۆ زانکۆ !! خوایە گیان ، چەندە چارەنووسێکی خراپ بوو!! لە چەند سەعاتێکی کەمدا خوشکەکەم نارد بۆ ڕێگایەکی تاریکستان لە پێناوی مادەی هۆشبەر و هاوڕێ و شەیتان و ئارەزوودا ... تەنها دوای دوو ڕۆژ خوشکەکەم هات بۆ لام و ئەو چایەی هێنامەوە یاد کە بۆم ئامادەکرد ، کە زۆر حەزی لێ بەتی و ئەیەوێ چایەکی تری پێ بەم ... منیش بە توندی بەر پەرچم دایەوە ، بەڵام ئەو هەر سووربوو لە سەر ئەوە و پاڕایەوە لێم و دەست و قاچەکانی ماچ کردم ... وە چۆن منیش یەکەم جار وام کرد لە گەڵ هاوڕێکەمدا ... بۆیە چایەکی ترم بۆ ئامادە کرد ... بەو شێوەیە هاوڕێکەم ئەو مادەیەی بۆ دابین دەکردین هەتا خوشکەکەم بە شێوەیەکی بەرچاو لە خوێندندا دواکەوت .... ڕۆژێکیان پیاوانی ئاسایش باوکمیان بانگ کرد لە بەشی لێکۆڵینەوە ، ووتیان کە هاوڕێکەم کە برەوی بە مادە بێهۆشکەرەکان دەدا گیراوە و دانی ناوە بە من و خوشکەکەمدا ، بۆیە هەردوکمانیان گرت و کەوتینە گێژاوەوە لە گەڵیدا، بە کورتی

منیش بەند کرام لە گەڵی، چونکە بەشداربووم لە فرۆشتنی و برەو پێدانی لە نێو هاوڕێکانماندا ...

درێژەی پێ نایەم ، دادوەر فەرمانیدا کە من بەند بکرێم بۆ ماوەی سێ مانگ ، بۆیە کەوتینە گێژاوێکی درێژەوە ، و من ئێستا ئەسرینێکم لە ئەسرینی ئافرەتە بەندکراوەکان .... لێرە لە بەندیخانەدا چارەسەری گونجاو دەکرێین ، من و هەموو ئەوانەی وەك من وان ... خێزانەکەمان بەو هۆیەوە ژیانێك بەسەر دەبەن پڕیەتی لە ئیحراجی و دڵەڕاوکێ لە ئەنجامی ئەو کردەوەیەی مندا ؟؟ و ئەوەی منی برد بۆ ئەو هەڵدێرە مەترسیدارە کە بە هۆیەوە خوشکی بێتاوانم بویە قوربانی کە هیچ گوناهێکی نەبوو ... پاشان من ژیانی ئایندەم چۆن بەرمە سەر کە هەمووی شایەتیە لە سەر تاوان و هەڵە ، چۆن نا، من زوڵمم لە خۆم و خوشکەکەم کرد ؟! بەڵام ئەمە پەیامی تەوبەکردنی منە و لە ڕێگای ئێوەوە بڵاوی دەکەمەوە و پەیمان دەیەم بە پەروەردگارم کە ئیصلاحی ڕۆژانی ڕابردووم بکەم بە پێی توانام ، تا برینەکانی کەسوکارم کەم بکەمەوە، بەڵام سەرەنجامی ئەوانەی دەبنە هاوڕێ ی کەسای خراپ و موعتاد، دەبن بە مادە هۆشبەرەکانەوە شوێن پیلانی شەیتانی نەفرەت لێکراو دەکەون کە زۆرێك لەماڵەکانی تێکداوە و زۆرێك لە لاوانی کوڕ و کچی سەرگەردان کردووە و چەندین خێزانی یەکالاکردۆتەوە و کۆمەڵگاکانی تێکداوە ... فیتنەی سەردەم و ناوە بریق و باقەکانی و تەپ و تۆزی دەنگە هەراسانکەرەکان ئافرەتانی نمونەی من بانگ دەکات تا پابەند نەبن حوکمەکانی ئەم شەریعەتە پاکەوە و دوورنەکەنەوە لە مادەی بێهۆشکەر بە ناوی مەشروباتی ڕۆحیەوە و کەیف خۆشیەوە بە کاری دەهێنن .... ئەمانە هەڵخەڵەتاندنێکی بە کرێگیراون و پلان بۆ دارێژراون کە ئامانج لێ ی لە خشتەبردنی کوڕان و کچانی ئەم کۆمەڵگایەیە کە پابەندن بە شەریعەتەوە و بە بنەما باڵاکانی ئیسلامەوە و داوێن پاکن و ڕەوشت و کەرامەتی خۆیانیانە پاراستووە .وە سوپاس بۆ ئێوەش

کتێبی ﴿دموع السجينات﴾.

## ٥٥- ﴿دانپیانانەکانی ئافرەتێکی موعتاد بوو﴾

لە ساتێکدا کە پڕ بوون لە خەم و خەفەت و بێدەنگیەکی تۆقێنەر باڵی بە سەر دا کێشا بووم، من خرامە بەندیخانەی ئافرەتانەوە لە بەشی مادە هۆشبەرەکان ... لە گەڵ چەند کچێکی تری هاوڕەگەزی خۆمدا خرامە ناو چوار دیوارەوە ، کە بەڕاستی ساتانێکی قورس بوو بۆ سەر دڵی من کاتێك کە بێ بەش بووم لە تەماشاکردنی ڕوخساری ئەو دایکەم کە هەمیشە بەرامبەر بە من دەم بە خەندە بوو ، هاوکات لە گەڵ دەنگە دەنگی برا بچوکەکانمدا کە بەردەوام یاریان دەکرد ، وەکو دەڵێن هەموو دەردێك دەرمانی خۆی هەیە و هەموو کێشەیەك چارەسەرێکی هەیە و ڕۆژێك بۆ منە و چەندین ڕۆژیش لە سەر منە، ڕۆژێ دڵخۆشم و چەند ڕۆژێکیش دەگریم ... کچێکی وەك من بووە بە قوربانی مادە هۆشبەرەکان، هەستم بە تام و چێژی ژیان نەدەکرد ، کۆمەڵێ شتم قبوڵ دەکرد ، کە هیچ ڕاڤەیەکم شك نەدەبرد بۆی، هەتاوەکو دەمبینی لە ڕیشکەوە منی گۆڕیوە، کە خستومیەتە گێژاوی کۆمەڵێ کێشەوە کە کۆتاییان نەدەهات ... چەندین سەعات لە ژوورەکەی خۆمدا دەمامەوە و بە هۆی ئەو مادە نەفرەتیەوە جارێك ئەگریام و جارێکیش لۆمەی خۆم دەکرد ، بە هیچ شێوەیەك ئاگای خەو و حەسانەوەم نەدەزانی ، هەرچەندە هۆکارەکانی بەختەوەریش زۆر بوون بۆ من ، بەلأم نەم ئەزانی نهێنی ئا ئومێدی و ناخۆشی ژیانی من چیە ...

(٣٩) ڕۆژ خرامە بەنەدیخانەوە بە هۆی سەرەنجامەکانی دەورووبەرمەوە و ئەو دووریەی کە بەرگەم نەدەگرت پیشەم هەر گریان بوو، تەنها پەلەی ئەوەم بوو لە بەندیخانە بێمە دەرەوە و ڕزگارم بێ لەو لاوازی و لەو ئەسرین ڕشتنە، ئای کە چەندە پەشیمان بووم ... بەڕاستی هەست و نەست و ئەندامەکانی لەشم ئەسرینیان ئەڕشت و پەشیمان بوون بە هۆی تێوەگلانم بە مادەی هۆشبەرەوە و دووچاربوونم بە کۆتکردنی دەستەکانم کە نەم ئەتوانی بە تەواوی بیانجولێنم ... لەو ساتانەدا ئافرەتێکی تەمەن مام ناوەندی بە توڕەییەکەوە تەماشای دەکردم لە گەڵ خۆی بردمی منیش زۆر ترسام و بە تەواوی پەشۆکا بووم ئایا بۆ کوێم دەبات ؟ منی بردو ئافرەتێکی تریش هات لە گەڵماندا ئافرەتە دەستی کرد بە قسە کردن لە گەڵ ئەوەدا کە دەستی منی گرتبوو .. پاشان بە چپە چرپاندی بە گوێیدا کە نەدەبیسترا بۆیە

زیاتر شڵەژام و پەشۆکام ... پاشان پرسیارێك هات بە مێشکمدا ئایا چی لە بەندیخانەدا چاوەڕوانم دەکات ... بەڕاستی لە سەردەمانێکدا بەو پەڕی ڕێز و پلە و پایەوە دەژیام و لە ماڵە گەورەکەی باوکمدا ، کە هەتا ئارەزووم نەبوایە لە خەو هەڵنەئەسام... ئەمڕۆش بە هۆی مادە هۆشبەرەکانەوە هەموو شتێکم لە دەستداوە..

دوای ماوەیەکی زۆر...

لە کۆتاییدا خرامە بەندیخانەوەو پاشان لە گەڵ چارەسەرکردنێکی چڕوپڕ و چاودێریەکی ڕێزدارانەدا، لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ چاك بوونەوەم لە دۆزەخی مادە هۆشبەرەکان، هەموو ئەمانە لە نهێنیەکی تەواودا بە بێ ئەوەی کەس بزانێت ...

لە کۆتاییدا :

ئایا ئەگەری ئەوە هەیە خوای گەورە لێم خۆش بێت و پاشان ببم بە دایکی منداڵێك و لە ئامێزی بگرم و ڕابردووم لە بیربکەم و ژیانێکی خۆش بەرمە سەر لە گەڵ مێردێکی پابەنددا و کوڕێکی صالح و ماڵێکی ئیماندار و مەملەکەتێکی پابەنددار بە ئاکارە جوانەکانی ئیسلامەوە .

کتێبی(دموع السجينات)

## ٥٦- ﴿خراپیی قوتابیەك﴾

(حەمەد بەدر) دەڵێ: پێش هەشت ساڵ کاتێ قوتابی بووم لەقۆناغی دواناوەندیدا، من و یەکێ لەقوتابیە زیرەکەکان بوو بەشەڕمان... بۆیە بەهۆی ئەو شەڕەوە بڕیارمدا ئایندەی بڕوخێنم..

هەرگیز ئەو ڕۆژە شومە لە بیروهۆشمدا دەرناچێت.. شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کردم کە ڕۆژێکیان بەیانی زوو چووم بۆ قوتابخانە کۆمەڵێ جگەرەو تلیاکم پێ بوو کە ئێمە خۆمان دەمانکێشان و دەمانخوارد...دامنا لە جانتای ئەو قوتابیەدا، و داوام کرد لەیەکێ لە هاوڕێکانم کە هەواڵ بدات بە پۆلیس کە لە قوتابخانەکەدا یەکێك هەیە بڕەو بەمادده هۆشبەرەکان دەدات... بۆیە پیلانە شەیتانیەکەمان بەتەواوی سەری گرت.. و ئێمە خۆمان کە مادە هۆشبەرەکانمان بەکاردەهێنا شایەت بوین.. لەو ڕۆژەوە من باجی ئەو زوڵمەی خۆم دەدەم... من بوم بوختانم بۆ ئەو کردو توشی نەهامەتیم کرد... پێش دووساڵ تووشی ڕووداوێکی ئۆتۆمبێل هاتم و بەهۆیەوە دەستی ڕاستم لەدەستدا.. دوای ڕووداوەکە چووم بۆ ماڵیان و داوام لێکرد لێم خۆش بێت، بەڵام ئەو زۆر بەتوندی ڕازی نەبوو... چونکە من هۆکاری ئەوەبووم ڕێزو حورمەتی ئەو لەکەدار بکەم لەناو خزمانیدا.. و بەهۆی زوڵمی منەوە بووە بە کەسێکی بێزراو لە ناو کۆمەڵگادا، وە پێی ووتم کە هەموو شەوێك دوعای لەمن کردووە، چونکە بەهۆی ئەو فەزاحەتەوە هەموو شتێکی لەدەستدا..

قوتابیە زاڵمەکە ووتی: لەگەڵ ئەوەدا دەستێکم لەدەستدابوو، بەهۆی ڕووداوێکی تریشەوە لە چوار پەل کەوتم و بەهۆی کورسی کەمئەندامیەوە دەبزوام... من ئێستا ژیانێکی سەخت بەسەردەبەم.. وە خەڵکی دەترسێنم کە هۆشیاربن وەك چۆن من لەمردنیش دەترسم چونکە دەترسم لەسزادانی پەروەردگارم و لێپرسینەوەم..و دەپاڕێمەوە لە خوای گەورە کە لێم خۆش بێت و بیخاتە دڵی ئەویشەوە کە لێم ببورێت و لێم خۆش بێت.

لە کتێبی (ضحایا الشیطان)

# ٥٧- ﴿بەسەرهاتی من لەگەڵ منداڵەکەمدا﴾

لە یەکێ لەبنەکاکانی چارەسەرکردندا (ب م) ژنی هێنابوو، وە حەوت منداڵی هەبوو، ژیانی تلیاك خۆران زەلیلی و ئیهانەیە، کەسی تلیاك خۆر ڕازی دەبێ بەهەموو شتێ لەپێناوی بەدەستخستنی مادەی بێهۆشکەردا.. تەنانەت بەهەموو توانات دەگەڕێیت بەدوای هاوڕێ خراپەکاندا.. چونکە ئەوان ڕێنمایی تۆیان کردووە بۆ ئەو ڕێگایە تا ئەو ژەهرانەت دەست بکەوێت.. بەڕاستی ژیانێکی بێنەوایی و دەردیسەریە.. لەسەرەتا تەنها حەز پێکردنێك بوو بەڵام ئەمڕۆ بۆماوەی بیست ساڵە ژیانێکی دەردیسەری و ژیانێکی سەرشۆڕی بەسەردەبەم...

سەرەتای ڕێگای من بۆ ئەو جیهانە تاریکە لەڕێگای هاوڕێیەکی خراپەوەبوو پێشنیاری کرد بۆم بەڵکو زۆریشی لێ کردم تا بەکاری بهێنم چونکە بەپێی قسەی ئەو بەختەوەری دروست دەکات و بەتەواوی لەش چالاك دەکات!!!

منیش ڕازی بووم، خۆزگە ڕازی نەبوومایە، بەهەناسە ساردیەوە ئەمەی ووت... پاشان بەردەوام بوو: دوای ئەوە ڕێگام گرتە بەر و هەستم بەخۆم نەدەکرد، و بڕوام پێ بکە ئەگەر پێت بڵێم نازانم چۆن توانیم بەردەوام بم لەسەری ،چونکە ئەو مادە هۆشبەرانە وردە وردە تۆ کەمەندکێش دەکەن تا دەکەویتە داوەکەوەو خۆت ڕازی نابیت لێی دەربازبیت، چۆن نا، ئێمە زۆر کەم نەبێت یادی خوامان نەدەکرد، و هیچ ئاگایەکمان لەنوێژ کردنیش نەبوو کە پایەی ئاینە.. وە دەربارەی ژیانم لەگەڵ ژن و منداڵەکانمدا، زۆرم دەیا لە ژنەکەم و منداڵەکانم، تەنها لەسەر ئەوەی داوای شتێکیان بکردایە یا ئاسانیش بووایە.. لەگەڵ ئەو توندوتیژیەمدا لەمامەڵەکردنم لەگەڵیاندا، منداڵەکان بەتەواوی پێچەوانەی ئەوەبوون، ئەگەر بیانبینیمایە دەهاتنە ئامێزمەوە، بەڵام من هیچ گرنگیەکم پێ نەدەدان.. هۆکارەکەشی مادە هۆشبەرەکان بوو.. دێتەوە یادم جارێکیان من لەماڵەوە دانیشتبووم، کچەکەم هات بۆلام کەتەمەنی شەش ساڵان بوو بە ڕوخسارێکی بەرائەتەوە پێی ووتم: باوکە بۆچی ئێمە زۆر کەم تۆ دەبینین؟؟ پێناکەنیت لەگەڵماندا؟ هەڵدەستا بەجموجوڵی منداڵانە لەگەڵمدا، وەکو چوونە سەر پشتم و لەوجۆرە شتانە، بەڵام من کوێر بووم و وەڵامی ئەو بەرائەتەیم نەدایەوە... وەڵامی ئەو خۆشەویستیەم نەدەیایەوە.. من دوای مەست بوونم هەستم بە هیچ جۆرە

سۆزێك نەدەكرد.. ئەو هەر یاری لەگەڵ دەكردم پاشان ووتی: وەكو هاورێكانم لە قوتابخانە یاریەكم بۆ بكرە.. ئیتر دنیا لەبەرچاوم تەسك بوویەوەو كاتەكەش شەو بوو، هەستامەوە تێمسرەواندو دەستیم گرت و دەرگاكەم كردەوەو فرێمدایە سەر شەقامەكەو دەرگاكەم داخستەوە، گوێم لێیەوەبوو دەپاڕایەوە لێم كە ئیتر هەرگیز جارێكی تر داوای هیچ شتێ ناكات... دوای ئەوەی دایكی هەوڵیدا هێنامە ژوورەوە... پاشان لەپڕ پیاوەكە بێدەنگ بوو... ووتی: وێنای بكە لەكچەكەم بدەم و فڕێیدەمە سەر شەقام بەهۆی داواكردنی یاریەكەوە؟؟ ئەوەیە ئاسەواری مادە بێهۆشكەرەكان، بەدەنگێكی بەرز ووتی: بەڵكو ئەم وتانە بكات بە هەموو تلیاكیەك تاحەقیقەتی كارەكەی لای رۆشن بێت... پاشان ووتی: خۆشترینی رۆژنەكانی ژیانم بە دەردیسەری و سەرشۆڕی بەسەر دەبرد تەنها بەدوای پارەدا دەگەڕام تا فەسادو وێرانكاری پێ بكرم... رۆژێكیان چوومە دەرەوە لەماڵ و زۆر بێتاقەت بووم، یەكێ لەپیاوانی گەڕەكەكەمان لە ئۆتۆمبیلەكەیدابوو، وەستاو زۆر بەگەرمی سڵاوی لێ كردم و پێی ووتم: ئیشم پێتە بۆكارێكی گرنگ.. دوای داكۆكی كردن، سواری ئۆتۆمبێلەكەی بووم، لەشەقامەكانی شاردا دەیگەڕاندم، خوای گەورە رابەرداری بكات و سەرفرازی دنیاو قیامەتی بكات، دەیەویست خوا بێنێتەوە یادم، و جەختی لەسەر ئەوە دەكرد ماوەیەكی زۆرە كە نام بینیێ لەمزگەوتا.. ئایا تاكەی لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام دەبم؟؟ خوای گەورە ویستی وابوو كە رێنمایی بكرێم.. وردە وردە قسەكانی پێش ئەوەی بچێتە عەقڵمەوە دەچویە دڵمەوە... بەتایبەتی شێوازێكی جوانی كاریگەرانەی هەبوو، خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە... دوای ئەوەی كۆتایی بەقسەكانی هێنا لەگەڵمدا، رێككەوتین كە بمبات بۆ بنكەیەكی راهێنانەوەی دەروونی كە ئەوێ بەویستی خواو بەلێبڕان و ئیرادەو سووربوونی من دەبێتە هۆكارێك بۆ چاكبوونەوەو رێنومایی و رزگاربوون لەو مەینەتی و دەردیسەریە... بۆیە بێگومان گومانەكانم بەهەدەر نەچوون، سوپاس بۆخوا خوای گەورە شیفای پێ بەخشیم و من ئێستا بەعیززەت و كەرامەتەوە هەڵسوكەوت لەگەڵ خێزانەكەماندا دەكەم و زۆر زۆر باشم و ئەوكچەم كەلێمدا (مژدەت دەدەمێ) دوو یاری منداڵانەشم بۆكڕی نەك دانەیەك... (بەپێكەنینەوە قسەی دەكرد)...

لە كتێبی( ضحایا الشیطان)

## ٥٨- ﴿بە دەستی خۆم ژیانی خۆمم وێران کرد﴾

ئەو تۆقینەم لە یادناچێت کە دڵی هێنامە لەرزین ، کاتێ تەماشای شەڕی نێوان باوکم و دایکم دەکرد و باوکم داوای پارەی زیاتری لە دایکم دەکرد بۆ کڕینی مەی و عارق ، دەبووایە دایکم بە گوێ ی بکردایە تا ڕزگاری بێت لە شەڕەنگێزی و تاوانەکانی .

ئەم دەزانی دایکم لە کوێوە پارە دێنێت ، بەڵام هەندێ لە دراوسێکانمان جار ناجارێك خواردن و پۆشاکیان دەدایە .

دایکم سوور بوو لە سەر ئەوەی خوێندنم تەواو بکەم بە هەر نرخێك بێت ، کاتێ ئامادەییم تەواو کرد ، باوکم بە زۆر ناردمی بۆ پەرستاری بە تەماحی ئەو مووچە کەمەی دەیاندا بە کچی مەشقکار، و بەو ئومێدەی ڕزگاری بێت لێم، چونکە تەواو باری شانی ئەوم قورس کردبوو، کاتێ بە ڕوویدا دەوەستام و و بەرگریم لە دایکم دەکرد کە دەیویست هێرشی بکاتە سەر یان سوکایەتی پێ بکات .

دەردەداری دوو شت بووم لە خوێندنگای پەرستاری ، چونکە حەزم نەدەکرد ببمە پەرستار و دڵنەوایی کەسانی تر بکەم، چونکە خۆشم پێویستم بە کەسێك هەبوو دڵنەوایم بکات و باری شانم سووك بکات .

بە تەواوی نامۆ بووم لەو کەش و هەوایە ، ڕاستە ڕزگارم بووبوو لە بارودۆخی هەمیشە ناخۆشیماڵەوە ، بەڵام بە درێژایی کات دڵم لە لای دایکم و خوشك وبراکانم بوو ، دڵخۆش نەبووم بە بوونم لە نێو کۆمەڵێ کچدا کە هیچم دەربارەیان نەدەزانی ، زۆربەی کات و بە بەردەوامی بێتاقەتیان دەکردم و هەستم بە بێزاری دەکرد لە نێویاندا چونکە ساتانێکی زۆری ڕۆژیان لە بەردەم پەنجەری ژوورەکانیاندا بەسەر دەبرد و سەرەنجی کۆمەڵێ کوڕیان دەدا کە ئەوانیش لە گەڵ ئەماندا کاتی ژووانیان دانابوو ، بارگرانیەکە لە گەڵ تێپەڕینی ڕۆژگاردا قورستر دەبوو.

برا بێ عەقڵەکەشم سەرچاوەی خەفەتێکی ناخۆش بوو بۆ هەموان ، چونکە کاتێ کە فێی لێدەهات هەمووانی دەخستە حاڵەتێکی ترس و بیمەوە .

خوشکە ناوەنجیەکەشم هەوڵیدا خۆی بکوژێت ، چونکە هەرزەکار بوو، کوڕی دراوسێکەمان یاری بە هەست و سۆزی دەکرد ، کاتێ ناپاکی کرد لە بەڵێنەکەی

وخزمێكی خۆیانی هێنا ، خوشكەكەشم حەفتا حەبی لە جۆری دیجیتاڵ ی خوارد كە خەریك بوو ماڵئاوایی لە ژیان بكات و فریای كەوتبوون و رزگاریان كردبوو تا بەردەوام بێت لە گەشتە بێنەواو ناخۆشەكانیدا .

بەلاّم من .... لە گەڵ هەموو خەم و خەفەتەكانیشم بیرم لە خۆكوشتن نەدەكردەوە ، چونكە باوەڕم بە خوا هەبوو ، نوێژم ئەكرد ، بەلاّم كەسم شك نەدەبرد تا بتوانم خەم و نارەحەتیەكانمی بۆ هەڵڕێژم و دڵنەوایم بكات و بارم سووك بكات .

زۆر جوان نەبووم ، لە بەر ئەوە كەس نەدەهاتە پێش بۆ خوازبێنم و هەروەها كوڕان حەز ناكەن ئافرەتی پەرستار مارە بكەن ، چونكە هەندێكیان بە ناهەق زۆرجار تۆمەتبار دەكران بە خراپە ... هەندێ لە كچەكانی هاوڕێم هانیان دەدام لە سەر جگەرەكێشان ، بەلاّم من لە سەرەتادا هیچ چێژێكم لێ نەدەبینی ، وە واش نەبوو تا لە دەمارگرژی بەردەوام هێورم بكاتەوە .

دوای سێ ساڵ خوێندن پەرستاریم تەواو كرد و لە یەكێ لە بنكە تەندروستیە دوورەكانی حكومەت دامەزرام ، ناچار بووم لە نەخۆشخانەیەكی تردا كار بكەم كە هی چەند پزیشكێ بوو ، تاوەكو بتوانم یارمەتی دایكم بدەم كە كێشەكانی قورس بووبوون بە سەریەوە .

خەونم نەدەبینی بە رۆژی پشوو یان حەوانەوە ، پێویست بوو بە درێژایی رۆژ و بە شەویشدا كار بكەم ، هەر كە تەماشای ئاوێنەم دەكرد دڵەڕاوكێم زیاتری دەكرد، چونكە هەندێ چرچ و لۆچی هێڵیان بە روخسارمدا دەكێشا ، هەر چەندە هێشتا گەنج بووم بەلاّم ئیشكردنی بەردەوامم و لاوازیی شەكەتی كردبووم ، ماڵمان دوور بوو لە شوێنی كاركردنەكەم، كە ئەمەش كێشەكانمی زیاتر دەكرد، ناچار دەبووم بە پاس هاتوچۆ بكەم كە قەرەباڵغ بوو ، ئەمەش نارەحەتی بۆ كچێكی وەك من دروست دەكرد ، كارەكە خراپتر بوو كاتێ دایكم توشی نەخۆشی دڵ بوو كە وای لێكردبوو زوو ماندوو دەبوو ، وە نیمچە بێتوانا بووبوو لە بەڕێوەبردنی كاروباری ماڵدا .

بەڕێكردنی ژیان بەو شێوەیە نارەحەت بوو ، هەژاریش رۆژ بە رۆژ نینۆكی دەئالاّند لێمان، چونكە باوكم بە هۆی خواردنەوەی عارەق بە بەردەوامی و كەمتەرخەمی لە ئەركەكانیدا كارەكەی لە دەستدا ..

کەس نەبوو سەرپەرشتیم بکات یان گرنگی بە کاروبارم بدات و دایکم لە گەڵ نەخۆشیەکەیدا ناچار بوو ئاگای لە براکەم بێت و چاودێری بکات ، تاوەکو رانەکاتە دەرەوە و نەبێتە هۆی ئازار و زیان بە خۆی و بە دراوسێکانی. (مۆرفین)م بە کاردەهێنا بۆ نەخۆشەکان ، بە شێوەیەکی خێرا و سەیر ئازاریان نەدەما ، کەمێك شادیان بۆ دەگەڕایەوە، هەندێکیشیان وەسفی (مۆرفین)یان دەکرد کە کاریگەری سیحراوی هەیە.

لە کاتێکدا منیش زۆر جار سەرم دەیەشا و شەکەت و ماندوو بووم ، لە بەر ئەوە خۆم تاقیکردەوە بەو (مۆرفین)ە و دەم زانی کە مرۆڤیش پێی موعتاد دەبێت.. یەکێ لە پزیشکەکان باسی مەینەتی ئەوانەی بۆ کردبووم کە پێشتر ئەو دەرمانەیان بەکار دەهێنا، وە چۆن بووبوون بە کۆیلەی ژەمێکی ئەو دەرمانە .

لە گەڵ ئەوەشدا بەڵێنم دا بە خۆم کە دووبارەی نەکەمەوە، دوای جاری یەکەم هەستێکم تیا دروست بوو کە پێشتر و پاشتر تیاما دروست نەبووبوو ، سەر ئێشە و تەنگە تاویەکەم رۆشت ، و لە جێگایدا شادی بەردەوام و خۆشیەکی مەزن جێگای گرتەوە .

بە خێرایی رزگارم بوو لە باری دنیا و خراپەکانی ، هەستکردن بە مەزنی و نەشئەوە و زاڵ بوون بە سەر پێڵوی چاومدا ، کە وەنەوزدان هەتا بەیانی وشکی کردبوویەوە .

هەر کاتێ هەستم بە تەنگەتاوی یان بێتاقەتی بکردایە ڕاڕا نەبووم لە بەکارهێنانی مۆرفین و دەمدا لە باڵم .. بوومە دیلی ئەو دەرمانە، لەزەتەکەی لای من لەوە خۆشتر بوو کە مۆڵەتێك وەربگرم لە ئامێزی سروشتدا یان بەسەربردنی پشوویەك لە یەکێ لە دوورگەکاندا .

مانگێکی تەواو تێپەری بە بێ گرفت و کێشە ، بەڵام هەستم دەکرد بە ئاسانی دەمارم بۆ نادۆزرێتەوە تا مۆرفینەکەی لێبدەم چونکە زیادەڕۆیم کردبوو لە بەکارهێنانی دەرمانەکەدا .

مۆرفینم لە بەشی نەخۆشەکانەوە دەست دەکەت ، چونکە من هێمنکەرەوەیەکی ترم بە دەرزی لێدەدان و خۆشم مۆرفینەکەم دەخستە گیرفانمەوە و هەڵم دەگرت بۆخۆم.

کەس هەستی پێ نەدەکردم، بەڵام ژمارەی ئەو نەخۆشانەی ئازاریان هەبوو لە کاتی دەوامی مندا ڕۆژ بە ڕۆژ زیادی دەکرد ، منیش گوێم نەدابوویە ئەوە ، گرنگ ئەوە بوو من بەختەوەری بۆ گیانم بگێڕمەوە وەك وا گومانم دەبرد ، چونکە بەکارهێنانی یەك مۆرفین بۆ من یەکسان بوو بە هەموو خۆشیەکانی دنیا ..

بەڵام دوای تێپەڕبوونی مانگێك هەستم بە هەڵەشەیی و توڕەیی و سەر ئێشە و خەمۆکی دەکرد ، ئەگەر درەنگ دەرزی مۆرفینەکەم بدایە لە باڵم ،بڕیارم دەدا بڕەکەی زیاد بکەم، من ناچار بووم خۆم دەرزی مۆرفین لە خۆم بدەم تا هێمنی خۆم رابگرم وکۆنترۆڵی کاروبارەکانم بکەم، ژیان وەکو دۆزەخەکەی پێشووی لێهاتەوە کە مرۆڤ بەرگەی نەدەگرت، لە سەروو ئەوەشەوە من ناچار بووم دەرزی مۆرفین پەیدا بکەم و لە خۆمی بدەم بە هەر چەندە و بە هەر نرخێك بوایە .

ئەو بڕەی دەم کیشایەوە لە نەخۆشەکان بەشی نەدەکردم، زۆرجار ناچار دەبووم بە دزیەوە لە دەرمانخانەی نەخۆشخانەوە دەستم بکەوێت و دەمبرد .

دەرزی مۆرفینەکە لە گەڵ سرنجدا لەناو سنگمدا دەمشاردەوە، بە هۆی زۆر لێدانی دەرزیەوە دەمارەکانم شی بووبوونەوە ، باڵم توشی دمەڵێکی سەخت بووبوو کە زۆر ئازاری دەدام و پاشان بە ناڕەحەت چاك بوویەوە.

شەوێکیان پزیشکێك زۆر بێتاقەتی کردم ، چونکە تۆمەتباری کردم بەوەی کە کەمتەرخەمم ، زۆر گریام و هەوڵمدا بە بڕێکی زۆر لە مۆرفین دەرزی لە خۆم بدەم و پێشتر پێی رانەهاتبووم ، هەستم بە هەناسەتنی دەکرد ، پاشان لە هۆش خۆم چووم و وەك نیوە مردوو کەوتم بە زەویدا

هاتمەوە هۆش خۆم ،بینیم پزیشکێکم بە سەرەوەیە و بەزوویی هۆکارەکەی دۆزیبوویەوە ، چونکە شوێنەواری دەرزیەکانی لە سەر باڵم بینیبوو ، وە لە سنگمدا چەند حەبێکی مۆرفینی دۆزیبوویەوە لە گەڵ دەرزیدا ، بۆی ئاشکرا بوو کە من موعتاد بووم بەو دەرمانە و شەرابی یابومێ و لە چەند ساتێکی کەمدا ڕزگاری کردبووم ، ئەگەر چی کۆمەکی خوای گەورە نەبووایە و پاشان لە نەخۆشخانەش نەبوومایە ئەوا دەمردم .

تکام له پزیشکەکە کرد کە نهێنیەکەم ئاشکرا نەکات ، ڕێکەوتین لە سەر ئەوەی چەندێ لە تواناماندا هەیە بیپۆشێ ، چونکە هاوڕێکانم ڕووداوەکەیان بینیبوو ، دوای ئەوە بەسەر هاتەکەم بڵاوبوویەوە بە نەخۆشخانەدا، وەك چۆن ئاگر بەردەبێت لە پوش و پەلاش، منیان خستە نەخۆشخانەوە، بۆ چەند هەفتەیك تیایدا مامەوە، و ڕێگای مۆرفینم لێ گیرا ، بەلام گوشراوی میوەیان دەدامێ کە دواتر بۆم دەرکەوت کە دەرمانێکی تێکراوە دژی موعتاد بوون وهەندێ دەرمانیان بۆ بەکارهێنام، پاشان خرامە ژێر چارەسەرێکی دەروونی تایبەت ، پاشان مەزنترین سوودم وەرگرت لە یەکێ لەو پزیشکە ئافرەتانەی کە ڕێنمایی کردم بۆ ئیمانی ڕاستەقینە بە خوا .... ئەگەر ئەو نەبوایە ئەوە رزگارم نەدەبوو لە نەخۆشخانە و بە تێکشکاوی و نیمچە نەخۆشی نەبوایە ... ئەمە بوو بەسەرهاتی من ، ئایا هیچ هەیە لەمە پەند و ئامۆژگاری تر بێت.
گۆڤاری (الأمن والحیاة ) /ژ (١٠٢)

## ٥٩- ﴿شووم پێكرد تا رزگاری بكەم كەچی من تیاچووم﴾

تۆ هێشتا لەتەمەنی بەهاری لاوێتیدایت و هێشتا گەنجیت، هێشتا تەمەنت لە پێشەو ئافرەتێكی جوانیت ... تۆ پێویستت بە هاوڕێ و هاودەمێ هەیە كە رزگارت بكات لەو تەنیایەت و ئازاری نامۆییت كەم بكاتەوە .

خەڵكێكی زۆر خوازیاری ئافرەتێكی عاقڵ و بە سۆزی وەك تۆن، تا كەی بە تەنیا دەمێنیتەوە ؟ منداڵەكانت ژنیان هێنا و شوویان كرد و تەنیاییش ناخۆشە ، ناخۆشتر لەوەش هەست پێكردنیەتی ، وە بەو تەنهاییەی دوای ئەوەی كە مرۆڤ راهاتبێت لە سەر قەرەباڵغی .... هەموان ئەمەیان پێدەوتم دوای ئەوەی ( سەمیر ) ی كوڕم ژنی هێنا و (سەحەر) ی كچم شووی كرد، هەر یەكەیان بۆ هێلانەی تازەیان و سەرقاڵیان بە كاروباری ژیانەوە .

گفتم بە خۆم یابوو كە لە كەس نزیك نەبمەوە تا وەكو رێگا نەیەم بە كەس لەو دوانەم دوور بخاتەوە .

هەموو خەمێكم لەم دنیادا ئاسودەیی و دڵنیاییم بوو لەو دوانە ،من رازی بووم بەو جۆرە ژیانەم ، هەتا هەندێ جار لۆمەیان دەكردم یان ئامۆژگاریان دەكردم ، كاتێ محمود هاتە خوازبێنیم لە لایەكی تریشەوە سەرسامی خۆیی دەربڕی بەرامبەرم و ستایشی كردم و سووربوو لە سەر ئەوەی كە بمخوازێت .

كاتێ ناڕەزایی خۆمم بۆ دەربری سەبارەت بە بیرۆكەی زەواج ، بە راشكاوانە پێی وتم : پێشتر ژنم هێناوە ، بەلأم ژن هێنانەكەم بە حەزی خۆم نەبووە ، بە سەرسامیەوە تەماشام كرد ، لە گەڵ خۆمدا پرسیارم كرد:(ئایا پیاویش وەكو هەندێ كچ زۆری لێدەكرێت بۆ زەواج) وەك ئەوەی پرسیارەكەی لە چاومدا خوێندبێتەوە وتی : سەرسام مەبە كەسوكارم سووربوون لە سەر ئەوەی كە ژن بهێنم ، چونكە كچەكە خزممان بوو، منیش بە زۆر هێنام و رێك نەكەوتین ، ژیانم بوو بە دۆزەخ تا ئەو دۆزەخە منی برد بەرەو موعتاد بوون بە مادە هۆشبەرەكانەوە، وە پێش ئەوەش خواردنەوەی عارەق كە خوای گەورە حەرامی كردووە.

پاشـان زەواجەكـەمان بـە تـەلاق كۆتـايى هـات و دواى ئـەوەى كـە موعتـادى مـادە هۆشبەرەكان بـووم ، مـن ئێـستا حـەزێكى تـەواوم هەيـە كـە رزگـارم بێـت لـەو موعتـاد بوونەم و ئەو حەزەشم پابەندە بە تۆوە .

_ واتە بە منەوە ؟..

_ بەڵێ

_ چۆن ؟

_ بە شوكردنت بە من ...

پاشان وتى : بێگومان ئەوەى كە بيستوومە سەبارەت بە تۆ لە چاكيت و بە وەفاييت و قوربانيدانت و هۆشمەنديت پاڵم پێوە دەنێت كە سوور بم لە سەر داواكردنت ، چونكە تۆ دەبيتە ئەو دەرمانەى كە دەمپارێزێت لەو دەردە .

بە هۆى سروشتى مێينـەيى و سـۆزى زۆرەوە بەزەييم پێيدا هاتـەوە و بـڕوام پێكرد .. بڕيارمدا شوى پێبكەم ... بەڵكو ئەو هۆگر بوونەى تيا ببينمەوە كە كۆتايى بێنێت بە تەنيايى من بە هۆى دووريى منداڵەكانمەوە ... و يارمەتى بدەم لەو قەيرانـەدا كـە تێى كەوتبوو وەك خۆى دەڵێت .

بەو شێوەيە شووم پێكرد.... كچێكى جوانكيلەم لێى بوو ، زۆر بەختەوەر بووم پێى ، تەنيايى ژيانمى پڕكردەوە ، خوازياربووم هاتنە دنياى ئەم منداڵە خێر و بەرەكـەتێكى بـاش بێـت بـە سـەرماندا ، بـەلام ئوميـدەكانم بـوون بـە تراويلكـە ( سـەراب ) يێكـى مەترسـيدار ، كـاتێ نارەحەتيـەكان دەورى ژيانمانيـدا ، بـەڵكو لـە گـەڵ تێپـەڕينى رۆژگاردا سات نا ساتێك نارەحـەتى و مەينـەتى سـەردانى دەكـردين ، محمـودى مێـردم دەچووە دەرەوە بۆ شەونـشينى، بەلام شەونـشينيەكانى شـەو لـە دواى شـەو درێـژەى دەكێشا، كاتێ دەگەڕايەوە لێم دەپرسى بۆچى دواكەوتيت ، بـە شـەكەتيەكەوە وەلامـى دەدامەوە : چيت لەمن دەوێت ، ئێستا هاودەمێكت هەيە و هاوسـەرێكت هەيـە و ئيتر واز لە من بێنە .

– محمود من خەمى تۆ ئەخۆم كە هاوڕێ ى خراپ بتبەن بـەرەو موعتـاد بـوون بـە مـادە هۆشبەرەكان.

قاقا پێنەکەنی وردەیوت : هاوسەری ئازیزم خەمت نەبێت ناگەڕێمەوە سەر ئەوەی پێشتر لەسەری بووم .

کەواتە بە درێژایی شەو چی دەکەیت ؟

تەنها شەو بەسەربردنێکی خۆش و هیچی تر .

پاشان دەکەوتمە ووتوێژ لە گەڵیدا ، دڵنیای دەکردم کە بە تەواوی دوورە لەو شتانەوە کە من گومانی بۆدەبەم و ترسم هەیە لێی .

بۆیە بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبووم و بڕوام بە درۆکانی دەکرد ، شەوێکیان رۆیشتە دەرەوە لە گەڵ بەرەبەیاندا هاتەوە، کاتێ هۆکاری دواکەوتنەکەیم پرسی ، زۆر سەرزەنشتی کردم و پاشان دەستی بەرز کردەوە لێم بدات ، زۆر بە تەواوی ئاگای لەخۆی نەبوو .. پێم وت : تۆ حەزی تەواوت لە تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوە بوو ...کوا حەزت لە حەوانەوە و سەقامگیری ؟ ئایا خەمی کچەکەت ناخۆیت ؟ئایا خەمی من و خەمی خۆت ناخۆیت ؟ تۆ ژیانی خۆت و ژیانی ئێمەش وێران دەکەیت.

وتی : پیرەژن بێدەنگ بە (پڕ بە بینی پێدەکەنی) نمونەی تۆ قسەی وا ناکەن .

– بۆچی ؟

– تۆ تەنها کچت بە من بە خشیوە ، من کوڕم دەوێت ، ئایا گوێت لێیە، من کوڕم ئەوێت،پاشان دەستی کرد بە لێدانم، رام کرد لە ژێر دەستی بۆ ژووری کچەکەم و دەرگاکەم بە دوای خۆمدا داخست.

دەنگی دەگەیشتە من و دەیقیژاند (( تۆ پیریت و من لە تۆ منداڵترم..)) منیش لە پەشیمانی و مەینەتی و خەفەتباریدا دەگریام و نەمدەتوانی بخەوم... بە شەکەتی و بێداری مامەوە .

ئایا تۆ بڵێیت بوونی کچێك هۆکار بێت لە هەڵگەڕانەوەی ؟ ئەوەی کچمان پێدەبەخشێت دەتوانێت کوڕمان پێ ببەخشێت ... پاشان ئەمە منداڵی یەکەممانە .

هەستم دەکرد سەرم لە تاو بیرکردنەوە دەتەقێت ، بەڵام بە خۆمم وت : ئەوە هەڵچونێکی شێتانەیە و کاتێ خەبەری دەبێتەوە دێتەوە هۆش خۆی و داوای لێبوردنم لێدەکات و دوای ئەوەی بە قسەکانی دڵی بریندار کردم، ئەو تکای لێدەکردم کە رازی بم ببێتە مێردم و شووی پێبکەم .

قاقا پێنەکەنی ودەیوت : هاوسەری ئازیزم خەمت نەبێت ناگەڕێمەوە سەر ئەوەی پێشتر لەسەری بووم .

کەواتە بە درێژایی شەو چی دەکەیت ؟

تەنها شەو بەسەربردنێکی خۆش و هیچی تر .

پاشان دەکەوتمە ووتوێژ لە گەڵیدا ، دڵنیای دەکردم کە بە تەواوی دوورە لەو شتانەوە کە من گومانی بۆدەبەم و ترسم هەیە لێی .

بۆیە بۆ ماوەیەك بێدەنگ دەبووم و بڕوام بە درۆکانی دەکرد ، شەوێکیان رۆیشتە دەرەوە لە گەڵ بەرەبەیاندا هاتەوە، کاتێ هۆکاری دواکەوتنەکەیم پرسی ، زۆر سەرزەنشتی کردم و پاشان دەستی بەرز کردەوە لێم بدات ، زۆر بە تەواوی ئاگای لەخۆی نەبوو .. پێم وت : تۆ حەزی تەواوت لە تەوبە کردن و پەشیمان بوونەوە بوو ...کوا حەزت لە حەوانەوە و سەقامگیری ؟ ئایا خەمی کچەکەت ناخۆیت ؟ئایا خەمی من و خەمی خۆت ناخۆیت ؟ تۆ ژیانی خۆت و ژیانی ئێمەش وێران دەکەیت.

وتی : پیرەژن بێدەنگ بە (پڕ بە بینی پێدەکەنی) نمونەی تۆ قسەی وا ناکەن .

- بۆچی ؟

- تۆ تەنها کچت بە من بە خشیوە ، من کوڕم دەوێت ، ئایا گوێت لێیە، من کوڕم ئەوێت،پاشان دەستی کرد بە لێدانم، رام کرد لە ژێر دەستی بۆ ژووری کچەکەم و دەرگاکەم بە دوای خۆمدا داخست.

دەنگی دەگەیشتە من و دەیقیژاند (( تۆ پیریت و من لە تۆ منداڵترم..)) منیش لە پەشیمانی و مەینەتی و خەفەتباریدا دەگریام و نەمدەتوانی بخەوم... بە شەکەتی و بێداری مامەوە .

ئایا تۆ بڵێیت بوونی کچێك هۆکار بێت لە هەڵگەڕانەوەی ؟ ئەوەی کچمان پێدەبەخشێت دەتوانێت کوڕمان پێ ببەخشێت ... پاشان ئەمە منداڵی یەکەممانە .

هەستم دەکرد سەرم لە ناو بیرکردنەوە دەتەقێت ، بەلام بە خۆمم وت : ئەوە هەڵچونێکی شێتانەیە و کاتێ خەبەری دەبێتەوە دێتەوە هۆش خۆی و داوای لێبوردنم لێدەکات و دوای ئەوەی بە قسەکانی دڵی بریندار کردم، ئەو تکای لێدەکردم کە رازی بم ببێتە مێردم و شووی پێبکەم .

بەلأم زۆر بە پێچەوانەوە بوو ، شەونشینیەکانی زیادی کرد کە بووەتە هۆی خراپی باری تەندروستی و خەرج کردنی پارەیەکی زۆر ..

هەموو هەوڵی خۆمم خستە گەڕ تا ڕێگای لێبگرم کە بەو گوزەرەدا نەڕوات ، ئەو حەب و دەرمانانەم دەشاردەوە کە دەیخوارد.... لە بەرهەم و ئەنجامی ئەو کارانە بەرامبەر بە مێردەکەم دژایەتی و لێدان و جنێوپێدانم دەست کەوت ، بۆ دڵدانەوای پێم وت: محمود مەترسە ئەگەر هۆکاری راستەقینەی موعتاد بوونت ئەوەیە کە حەزت لە کوڕە ئەوە بێگومان خوای گەورە بەخشەندەیە و باشترین رۆزیدەرە ، تەنها بە راستەقینەیی تەوبە بکە و بپاڕێوە لێی پشت بە خوا کوڕت پێ دەبەخشێت .... بە پێکەنینەوە وەك شێت وتی : لە کوێوە کوڕمان دەبێت لە کاتێکدا تۆ پیر بوویت ، سێ ساڵ تێپەڕیووە بە سەر هاوسەرگیریماندا ، ئایا دەتەوێت چاوەڕوانی کوڕ بکەم کاتێك بە گۆچان دەچیت بەڕێوە ؟

وەکو سەرگەردان بەردەوام بوو لە پێکەنینەکەی ، وشەکانی وەك خەنجەر وابوون و دەیدان لە دڵم و رۆحمی دەوستان و دەرونمی تێك دەشکاندا ، بەلأم ئەم جارەیان بە تووڕەییەوە پێم وت : من بۆ منداڵ بوون گەورە نیم، ئافرەتانێکی زۆر لە من گەورەتر هەن و منداڵیان دەبێت وەك تۆ وای دەبینیت ، بەخشینی منداڵ بە دەستی خوای گەورەیە .

سەر لەنوێ پێکەنیەوە.. پێم وت : تۆ هۆکاریت بۆ ئەوەی کوڕمان نەبێت .. بە هۆی مەشروب خواردنی زۆرەوە و موعتاد بوونت بە مادە هۆشبەرەکان تووشی نەزۆکیان کردویت ، کە بەڕاستی مردنێکی روخێنەرە و بە هێواشی مرۆڤ دەکوژێت .

وتی : تۆ شێتیت ، دەتەوێت لۆمەی من بکەیت، چونکە تۆ هۆکاریت ، بەردەوام قسەی پێدەوتم و لێیدەدام بە بێ موراعاتکردنی هەست و سۆزی من و موراعاتکردنی کچە بچووکەکەی هەتا ئەو جگەرگۆشەیەمان تووشی ترسێکی بەردەوام بووبوو ، وای لێهات توشی قێ و گەشگە و میزکردنی خۆنەویستانە بووبوو .

خەم و خەفەت لە هەموو لایەکەوە دەوری دابووم ، خۆم دەبینیەوە کە نوقم بووم لە دەریایەکدا کە کۆتایی نیە ، تەنها ساتانێك کە تێیدا هەستم دەکرد کە مرۆڤم و رۆح و دڵم هەیە ، ئەو ساتانە بوو کە لە گەڵ ئافرەتانی هاوڕێم کە دراوسێمان بوون کۆ

دەبوومەوە و خەم وخەفەتی خۆمم بۆ هەڵدەرشتن ، قسەکانیانم وەك مەڵحەمێك دەبینی کە برینەکانمیان هێور دەکردەوە و زیاتر هانیان دەدام کە خۆڕاگر بم ، رۆژێکیان سەردانی یەکێکیانم کرد و دانیشتم قسەم لە گەڵ دەکرد ، قسەکانمان جیاواز بوون ، پاشان لێی پرسیم

– حاڵت چۆنە لە گەڵ مێردەکەتدا ؟

وتم : ئەو هەر لە سەر رەفتارەکەی خۆیەتی ، من ئیتر توانام نەماوە بەرگەی هەڵسوکەوت و خراپەی بگرم، لەزەتی خەوتن و حەوانەوەی فیکری و دەروونی لێ حەرام کردووم .

بە خەندەیەکەوە پێی وتم : ئەی تەندروستیت چۆنە ؟

وتم :ئەوەیە کە دەیبینیت .

وتی : گوێ مەدرێ دەرمانێکم لایە لە رووەکی سروشتی دروستکراوە، یارمەتیت دەدا کە بخەویت و بحەسێیتەوە و هەروەها یارمەتیت دەدا کەمنداڵت ببێت .

– ئایا بەڕاستە ؟

– بەڵێ تاقیکراوەتەوە و پاشان دوعای خێرم بۆ دەکەیت

– سوپاست دەکەم ، بەراستی خوشکێکی دڵسۆزیت

– ئێستا بۆت دێنم .

چەند ساتێك دیار نەما و پاشان گەڕایەوە و لە ناو دەستیدا چوار جگەرەی تێدا بوو کە ئاخنرابوو لە مادەی بێهۆشکەر، رارا بووم لە وەرگرتنی، بەڵام بە دڵنیاییەوە پێ ی ووتم :

گوێ مەدەرێ شێوەی لەجگەرە ئەکات منیش هەر وابووم، چونکە دەکێشرێت ، بۆیە وایە تا کاریگەریەکەی خێرا بێت.... بە هۆی دڵپاکی خۆم و پێویستیم بە دەرمانەکە بڕوام پێکرد و بەو ئومێدەی بحەوێمەوە و هەندێ لە خەمەکانم لە بیر بچێتەوە و لە ئایندەدا بەختەوەرببم.. پێویستە پێش خەوتن بیکێشیت ، ئەوەی وت پێم و تەماشایەکی کردم کە دڵخۆش بوون بە سەرکەوتنی تێدا دەبینرا .

هاتمەوەماڵەوە و ئومێدی ژیانێکی خۆش و بەختەوەرم دەکرد، نەم ئەزانی کە ئایندە و کۆتایی خۆم دەخەمە دەستی ئەوەوە .

بۆ رۆژی پێنجەم لە جیاتی ئەوەی هەست بە حەوانەوەو چاکبوونەوە بکەم، توشی ئازارێکی سەخت بووم لە ئێسکەکانمدا، سەرئێشەیەکی بەهێز دایگرتم و وام گومان دەبرد کە ئەو ئازارانە کۆتاییانەو لە لەشمدا نامێنن ، بەڵام رۆژ لە دوای رۆژ زیادیان دەکرد ..

پاش ئەوەی کار لە کار ترازا هەستم کرد کە موعتاد بووم ، بەڕاستی کەوتوومەتە ئەو چاڵەوە کە مێردەکەم منی خواست تا بیپارێزم و تێ ی نەکەوێت ... حاڵەتی خراپم و ئێش و ئازاری زۆرم ناچاریان کردم کە بچمەوە بۆ لای ژنەکەی دراوسێمان و لە دەرگامدا و ئەتلامەوە بە ئازاری زۆرەوە ، هەرکە دەرگاکەی کردەوە بە پەلە پێم وت : تکات لێدەکەم جگەرەیەکم بەرێ، ئازار خەریکە شەکەتم ئەکا ، بە ساردیەك و دڵخۆشیەکەوە تەماشای کردم و و پاشان وتی : هەر جگەرەیەك بە هەزار .

رازیم چیت پێیە بمەرێ ... من بە نیسبەت ئەوەوە نێچیرێکی بەنرخ بووم و بە ئاسانی راوی کردبووم ، جانتاکەمم کردەوە و هیچ پارەیەکم تێدا نەبینی ، بە حەسرەت و زەلیلیەوە وتم : پارەکە کەمە ؟ئێستا دانەیەکم بەرێ و سبەینێ پارەکەت بۆ دێنم .

وتی : ئێستا ئەمەوێ، سبەینێ نا .

– بەڵام هیچم پێنیە... و تەماشای دەستی کردم بە هەڵپەوە پێم وت : – – ئەڵقەکەم بەرەو گرانیشە ، دامکەند لە دەستم بۆی و ئەویش جگەرەیەکی بۆ هێنام .

وتی : پێنج هەزار بێنە تا پێنج جگەرەت بەمێ

چوومە دەرەوە بەو هەموو مەینەتی و تیاچوون و حەسرەتەوە و دنیا دەسوڕایەوە لە بەر چاوم ، هەموو رۆژێ دەچووم تا جگەریەکم دەست بکەوێت پاش ئەوەی کە نرخەکەیم دەیایە و دەشترسام و حەزەری خۆمم دەکرد .

بۆ رۆژی پانزەهەم ، پێش ئەوەی کاتی ئەوە بێت بچم بۆ لای، یەکێ لە دراوسێکانم سەردانی کردم، لەوەوە زانیم کە پۆلیس ئافرەتەکەیان دەستگیر کردوە ، پێشتر کاری کردووە بۆ تۆڕێکی مادە هۆشبەرەکان ، ژیانم بە تەواوی ژێرەو ژوور بوو، مەینەتیەکانم لەهەموو لایەکەوە زیادیان کرد، تا وای لێهات شەو و رۆژم بوون بە یەك و فرمێسك دەستبەردارم نەدەبوو، تەنگەتاوی و خەمۆکی هۆگرم بووبوون ، حەشیش

بە نیسبەت منەوە وەکو ئاو وابوو بۆ گەڕیدەیەکی ناو بیابانێکی وشکەڵانی گەرمەسێردا ، نەمدەزانی لە کوێوە دەستم بکەوێت هەتا ئازارەکانم هێور بکەمەوە و نەشم دەتوانی بە کەس بڵێم ، بیرم لە مادە هۆشبەرەکانی مێردەکەم کردەوە ،چەند جارێك هیرۆینم لێ دزی.. کاتێك رۆژێکیان پێی زانیم زۆر بە خەستی لێیدام .

لە حاڵەتێکی زۆر سەختدا بووم، دوای ئەوەی زانیبووی کە بەڕێوەبەرایەتی بنبڕکردنی مادە هۆشبەرەکان ئەو بازرگانەی گرتبوو کە ئەم مامەڵەی لە گەڵ دەکرد دنیا لە بەرچاوم تەسك بووبوویەوە و ئۆقرەم نەدەگرت ، شەو و رۆژم بووبوو بە بیرکردنەوە و ئازارێکی بەردەوام .

بیرم لە رێگایەك کردەوە کە دەرباز بم و بێمە دەرەوە لەو بیری زوڵم و تاریکاییەی کە تێی کەوتبووم ، کەسم شك نەدەبرد بێجگە لە (سەحەر)ی کچم نەبێت کاتێ مێردەکەم لەوێ نەبوو بانگم کرد و باسی مەینەتی خۆمم بۆ کرد، بە حەسرەتەوە دایە پرمەی گریان بە هۆی ئەو حاڵەتەمەوە وتی : بەراستی ساڵانێکی درێژی ژیانی خۆت و خۆشی ژیانت لە خۆت حەرام کرد لە پێناوی پەروەردەکردن و گەشەکردن و خوێندنی ئێمەدا لە سەر باشترین شێوە

بەراستی دایکێکی نمونەیی بوویت، ئەم هەموو مەینەتیەت بەسەردا دێت و واگومان دەبەیت بە تەنیا دەتوانیت ئارام بگریت ، خوایە گیان من داوات لێ ناکەم ئەوەی لە دەست چووە بیگێڕیتەوە، بەڵام داوات لێدەکەم بەزەیت بێتەوە پیایدا ، خوایە گیان دایکم پارێزراو بکە و دەردی تیمار بکە و رەحم بە دایکایەتی بکە.. بە تاس و شەوقەوە باوەشم کرد بە کچەکمدا کە وەسف ناکرێت و بە دڵدانەوەوە پێم وت : ئەوەی لە چارەمان نوسرابێت ناتوانین لێی راکەین ، گرنگ ئەوەیە چارەسەرێ بدۆزینەوە و لەم مەینەتیە دەرباز بین .

کچەکەم پەیوەندی کرد بە نەخۆشخانەی (الأمل- هیوا)ەو قسەی لە گەڵ پزیشکە بەرپرسەکەدا کرد و حاڵەتی منی بۆ باس کرد...ئەویش دڵنیای کردەوە وکاتێکی سەردانی بۆ دیاریکرد .

چەند هەفتەیەك مامەوە لە ژێر چارەسەرکردندا، بە فەزڵ و بەزەیی خوای گەورە چاك بوومەوە و دەرچووم لە نەخۆشخانە، هەرچەندە مێردەکەم هەوڵی دەدا چاك نەبمەوە

تاوەكو لە گەڵیدا بمێنمەوە ، دوای ئەوەی پێم وت: تەنها بە چاك بوونەوە جیا دەبمەوە لێت .. سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە لە نارەحەتیدا تەنها سوپاسی ئەو دەكرێت...بە نهێنیەكی تەواوەوە چارەسەر كرام و جیابوومەوە لە مێردەكەم و گەڕامەوە بۆ ژیانی سروشتی خۆم، دوای ئەوەی بەربەستێكم دروست كردبوو لە بەردەم بەختەوەریمدا كە نەم توانیبوو بەباشی بیر لە تێپەراندنی بكەمەوە .

بە نهێنی دوعام بۆ هاوڕێكەم دەكرد ، یان ئەوەی كە خۆی ناونابوو هاوڕێی من تا لە پشت تێكشكان و ئازاردانی منەوە پارەی دەست كەوێت .

پەروەردگارا رەحممان پێبكە و لە كردەوە خراپەكانمان خۆشبە و ولأتمان بپارێزە و ئومێدی دوژمنەكانمان پوچەڵ بكەرەوە .

(ماساة نُورَة وَآخَرين):نوسینی: بهیە عبدالرحمن بوسبیت

## ٦٠- ﴿پاكیزەیم و مادە هۆشبەرەكان﴾

ئافرەتێك هێنرایە نەخۆشخانە ، كە تووشی حاڵەتێكی دەروونی توند بووبوو ، هیچ هۆكارێ لە هۆكارەكانی هێمنكردنەوە سودیان نەبوو بۆ هێمنكردنەوەی ، هەستاین بەلێدانی دەرزیەكی هێمنكەرەوە تا كەمێ بحەسێتەوە ، كاتێ هاتەوە هۆش خۆی دەستی كرد بە گریان و هاواركردن و بە چنگ ڕوومەتی خۆی دەڕنی .

بە بێ ئەوەی بزانین بۆ چی وا دەكات ، لەو كاتەدا داوام كرد لەوانەی كە لە ژوورەكەدا بوون بڕۆنە دەرەوە و تەنها من مامەوە لە گەڵیدا ، پێم وت : هۆكاری چیە ئاوات لێ بەسەرهاتووە .

دوای مل نەدانێكی زۆر بە سەرهاتەكەی بۆ گێڕامەوە و وتی : بەهۆی پێویست بوونی بە پارە بۆ كڕینی مادەی هۆشبەر پاڵی پێوە ناوە كە داوای بكات لە پیاوێك كە دەیناسی ، ئەویش پێیداوە بە مەرجێك مادە هۆشبەرەكە لە ماڵی پیاوەكەدا بخوات ، بۆیە لە ماڵی پیاوەكەدا خواردبووی و پیاوەكەش ئەم هەلەی قۆستبوویەوە بە هۆی كاریگەری مادە هۆشبەرەكەوە دەستدرێژی دەكاتە سەر ئافرەتەكە، كاتێ ئافرەتەكە دەزانێ چی لێهاتووە تووشی ئەو بارگرژیە دەماریە دەبێت كە بە هۆیەوە هێناویانە بۆ ئێرە ، دوای ئەوەی یەتەوە هۆش خۆی چارەسەری تەواوی بۆ دەكەین و و ویژدانی بە ئاگا دێتەوە .

(المخدرَات بَيْنَ النَصِيحَةِ وَ الفَضِيحَة) / دار المستقبل : بيروت لبنان- كتێبی: ﴿قوربانیانی مادە هۆشبەرەكان﴾

## ٦١٠- ﴿كاره ئەویندارییەكانی كچێكی موعتاد﴾

عەقید عومەر پشكنەری بنبڕكردنی مادە هۆشبەرەكان وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی بەیانی زوو چووە نوسینگەكەیەوە و پێش ئەوەی لە سەر كورسیەكەی دانیشێت بانگی یەكێ لە هەواڵنێرەكانی كرد تا داوا بكات فنجانێك قاوەی بۆ بێنن ، پێش ئەوەی هەواڵنێرەكە بڕوات و فەرمانەكە جێبەجێ بكات ،بە پشكنەر عومەری وت: كە زیاتر لە جارێك بەڕێوەبەر هەواڵی پرسیوە و دەیەوێت بەخێرایی بیبینێت .

پشكنەر عومەر رۆشت بۆ ژووری بەڕێوەبەر و كارگێڕی بینی زۆر غەمبار و بێتاقەتە كە لە سەر روخساری نیشانەی توڕەیی نائاسایی دەبینرا، كاتێ كە عەقید عومەری بینی پشكنەر عومەر سلاوی كرد: بەیانیت باش گەورەم ،

بەبێ ئەوەی بەڕێوەبەر وەڵام بداتەوە نامەیەكی پۆستەی خستە سەر مێزەكە و بە توڕەیی و سووربوونەوەوە وتی : جەنابی پشكنەر ئەم كارە ئەوینداریانەت با لە دەرەوەی كار بن ، نامەوێت ئەمە دووبارە بێتەوە ، پێویستە بە ئاگا بیت لەوانەی كە نامەی ئەوینداریت بۆ دەنێرن .

یان هەر شتێ تر پەیوەندی بە كارەكەتەوە نەبێت، تۆ خێزانداریت ئەگەر پارێزگاری لە كەسایەتی خۆت نەكەیت، بێگومان ئەركی سەر شانی منە پارێزگاری لە پێشینەی فەرمانگەكەم بكەم و وە هەروەها ئەركی سەرشانمە پارێزگاری لە تۆ و لەناوی تۆ بكەم و لە سومعەی تۆ بكەم.

پشكنەر عومەر بە هێواشی دەستی درێژكرد تا نامەكە بگرێت و بە بێ ئەوەی هیچ بڵێت دەستی كرد بە خوێندنەوەی ناونیشانی نامەكە

كۆماری میسری عەرەبی ، گۆڕەپانی (العتبە) بەڕێوەبەرایەتی بنبڕكردنی مادە بێهۆشكەرەكان..

بۆ خۆشەویستم عەقید عومەر موستەفا...

عەقید عومەر پێش ئەوەی زەرفەكە بكاتەوە بە جوانی دەستی كرد بە پشكنینی ، بەڵێ نامەیەكی ئەوینداری بوو بۆ ئەو نێردرا بوو ، پولی پۆستەی پێوە بوو لە میرنشینی عەرەبی سعودیەوە ، بە ورتەورت دەیوت : سعودیە ، كەس ناناسم لەوێ نامەی ئەویندارییم بۆ بنێرێت .

بە هێمنی نامەکەی دەرهێنا و کە نامەیەکی ئەویندار بوو تا بیخوێنێتەوە :

خۆشەویستم عومەر : ئەمە یەکەمین نامەی خۆشەویستیە کەلە ژیانمدا دەینووسم دەڵێن : ئافرەت بە راستگۆیانە تەنها دڵی بە یەک پیاو دەدا لە ملیۆنێ جاریشا یەك جار ئەوە روودەدات ، بەراستی من تۆم خۆش دەوێت و عومەرێکی تریشم خۆش دەوێت و هەروەها مێردەکەشم خۆش دەوێت واتە : سێ پیاو لە دڵمدا هەیە و خۆشەویستن

خۆشتریش لە خۆشەویستیە یادگاریە تاڵ و شیرینەکانن پێکەوە ، من لە سەرەتادا دان بەوەدا دەنێم ، کە خۆشەویستی من بۆ تۆ خۆشەویستیەکی تاك لایەنانەیە ، چونکە من باش دەزانم تۆ مێردیت و سەرپەرەشتیاری خێزانیت و و خۆشت دەوێت و دڵسۆزیت بۆی .. رۆژێ لە رۆژان خۆشەویستیت لە گەڵمدا ئاڵوگۆڕ نەکردوەتەوە ، خۆشەویستی من نامۆیە لە بارودۆخێکی سەیردا لە دایك بووە ، وە هیچ فێڵێکم نیە لە مەدا ، بەڵکو لە چارەم نوسراوە کە سێ پیاوم لە یەك کاتدا خۆش بوێت ، مێردەکەم و کوڕەکەم کە ئایندەی منن ، تۆش کە ئەو رابردووەی کە لە یادم ناچێتەوە ، هەرچەندە هەوڵ ئەدەم هەست بە رسوایی و سوکی خۆم ئەکەم .

پشکنەر عومەر عارەقی دەردەکرد و بەرێوەبەریش لە پشت چاویلکە پزیشکیەکانیەوە چاودێری دەکرد ، عومەریش بەردەوام بوو لە خوێندنەوەی نامەکە بە بێ ئەوەی ورتەی لێوە بێت.

نەیدەویست لەو قسە خۆشانە بە ئاگا بێتەوە ، پەلەی بوو تا کۆتایەکەی بزانێت و تا ئاشنا بێت بە خۆشەویستەکەی .

خۆشەویستم .. هێشتا وێنەی دژواری ئەو رۆژانەی رابردووم لە بیر و هۆشمدایە ، بە هەموو ئازار و دێوەزمەکانیەوە ، چاوانم دەنوقێنم و دەگەڕێمەوە بۆ دواوە بۆ چەند ساڵێکی کەم و خۆم دێتەوە یاد ، ئەو کچە بێتاوانە دانیشتووە لە شەمەندەفەرەکەدا کە لە (زەقایق)ەوە دێت و دەڕوات بەرەو (قاهیرە)... لە سینەشمدا چەندین خەون و ئەنێشەم هەڵگرتووە ، باوکە بازرگانە گوندنشینە پاکەکەم دێتەوە یاد کە لە وێستگەی شەمەندەفەرەکەدا لە شارەکەماندا وەستا و خوا حافیزیم لێدەکات بۆ گەشتی یەکەمم بەرەو قاهیرە ، لە گەڵ هەستەکانیدا ، من خوێندنی ئامادەیم بە

سەرکەوتوویی تەواو کرد ، چوومە کۆلێژی پزیشکیەوە ، باوکم بە توندی ڕێگری دەکرد لە قاهیرە نیشتەجێ بم و دوور بم لە خێزانەکەمان... لە کۆتاییدا ناچار پاڕانەوەکانی دایکمی قبوڵ کرد کە تاکە ئومێدێکی کچە پزیشکەکەی بوو .

بەو شێوەیە گوندەکەمان و خێزانەکەم جێهێشت و تا لەنێو قوتابیە کچەکاندا بژیم لە قاهیرە، بەو ئومێدەی خوێندنەکەم بە خێرایی تەواو بێت و بگەڕێمەوە بۆ گوندەکەم و لە سەر داواکاری دایکم و خەڵکانی گوندەکە (ئایا پزیشك نیم ).

وە بە ڕەوشت و ئاکار و هەڵسوکەوتی گوند نیشنانەی سادە ساڵی یەکەمم لە قاهیرە بردە سەر ، خەریك بوو دادەبڕام لە هاوڕێکانم ، تەنها ئاگام لە وانەکانم و سەعیکردن و خەو هەبوو ،ئەو ساڵە سەرکەوتنێکی باشم مسۆگەر کرد بە پلەی زۆر باشە(جيدجدا) .

ساڵی دووەم دەستی پێکرد و شانازیم بە دەرچوونم و بە پلەکەمەوە دەکرد ، بڕیارمدا بەردەوام بم لە سەر گرنگیدان بە وانەکان و سەعیکردن و خەوتن ، بەڵام بێزار بووبووم لە کچەکانی هاوڕێم لە شوێنی نیشتەجێ بوونمان ، بووبوومە کاڵایەکی بەهادار بۆ گاڵتەکردنیان و تانە و تەشەردانیان لێم ، لە سەرەتادا تاونباریان دەکردم بەوەی من گوندنشینێکی گەمژەم، چونکە بەشداری لە ژیانیان و گاڵتەکانیان ناکەم و تەنها سەعی دەکەم.

لە ژێر کاریگەری هەندێ لە هاوڕێکانم تێکەڵ بووم لە گەڵیاندا و منیش وردە وردە هۆگریان بووم ، و دەستم کرد بە باسە ڕاشکاوەکان سەبارەت بە ئەویندارییەکان ، وردە وردە دەرکم بە ژیانی کچانی هاوڕێم کرد کە دەژیام لە گەڵیاندا ، نازانیت چۆن ژیانێکیان دەبردەسەر ، لە گەڵ هاوڕێکانم شەو تا دەرەنگانێك نەدەخەوتین ، سەما و جگەرەکێشان و پێکەنین و گاڵتەجاری .

شەوێکیان یەکێکیان جگەرەیەکی یامێ و منیش جگەرەم نەدەکێشا... پۆزشم هێنایەوەو ئەوانیش هەر زۆری لێدەکردم بۆیە منیش کێشام ، بۆنی زۆر سەیر بوو لە بۆن وبەرامی ئەو جگەرەیەی نەدەکرد کە باوکم دەیکێشا...لە نێو پێکەنین و گاڵتەجاریەکاندا ئاگام لە خۆم نەما و پێکەنیم وەك ئەوەی پێشتر پێ نەکەنیبم، بۆم دەرکەوت کە جگەرەکە حەشیشی تیدایە و وای خستە مێشکمەوە کە خەم و خەفەت

لادەبات.. وردە وردە راهاتم لە سەر جگەرەی حەشیش... بە دوایدا ئەگەڕام و پارەم ئەدا بە هاوڕێکەم و لێی دەپاڕامەوە تا بۆم پەیدا بکات .

شەوێکیان هاوڕێکەم هات تا پێم بڵێت کە مۆڵەتی لە سەرپەرشتیاری خانەی قوتابیانەوە وەرگرتووە کە لە گەڵ هەندێ لە کچی هاوڕێماندا بڕۆینە دەرەوە بۆ بینینی قاهیرە بە شەو .

پێش ئەوەی پرسیاری لێ بکەم، داوای لێکردم بە خێرایی خۆم بگۆڕم و لە گەڵیدا چوومە دەرەوە بە ئومێدی ئەوەی جگەرەی حەشیشم دەست بکەوێت .

ڕۆشتین بۆ ماڵی یەکێك لەهاوڕێ کچەکانمان کەناوی (ڕەباب) بوو.. بۆم دەرکەوت کە خێزانەکەیان لەکەنداو کاردەکەن و ئەم کچە خۆی بە تەنها لەو شوقەیەدایە تا خوێندنی زانکۆ تەواو بکات ، ئای چەندە سەیر بوو بەلامەوە کە چوومە شوقەکەوە ، مۆسیقایەکی دەنگ بەرز و پێکەنین و سەما کردنی کۆمەڵێ لاوی کوڕ و کچ، چوومە ژوورەوە بەڵکو پێویستیەکەی خۆم ( جگەرەی حەشیش )م لەوێ دەست بکەوێت و پارچەیەکیش لە حەشیش ، دوکەڵ ئەو ناوەی تەنی بوو ، یەکێك لە هاوڕێ کچەکانم نزیك بوویەوە لێم و لەفافێکی بچوکی پێچراوی بۆ هێنام ، کردیەوە و گیراوەیەکی سپی تێدا بوو داوای لێکردم بۆنەکەی هەڵمژم ،ئەوە چیە ؟. دەستی دوور خستەوە و خەریك بوو تووڕە ئەبووم ، بە پێداگرتنەوە وەڵامم دایەوە من بۆن ناکەم.. دەنگی پێکەنین بەرز بوویەوە و هاوڕێکەم لێم نزیك بوویەوە و هێمنی کردمەوە و جگەرەیەکی حەشیشی پێشکەش کردم و بە گاڵتەوە هەواڵم پێدان کە من هێشتا منداڵێکی بێتاوانم و تەنها جگەرەی حەشیش ئەکێشم و جگەرە بە دوای جگەرەدا دەم کێشا .

دوای پێنج جگەرە بێهۆش کەوتم و هاتمەوە هۆش خۆم تا بۆنەکە داوا بکەم و بۆ هاوڕێکانم بسەلمێنم کە من منداڵ نیم .

سەردانمان بۆ ماڵی (ڕەباب)ی هاوڕێمان چەند بارە بوویەوە و بۆنەکەش چەند بارە بوویەوە ، گەڕامەوە بۆ خانەی قوتابیان و کۆلێژ تا بە دوای بۆنەکەدا بگەڕێم... بە دوای (ڕەباب) دا دەگڕام و نەمدەبینیەوە، خەریك بوو شێت دەبووم، گەشتی نەفرەت لێکراوم لە گەڵ ئەو بۆنەدا دەستی پێکرد... موعتاد بووم بە تەواوی... باوکم خەرجیەکی مانگانەی بۆ دەناردم کە ( ١٥٠) جونەیە بوو کەبە یەك چرکە و لە پێناو

یەك بۆن هەڵمژین دەبوو بە هەڵم.. دەستم کرد بە فرۆشتنی خشڵ و زێڕەکانم و کرێی خانەی قوتابیانم پێ نەما ..

رۆژ و هەفتە و مانگ من لە فەوتانێکی تەواودا بووم بە هۆی ئەو ژەهرە پیسەوە ، هەموو خانەیەکی جەستەم هاواری دەکرد و داوای هیرۆینی دەکرد و لە ئەنجامدا دوور کەوتمەوە لە کولێژ و وانەکان و سەعیکردن ، کاتێ ئاگادارکرامەوە کە دەرم دەکەن لە خانەی قوتابیان بە هۆی دواخستنی کرێوە... کەلوپەلەکەم کۆکردەوە و پێش ئەوەی بار بکەم لە بەردەم ئاوێنەکەدا وەستام تا ئەو دێوەزمەیە ببینم کە بە قژێکی ئاڵۆسکاوەوە و دووچاوی داچۆڕاو و روخسارێکی تێکچوو و جەستەیەکی شەکەت و ماندوو وەستاوە.

بە جانتای جلەکانمەوە رۆشتم بۆ ماڵی هاورێکەم و یەکەم جار جگەرەیەکی حەشیشی دا بەدەستمەوە و پێم وت زۆرم پێویست بە یەك بۆن هەڵمژین هەیە ، تا بتوانم بژیم تا بەردەوام بم لە رۆشتن... ئەویش سەرەتا داوای نرخەکەی کرد.. پێشنیارم کرد کە پۆشاکەکانم بکرێت چونکە یەك ملیمم پێ نەبوو ، بەڵام ئەو رازی نەبوو.. چۆکم دادا بە زەویدا و قاچەکانیم ماچ کرد و رووخسارە ناشرینەکەی وەرگێڕا و رۆیشت... لە خانەی قوتابیان چوومە دەرەوە و بەسەرگەردانی بە شەقامەکاندا دەسوڕامەوە.. هەر دەبێت بۆنێکم دەست بکەوێت ؟ ناکرێت بەم شێواز و رواڵەتەوە بگەرێمەوە بۆ گوندەکەم و لای کەس و کارم.

بیرم کردەوە لە خۆکوشتن تا کەسوکارم دوور خەمەوە لەو حەیاچوونە ، ئیتر نازانم چۆن پێکانم منیان هێنایە نوسینگەکەت (نوسینگەی سەید عومەر) و هاتمە ژوورەوە تا لێت بپارێمەوە کە بمخەیتە بەندیخانەوە ، بەڵام دوای ئەوەی کە بۆنێکی هیرۆینت بۆ ئامادە کردم هەتا یەکەم جار رزگارم بێت لە ئێش و ئازارەکانم... چونکە من موعتاد بووم ..بە کورتی بە سەرهاتی خۆمم گێڕایەوە ، نازانم دوای ئەوە چی روویدا لەبەردەم نوسینگەکەدا لە هۆش خۆم چووم کاتێ هاتمەوە هۆش خۆم، خۆم بینیەوە لە سەر پێخەفێکی سپی لە یەکێك لە نەخۆشخانە تایبەتەکاندام بۆ چارەسەرکردنی موعتاد بوون .

یەکێ لە پزیشکەکان نزیك بوویەوە لێم و تا بە هەردوو چاوی پڕ لە خەم و پەرۆشیەوە پێکەوە تەماشام بکات ، تا مەچکەم بگرێت و دڵنیا بێت لە لێدانی دڵم .. لێم پرسی چۆن منیان هێنا بۆ ئێرە؟ پزیشکەکە بە چەند وتەیەکی کورت وەڵامی دامەوە: بیر لەوە مەکەرەوە ، گرنگ ئەوەیە کە هاوکاریمان بکەیت لەچارەسەرکردنەکەدا، هەتا رزگارت بێت لەو حاڵەتەی کە تێیکەوتوویت .

لێم پرسی : چارەسەرکردنەکە چەندی تێدەچێت؟

وتی : هەزاران جونەیە .

وتم : ئەی ئەو هەزاران جونیهە لە کوێ بێنم ؟

وتی : حسابەکە تەواو بووە خەرجی چارەسەرکردنەکە پێشتر دراوە .

بە سەرسامیەوە لێم پرسی کێ داویەتی ؟

وتی : عەقید عومەر و هاوڕێکانی پارەکەیان بەتەواوی داوە .

خۆشەویستم، کاتێ ئامادەبوویت و سەردانت دەکردم و چەپکێ گوڵت بە دەستەوە بوو باوەشم بۆ گوڵەکان و هەستەکانی خۆم دەکردەوە ، بەڵێ خۆشم ویستیت، ئاوێتەیەك لە خۆشەویستی خوشکێك بۆ برا گەورەکەی کچێك بۆ باوکی نەخۆشێك بۆ پزیشکەکەی ، خۆشەویستی قوتابیەك بۆ مامۆستاکەی .

زۆرێك لە نەخۆشەکان و پەرستارەکان لێیان دەپرسیم ئەمە کێیە هەموو هەفتەیەك سەردانت دەکات وچەپکە گوڵێکیشی پێیە؟ منیش خەندەیکم دەکرد بۆیان و دەم وت :خۆشەویستمە و بەسەرسام بوونیانەوە وازم لێدەهێنان... شەو دەرەنگانێك دەمامەوە تا نەخۆشەکان دەخەوتن تا نوێژ بکەم و لە نوێژەکاندا بپاڕێمەوە بۆت و بۆ منداڵەکانت و بۆ ئەو دڵە کە هێشتا بە خێر و چاکە و خۆشەویستی لێدەدات ، هەفتەکان و مانگەکەکان تێپەڕین و منیش نەخۆشخانەم جێهێشت و هاتم بۆ نوسینگەکەت تا پێش سەفەرکردنم بۆ شارەکەی خۆمان بتبینم و سوپاسی ئەو جوامێریەت بکەم... وە نازانم چۆن ئەو قەرزەت بدەمەوە کە بۆ منت خەرج کرد لە نەخۆشخانە ، هیچم لە تۆوە نەبیست تەنها پیرۆزبایی کردن نەبێت لە من بۆ چاك بوونەوە و بەختەوەربوونت بە هۆی رزگار کردنی منەوە لە تیاچوون و سەرگەردانی کە تێی کەوتبووم .

وه له گەشتەکەمدا بۆ شارەکەمان له یەکێ له ئۆتۆمبیلەکانی کرێ ئاشنا بووم به لاوێکی جوان و ڕێکوپێك کە روخساری پڕ بوو لە جوامێری و پیاوەتی و بۆم دەرکەوت کە کەشتیوانی یەکێ لە کەشتیە بازرگانیەکانە و لە یەکێك لە شارەکانی کەنداو نیشتەجێیە و وتی : کە زۆربەی شارەکانی جیهانی بینیوە ، بەلام لە روخساری مندا هەست بە بەرائەتی کچێکی میسری ئەکات و ئاشنا بووین بەیەك و دوای دوو ڕۆژ هات بۆ ماڵمان و خوازبێنی منی کرد لە باوکم و خوازبێنیمان راگەیاند ... زەواجەکە بە خێرایی ئەنجام درا تا گەشت بکەین بۆ کەنداو... ئاشنا بووم بە خۆشەویستی دووەمم لە ژیانمدا ، سەفەرەم کرد بۆ شوێنی نیشتەجێ بوونم .

ناتوانم خواحافیزیت لێبکەم خوا حافیزی لە خۆشەویستی یەکەم ، سەفەرم کرد تا لە هێلانەی ژن و مێردایەتیدا بژیم ، دەستم کرد بە ژیانێکی نوێ ... منداڵەکەم لەناو سکمدا دەستی کرد بە جووڵە.. لێت ناشارمەوە کە چەندین جار تووشی دەمار گرژی دەبووم وحەزێکی زۆرم لە بۆنکردنی ئەو ژەهرە پیسە دەکرد ، بەلام بە هۆی ترسم لە کۆرپەلەی ناوسکم و وێنەی تۆ لە مێشکمدا بە پەلە دووریان دەخستمەوە لەو بیرکردنەوەیە ، ئیرادە و حەزی زۆرم بۆ تێپەڕاندنی قەیرانەکان یارمەتیاندام... هەستم بە ئازارەکانی سك بوون دەکرد ، پێش ئەوەی مێردەکەم بمبات بۆ نەخۆشخانە کردم بە مەرج بە سەر مێردەکەمەوە کە خۆم ناوی ئەو کۆرپەیەمان بنێم ، ئەگەر کوڕ بوو... منیش بەناوی تۆوە ناوم نا . ﴿عومەر﴾ .. ئاشنا بووم بە خۆشەویستی سێیەم لە ژیانمدا.. پێش سەفەرکردنم نەم ئەتوانی خوا حافیزیت لێبکەم؟

بەلام ئەوەی لە ناخمدایە بەهێزترە لەوەی لە هەموو وشەیەك یان عیرفانێك.. بەراستی منت لە فەوتان رزگار کرد.. ئێستا بیردەکەمەوە لە تەواو کردنی خوێندنی زانکۆ تا خەونی دایکم بێنمە دی... من ئێستا کە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم لە سەر جێگا کەوتووم و لە پاڵیشمدا کۆرپەی یەکەممان کە خۆشەویستی دووەمە راکشاوە ، و ئازیزترین ناوی خۆشەویستی یەکەمم لێناوە .

مجلة (الأمن والحياة) / ژمارە ١٣٠ ﴿قوربانیانی مادە هۆشبەرەکان﴾

## ٦٢- ﴿ئاسەواری مادە هۆشبەرەکان﴾

یەکێ لە پیاو چاکەکانی ئەفغانستان ووتی:کۆمەڵێ لاو بەرەو گۆڕەپانی جەنگ دەڕۆشتن و یەکێکیان لەوانی تر دواکەوتبوو..لێم پرسی بۆچی وەکو ئەوان بە خێرایی ناڕۆیت؟

ووتی:دەپاڕێمەوە لە خوای گەورە کە لێم خۆش بێت..باری تەندروستیم ڕێگام نادات بە خێرایی بڕۆم.و هەناسەیەکی هەڵکێشا...

منیش پێم ووت:بۆچی برای بەڕێزم؟

ووتی: من پێشتر موعتاد بووم بە مادە هۆشبەرەکانەوە و هەموو جۆرەکانیم تاقیکردۆتەوە..کاتێکیش تەوبەم کرد دەرفەتی ئەوەم نەبوو کە لەگەڵ هاوڕێنانی خراپدا دانیشم تەنها سەرقاڵ بووم بە جیهاد لە پێناوی خوای گەورەدا..

(حاول وأنت الحكم) سعد البريك

## ٦٣- ﴿وەسیەتی ((منــــــــار))﴾

وەسیەتی منار.. ئەو کچەی کە تووشی نەخۆشی ئایدز بوو، وەسیەتەکەی دەنوسێت بۆهەموو کچێکی موسڵمان کە بەڕێگەی ئەودا چووە بەڵکو بەچەند وتەیەك ڕزگاری بکات لەو مەینەتیەی... ئەوەتا منیش بەخامەی خۆی بۆتان دەگوازمەوە بەڵکو بەم چەند وتەیە توانیبێتم پەیامێك بگەیەنم لە ئافرەتێکی تۆبەکارەوە بۆ هەموو ەوانەی ڕوپۆشی خۆشەویستی و هەواو ئارەزوو و وەسوەسەی شەیتان سەرگەردانی کردوون.

منار وەسیەتەکەی دەنوسێت دوای ئەوەی توشی ئادیز بووە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

بۆگۆڤاری (شهد الفتيات)

بۆ ستافی ئەم گۆڤارە قەشەنگە

{ئەبێ لەکوێوە دەست پێبکەم... وە چۆن قسەکانم تەواو بکەم... لەژیانێکی تاڵدا دەژیم... خۆشی و ماتەمی لە ناخمدا دەگەن بەیەك... ناڕەحەتترین قۆناغی ژیانم دەگوزەرێنم... ئەگەر پەیامەکەمتان خوێندەوە... بەدڵنیاییەوە ئاشنا دەبن بە مەینەتیەکانم... پەردەم لەسەر خامەکەم لایاو... هەموو توانام کۆکردەوە... تامەینەتی و ئاهو حەسرەتی خۆمتان بۆ بنوسم... فرمێسکەکانی خۆمتان بۆ بنوسم... دوای ئەوەی بابەتێکم خوێندەوە کە لەژمارە پێنجی گۆڤارەکەتاندا بڵاو بوویەوە بەناونیشانی (ئایدز) لە سعودیە.. هۆکارەکانی و ڕاستیەکانی).. بابەتەکە زۆر جێی سەرنجم بوو.. هەر کەناونیشانەکەم خوێندەوە لەسەر بەرگی گۆڤارەکە، وام هەست دەکرد مەبەستتان لە منە.. بەڵێ.. نازانم بۆچی بەبێ هۆشانە چوار ژمارەم کڕی.. لەوانەیە وام گومانی بردبێت کە ناوی خۆم لە بابەتەکەدا دەبینمەوە..

سەرسام مەبن.. بەڵێ من توشی نەخۆشی (ئایدز)بووم.. لەکاتێکدا وادەڵێم کە چاوەڕوانی ساتی ماڵئاوایی کۆتاییم... نەخواردن.. نەخەواردنەوە.. هیچ لەزەتێ هەست پێناکەم بێجگە لە نزیکی لە خواوە...

لەهۆشیاریەکی ڕاستەقینەدا ناژیم تەنها کاتێ نەبێ کە نوێژ دەکەم.. دەخوازم بچمە بەهەشتەوە.. بەڵکو لەوێ درێژە بە ژیان بدەم و ئەو بەختیاریە ببینمەەو کە بە دوایدا دەگەڕێم.

بەڵێ من توشی ئایدز بووم... بەڵکو ئەوە تاقیکردنەوەیەك بوبێ لای خوای گەورەوە تاوەکو بگەڕێمەوە بۆ ڕێگای ڕاست و دروست ...پێتان ناڵێم هۆکاری توش بونم چیە چونکە من شەرم دەکەم کە لەم بارەیەوە بدوێم...

بەڵام کچانی موسڵمان.. بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان.

وە بزانن کە هەمووشتێ تەواو دەبێت... بۆیە پێویستە لەسەر ئافرەت دوورکەوێتەوە لە لەزەتە حەرامکراوەکان و وازهێنان لە گوێڕایەڵی پەروەردگار...

بەڵێ.. داواتان لێ دەکەم لابکەنەوە بەلای ئاینەکەتان و کەس و کارتان و مێردتاندا... ئەوەی لەبەر خوای گەورە واز لە شتێك بهێنێت خوای گەورە بەخێرو چاکە قەرەبووی بۆ بکاتەوە.

کچانی موسڵمان... ئاگاداربن

ئاین و دەستگرتن پێ یەوە ڕێگای ڕاستەقینەیە بۆسەرکەوتنتان

وە دوعام بۆ بکەن.. دوعای لێبوردەیی و لێخۆشبوونم بۆ بکەن}

وتەی ستافی گۆڤارەکە: نامەی (منار) زۆر کاری تێکردین، حەزمان کرد بە خامەی خۆی بیخوێننەوە، بەڵکو زیاتر جێگای پەندو ئامۆژگاریی بێت. خوشکی ئامۆژگاریکەرتان (منار)

## ٦٤- ﴿بـەنـــاز﴾

ناوی (بەنان)بوو... هەروەکو ناوەکەی خۆی ئافرەتێکی بەنازو سەربەست بوو لەهەموو شتێکدا و ڕۆشنبیر بوو، تەنها لەئایندا نەبێت، گرنگ ئەوەیە مادام خاوەنی دڵێکی پاکە، قەیناکا دوای ئەوە تێکەڵی هەرکەسێ دەبێت.. و هەرپۆشاکێك دەپۆشێت... و چی دەکات بابیکات...

شەوێکیان (بەنان) هاوڕێکانی کۆکردەوە بۆئاهەنگێرانی جەژنی لەدایکبوونی.. جەژنێك خوا نەیناردووە بۆمان... لەکافرانەوە فێری بوین و لاساییان دەکەینەوە.. ئەوەشی لاسایی هەرنەتەوەو گەلێك بکاتەوە -پەنابەخوا- لەگەڵ ئەوانەدا حەشر دەکرێت... (بەنان) لەوپەڕی جوانی و ڕازاوەییدابوو... بەناو هاوڕێ کچەکانیدا دەگەڕاو لێرەو لەوێ قاقای پێکەنینیی لێ دەداو لەکچەکانی پرسی: کچان ئایا دەزانن... ئەم ئاهەنگەمان چی کەمە؟ ئێمەش چەند وەڵامێکمان دایەوە، ئەویش وتی: نەخێر.. و نەخێر.. وە هەر سور بوو لەسەر پرسیارەکەی... پاشان خۆی وەڵامی پرسیارەکەی خۆیی یایەوەو بەپێکەنینەوە وتی: شێخە (عەلیاء)مان مەکە... لەهەموو لایەکەوە دەنگی پێکەنین و گاڵتە بەرز بوویەوە.

یەکێکیان بۆ بەرگریکردن وتی: بۆچی پێدەکەنن و گاڵتە بە (عەلیاء) دەکەن، ئایا هاوڕێی پۆلمان نیە؟ ئایا ماوەیەك لەمەوپێش هاوڕێمان نەبوو لەشەونشین و ئاهەنگ و بێ ئاگاییەکانماندا و ئیتر خوای گەورە ڕێنومایی کرد... پیرۆزی بێت، ئەو ئێستا لەمیحرابدایەو لەگەڵ قورئان و نوێژەکانیدایە.. و ئێمەش لە بێهودەیی و ئارەزواتی خۆماندایین... ئەو بەدوای ڕۆژی دواییدا دەگەڕێت، ئەی ئێمە بەدوای چیدا دەگەڕێین؟... خۆیان بێئاگا کرد لە پرسیارەکەی.

یەکێکی تریان هەڵی دایەو وتی: چوین بۆلای واتە بۆلای (عەلیاء) تابانگی بکەین بۆ ئەم ئاهەنگی لەدایك بوونە، بەڵام داوای لێبوردنی کرد، لەبری ئەوە ئامۆژگاریەکی درێژی کردین سەبارەت بە ڕەوشت و ئاین و داب و نەریتی کۆمەڵایەتی...

(بەنان) وتی: (عەلیاء) هەژارە: پێش ئەوەی ئەم هەوەسە ئاینیەی توش ببێت و بیفڕێنن لە نێوانماندا کەسێکی عاقڵ و سەربەست بوو...

منیش وتم: سبحان الله، ئاین بووه بەشتێکی هەوەس و شێتی...

پاشان (بەنان) بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی و ووتی: بەڕاستی (عەلیاء) هەژارە، زۆر بەخێرایی هەڵگەڕایەوە، بیروفیکری ژەهراوی بوو و ڕواڵەتیشکی گۆڕا، پۆشاکی درێژی پۆشی و دیمەنی وەکو ئافرەتە بەتەمەن و جوتیارەکانی لێهات، باوەڕی بەوە نەبوو کە باشترین پۆشاك سادەو کەمترینیانە.. سەیرتریش لەوە قژی بوو، بوو بە کاڵایەکی حەرامی داپۆشراو لەژێر سەرپۆشێکی ڕەشدا، (عەلیاء) هەژارە، لەبیری چوو کە خوا تەنها دڵەکانمانی مەبەستە.. ئیتر هەموو شتێکی بەدەر لەوە ڕواڵەتە..

(ئای خوایەگیان بالاپۆشین و پابەندبوون بەئاینەوە بوە بەڕواڵەت و هیچ بەهایەکی نیە... خوای گەورە ئەوشاشەو کەناڵانە لەناوبەرێت کە ئەو فەسادە بڵاو دەکەنەوە...)

پاشان (بەنان) بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی دەربارەی (عەلیاء) و ووتی: ئەو لەئاگر دەمانترسێنێ، کە جەستە دانەپۆشراوەکانمانی پێ دەسوتێ.. لەشتێك ئاگادارمان دەکاتەوە کەناوی مردنە... وە لەشتێکی تر کەناوی لێپرسینەوەو حەشرە... بەڵکو کچان گوێ بگرن ئەو بەرپرسیاریەتی سەرگەدان بوونی لاوانی کوڕو پیاوان دەخاتە سەرشانی ئێمە...

یەکێکیان ووتی: بەڵێ وەسوەسەو دڵەڕاوکێ ئەوی کوشتووە... لەبیری چووە کە پیاوان بۆ ئێمە دروستکراون و ئێمەش بۆ ئەوان دروستکراوین... (عەلیاء) هەژارە لەکوێ لاوی خەونەکانی دەبینێتەوە؟ لەکوێ بەختەوەری و هاودەمی خۆی دەبینێتەوە؟ بەم ئاینە خۆیی کوشتووەو هێشتا لەبەهاری تەمەنیدایە، پێویستە شتێك بکەین بۆ ڕزگارکردنی... دەنگەکان بەرزبوونەوە: پێویستە ڕزگار بکرێت.. پێویستە ڕزگار بکرێت، پێش ئەوەی خۆی بکوژێت بەخواپەرستی زۆر و هۆگربوون بەماڵەوە... نەچوون بۆ بازاڕ و نەچوون بۆ ئاهەنگەکان... ئەم تێگەیشتنە هەڵەیە چیە لە ئاین؟ ژیان خۆشی و سەربەستی یە... ئێستا چیمان داوە لەمردن... بەڵێ دەمرین بەڵام کاتێك کە پیرو کەنەفت دەبین...

ئاهەنگەکە کۆتایی هات و حەوت ساڵ بەسەریدا تێپەڕی: کچەکان خوێندنیان تەواو کرد و (بەنان) و (عەلیاء)یش خوێندنیان تەواوکردو (عەلیاء)یش لەسەر

خۆڕاگری و پابەندبوونی خۆی مایەوە.. ئەی ئایا (بەنان) چی بەسەرهات و، (عەلیاء) و ئەوانی تریش چیان لێ هات؟؟

لەگەڵمان بن و باش گوێم لێ بگرن تا بەردەوام بین لەسەر چیرۆکەکەمان بەڵام لەشوێنێکی تر.. لەیەکێ لەنەخۆشخانەکانداو لەنهۆمی چوارەمداو لەیەکێ لەژوورەکاندا دەنگی ناڵەی نەخۆشێك ژوورەکەی پڕ کردبوو، ئا لەو ژوورەدا چەند مانگێکە بەردەوام ئەو دەنگەی لێ نابڕێت، پزیشکان بێزار بووبوون لەحاڵەتەکەی.. دەنگی ناڵەو ئازاری ئاسایی بوو بوو لە نەخۆشخانەکەدا، کەس نەیدەتوانی هیچی بۆ بکات، پەرستارەکان ڕاهاتبوون لەسەر گوێ بیستی ناڵەو واوەیلاکانی.. تا شەوێکیان پزیشکێکی ئافرەتی نوێ چووە ئەو نەخۆشخانەوە... ئەو ڕۆژە نۆرەی ئەو بوو بەسەر نەخۆشەکاندا بگەڕێت، دەستی کرد بەسەردانی ژووری نەخۆشەکان... لەپڕ گوێی لەوناڵەو هاوارەبوو بۆیە نەیتوانی خۆی بێ ئاگا بکات لێی، بۆیە هەندێ داودەرمان و هێمنکەرەوەی هەڵگرت و بەرەو ژوورەکە ڕۆشت، و دەرگاکەی کردەوە، بینی ئافرەتێك لەنیوە بێهۆشیدایەو لەسەر سیستەمێك کەوتووە... لێدانی دڵی پێواو بینی لێدانێکی لاوازەو خەریکە دەوەستێت... گوێی گرت لەهەناسەدانی، هەناسەکانیشی زۆر هێواش و تێکچوانەبوو... لەپاڵیدا دانیشت و هەندێ دەرمانی بوژانەوەو هێمنکەرەوەی پێدا، پاش کەمێك هاتەوە هۆش خۆیی و ڕێك بوویەوە لەسەر قەرەوێڵەکەی، نەخۆشەکە چاوی گێڕا بەچواردەوری خۆیداو پاشان تێڕوانینەکەی لەسەر ڕوخساری پزیشکە ئافرەتەکە وەستاو بەهەردوو دەستە لاوازەکانی دەستی کرد بەپڕواندنی چاوەکانی... پاشان زیاتر ئەبڵەق بوو سەری سوڕما.. پاشان ووتی بە پزیشکەکە: سوێندت ئەیەم پێم بڵێ تۆ کێیت؟ وا هەست دەکەم کە دەتناسم؟

پزیشکەکە ووتی: من پزیشکم دادەگیان.

نەخۆشەکە ووتی: من دەربارەی پیشەکەت پرسیارت لێ ناکەم، من دەمەوێ بزانم ناوت چی یە؟ سوێندت ئەیەم بەخوای گەورە ئایا تۆ (عەلیاء)نیت، بەڵێ تۆ (عەلیاء)یت..

پزیشکە ووتی: بەڵێ من (عەلیاء)م، هەر لەوساتەدا نەخۆشەکە بەدەستەکانی بەسەرسوڕمانەوە ئامێزی بۆگرتەوەو نای بەسنگیەوەو ماچی کردو دەستی کرد

**بەگریان.. (عەلیاء)یش زیاتر لەو هەڵوێستە سەیرە سەری سوڕما.. و لەخۆیی پرسی دەبێ ئەم نەخۆشە کێ بێت؟ تۆ بڵێی شێتی لەگەڵدا نەبێت؟؟ بەڵام چۆن منی ناسی و من پێشتر ئەوم نەبینیوە؟ پێشتر چارەسەریم نەکردووەو بەڵکو ئەمە یەکەم شەومە لەم نەخۆشخانەیەدا وەك پزیشکێکی نۆبە؟**

**(عەلیاء) بیری ڕابردووی خۆیی کردەوەو بەسەرسامی و حەپەساویەوە تەماشای نەخۆشەکەی دەکرد و نەیدەزانی چی بکات... تەنها ئەوە نەبێ لێی پرسی: دادەگیان تۆ کێیت؟ چۆن ناوی منت زانی؟ ئایا پێشتر یەکتریمان بینیوە؟**

**نەخۆشەکە بەدەنگێکی نیوەقوت دراوەوە ووتی: بەڵێ ئەی (عەلیاء) زۆر زۆر یەکتریمان بینیوە، ناوو ووێنەی تۆ لەبیروهۆشم دانەبڕاوە بەتایبەتی کاتێك توشی ئەم نەخۆشیە بووم پێش سێ ساڵ... ئاە ئەی (عەلیاء)من گۆشتی تۆم خواردو گاڵتەم پێکردیت، من (بەنان)ی هاوڕێی تۆم ئەی (عەلیاء) پاشان دەستی کرد بەگریان و لاوانەوە...**

**(عەلیاء) توشی شۆك بوو نەیتوانی قسە بکات... لەکاتێکدا نەیدەتوانی بڕوا بەوقسانە بکات ووتی: سوێندت ئەیەم بەخوا ئایا تۆ (بەنان)یت؟ هەرگیز (بەنان) هەروەکو ناوەکەی بچوك و گەشاوەبوو..!**

**(بەنان) بەدەنگێکی هێواشی پچڕ پچڕەوە ووتی: بەڵێ من ئەو کەسەم کە ڕۆژێك هەبوو پێیان دەوتم (بەنان).**

**(عەلیاء) نای بەسنگیەوەو بەتاس و ئازارەوە دەستی کرد بەگریان... کاتێ گریانیان هێور بوویەوە (بەنان) دەستی کرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی حەوت ساڵی خۆی، لەوکاتەوەی لەم هاوڕێیەی جیابووبوویەوە، ووتی: بەکالۆریم تەواوکرد و هەوڵمدا درێژە بەخوێندن بدەم، بەڵام نەمتوانی... زۆر سەرسەخت و سەرەڕۆبووم لەهەمووشتێ... گومانم لە دەسەڵاتی خوا نەبوو، بەڵام لەو بڕوادابووم خوای گەورە داوای لێکردوم دڵم باش بێت و بەس... ئاشنابووبووم بەزۆرێك لەکوڕان و کچان... پاشان ئاشنابووم بەپیاوێك لەسەر وەزیفەکەم و پەیوەست بووم پێیەوەو خۆشی دەویستم و خۆشم دەویست... بەڵام ژیانێکی بێئاگاییمان دەبردە سەر دوور لەخوا، پاشان دوای هاوسەرگیریمان خوای گەورە کچێکی جوان و قەشەنگی پێ بەخشین**

ناوم نا (سەوسەن) لەسەر ناوی ئەو هاورێیەم کە دەیناسیت... پاشان وورده وورده ئازارێك لەسکم پەیدابوو... خۆم نیشانی پزیشکان داو دەیانوت: ئەوە برینی گەدەیە، دەستم کرد بە بەکارهێنانی دەرمان بەبێ سوود، ئازارەکەم زیادی دەکرد، خەمەکانم زیادی دەکرد، منیش بەزۆرێك لەبێ ئاگایی و تیاچوونەوە ڕام دەکرد لێی، پاشان تەندروستیم تێك چوو، لەپشکنینی نوێدا دەرکەوت کە وەرەمێکی پیس لەگەدەمدا دروست بووە، ووردەوورده لێی کردووم بە شێرپەنجە.. پاشان شێرپەنجەکە زیادی کردو هێرشی کردە سەرم تا ئالێرەدا خستمی، لێرە زۆرانبازی لەگەڵ ئازاردا دەکەم و لەهەر ساتێکدا بێت چاوەڕوانی مردنم... چوار مانگە کچەکەمم نەبینیوە، ئێستا تەمەنی چوار ساڵە... مێردەکەشم دوو هەفتەیە سەردانی نەکردووم... ماندوو بووە لە دیدەنی کردنم هەموو ڕۆژێك، لەوانەیە بێزارم کردبێت یان ڕقی لێم بێت...

کاتێ (عەلیاء) گوێی لەبەسەرهاتەکەی گرتبوو نەیتوانی لەوە زیاتر خۆی بگرێت و بەتاسەوە دەستی کرد بەگریان... پاشان زاڵ بوو بەسەرخۆیداو هەستا بۆلای (بەنان) ونای بەسنگیەوەو لاواندیەوەو هێوری کردەوەو پێی ووت: (بەنان)گیان چۆك دانەدەیت و بێ ئومێد نەبیت... من تۆم بەخۆڕاگرو بەهێز ناسیوە، بێئومێد مەبە لەڕەحمەتی خوا... هەرگیز تەسلیمی بێئومێدی نەبیت... پشت بەخوا، خوای گەورە شیفا بەخشت دەبێت، لەوانەیە ئەمە تاقیکردنەوە بێت و تەسلیمی قەزاو قەدەری خوا ببەو ئارام بگرە، چونکە ئارامگرتن شتێکی جوانەو خوای گەورە لەگەڵ ئارامگراندایە..

(بەنان) هێمن بوویەوەو هەر دەیوت: خوایەگیان بم بەخشە، خوایەگیان بم بەخشە.. لەتۆ زیاتر کەسم نیە... ئایا قبوڵم دەکیت... بەڕەحمەتی خۆت خوایەگیان خۆزگە تاقیکردنەوە دەبوو... نەخێر ئەمە تۆڵەیە، ئەمە تۆڵەیە بۆ ئەوکەسانەی کە بوونە قوربانیی هەڵخەڵەتان و سەرگەردانی من... (عەلیاء)گیان ئەمە تۆڵەیە.. چەندە قسەکانی دایکی نازدارمم پشت گوێ دەخست... چەندە قسەی ئامۆژگاریکەران و خۆشەویستانم پشت گوێ دەخست... خوایەگیان چەندین کوڕم سەرگەردان کرد، چەندین کچم سەرەڕۆکرد!! پاشان هەردەیوت: نزیك بەرەوە لێم ئەی مردن... نزیك بەرەوە لێم ئەی مردن، مادام بەردەوام خەونەکانم هەڵیان خەڵەتانم، من واگومانم دەبرد

که تۆ تەنها گەورەو پیرەکان دەبەیتەوەو واز لەلاوەکان دێنیت.. شەیتان و دەروونی خۆم هەڵیان خەڵەتانم... درێژیی هیواو ئومێدم سەرگەردانی کردم...

پاشان لە(عەلیاء)ی پرسی: ئایا ڕاستە (عەلیاء) قەبر تاریکستانە؟ ....(عەلیاء) ئایا ڕاستە گۆڕ تەنگ و تەسکە؟ وەڵامی خۆیشی دەدایەوە: بەڵێ ڕاستە، بەم نزیکانە دەبرێم بۆ ئەوێ بەجەستەیەکی ساردو خامۆشەوە.. لەوێ نەکەس و کارو نەخۆشەویستانم لەگەڵمدا نامرن، هیچ سەروەت و سامان و پۆشاکێکم پێ نابێت، وە مێردو هاوڕێ یانیشم لەگەڵدا نابێت، خوایەگیان چۆن دورکەومەوە لە (سەوسەن)ی جگەرگۆشەم... من هێشتامنداڵم و تێر نەبووم لەژیان... پاشان دەستی گرت بەپرچیەوەو ووتی: ئایا بەڕاست تۆ تاڵ تاڵ دەوەریت لەناو گۆڕدا... پاشان دەستی برد بۆ چاوەکانی و ووتی: بەئێوە ڕوناکی دەبینم ئای چەندە دەمڕوانیە کوڕان، ئایا بەڕاست کرم دەتانخوات و خاك قەپتان پیادا دەکات؟؟

(عەلیاء) ئامێزی بۆگرتەوەو ئای بەسنگیەوەو دەستی کرد بە قورئان خوێندن بەسەریداو داوای شیفای بۆکردو هەر دەیوت: (بەنان)گیان بەسە، (بەنان)گیان بەسە، بێئومێد مەبە لەڕەحمەتی خوا.. بێئومێد مەبە لەڕەحمەتی خوا...

(بەنان) ووتی: سوێندت ئەیەم بەخوا (عەلیاء) گیان، ئایا خوا لەهەموو ئەو کردەوانەم خۆش دەبێت کە کردومن؟

(عەلیاء)یش بەدەنگێکی ئاشکرا ووتی: چۆن نا ئەی (بەنان) ئایا خوای گەورە لەبەخشندەییدا بێ سنور نییە... ئایا خوای گەورە لێبوردەو میهرەبان نییە... ئایا گوێت لەفەرمایشتی پەروەردگار نەبووە کە دەفەرموێ ﴿ قُلْ يَاعِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لاَ تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾

(بەنان) ووتی: توخوا (عەلیاء) ئیتر بانگم مەکە (بەنان) بەڵکو بانگم کە (زاڵم).. بانگمکە (زاڵم).. بەڵێ زاڵم... زوڵمێکی زۆرم لەخۆم کرد..پاشان بەتوانایەکی سەیرەوە (بەنان) لەسەر جێگاکەی ڕاست بوویەوەو دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان بە لەرزەوە لەخوا دەپاڕایەوەو بە خشوعەوە دەیوت: پەروەردگارا تۆشایەت بە کە من گەڕامەوە بۆلات و ڕوم کردە قاپی میهرەبانی تۆ،... پەروەردگارا ئەگەر شیفات بۆ نوسیم کە

ئەمە نارەحەت نیە لەسەر تۆ کە پزیشکان و دانایان دەستەوسان بوون لەبەردەمیدا... بەڵێن دەدەم پەروەردگارم کە هەرگیز سەرپێچیت نەکەم.. پەروەردگارا ئەگەر مردنی پێش وەختت لەسەر نوسیبم، شایەتی دەدەم کە من بێئومێد نابم لەڕەحمەت و میهرەبانیت و پشت ناکەمە لێبوردەیی تۆو بێئومێد نابم... مادام لەسنگمدا دەرونێك هەیە هەناسە دەیات... ئەی بەخشندەی دونیاو قیامەت.. خوایەگیان زوڵمێکی گەورەم لەخۆم کرد، وە کەس لەگوناهەکان خۆش نابێت تۆ نەبیت وەبەڕاستی تەنها تۆ لێبوردەو میهرەبانیت.

(بەدەستکاریەوە لەچیرۆکێکی شێخ خالد الراشد)

# ٦٥- ﴿كۆتایی زوڵم﴾

ئافرەتێك وتی: من ژنم و دایکی کوڕو کچێکم، هەر لەسەرەتای ژیانی هاوسەریمەوە بە ئاسوودەیی و بەختەوەری لەگەڵ مێردەکەمدا بەخۆشی دەژیاین، بەدرێژایی ژیانی خێزانداریم پشتم دەبەست بەپەروەرشیارانی ئافرەت بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانم، بەڵام هیچ کامێکیان زیاتر لە دوومانگ نەدەمانەوە لەلامان و بەهۆی دڵڕەقی و خوو نەریتی شەڕانگێزی مێردەکەمەوە ڕایان دەکرد، چونکە بەباشی فێری هونەری ئازاردانی پەروەرشیارەکان بووبوو، کە لەلامان کاریان دەکرد، و نکوڵی لەوەناکەم لەهەندێ کاتدا منیش بەشداری تاوانەکانی بووم..

کاتێ کچەکەم تەمەنی گەشتە حەوت ساڵان و کوڕەکەشم چووە قۆناغی ئامادەیی، کشتیارێك کە خزمی مێردەکەم بوو هات بۆ ماڵمان و کچێکی خۆیی لەگەڵدابوو کە تەمەنی حەوت ساڵان بوو، مێردەکەم بەگەرمی و خۆبەزلزانیەوە پێشوازی لێکرد.

کشتیارە سادەکە وتی: من هاتووم تا کچەکەم کاریکات لاتان بەرامبەر بیست جونەیە لەمانگێکدا، ئێمەش ڕازی بووین، بۆیە کشتیارەکە منداڵەکەی بەگریانەوە جێهێشت کاتێك دەستی گرتبوو بە پۆشاکەکانی باوکیەوە، بەڵام پیاوەکە بەچاوی پڕ فرمێسکەوە ڕۆشت و کچەکەی جێ هێشت لامان.

بەو شێوەیە کچەکە ژیانی نوێی لەگەڵ ئێمەدا بردە سەر، بەیانیان زوو هەڵدەستا تاوەکو یارمەتیم بدات لە ئامادەکردنی خواردن بۆ منداڵەکەم، پاشان جانتاکانی قوتابخانەی هەڵدەگرت و دەیبردن بۆ سەرشەقامەکەو لەگەڵ کوڕو کچەکەمدا دەوەستا تا پاسی قوتابخانە هەڵی دەگرتن... دەگەڕایەوە بۆ شوققەکە ئینجا نانی بەیانی دەخوراد، زۆرجار پاقلەبوو بەبێ زەیت، و نانێك کە خەریك بوو خراپ دەبوو، پاشان دەستی دەکرد بە ئەنجامدانی کارەکانی ناوماڵ لەپاککردنەوەو سڕین و کڕینی سەوزەو وەڵامدانەوەی داواکاریەکان تاکو نیوەشەو...

ئەوکاتەش وەکو مردوو دەکەوت بەزەویداو خەوی لێ دەکەوت، لەکاتی هەر کەمتەرخەمی یان لەبیرچوون یان دواخستنی ڕاپەڕاندنی هەرکارێکدا کە لێی داوادەکرا مێردەکەم زۆر بەتوندی و سەختی لێی دەیا، ئەویش بەگریان و ئارامگرتنەوە لەژێر لێداندا دانی بەخۆدا دەگرت... لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دەستپاك و

پاکوخاوێن و دڵسۆز بوو بۆمان، هەتا ئەو ڕادەیەی بەسادەترین شت کە پێشکەشیمان بکردایە کە کەم جار شتی وامان دەکرد دڵی خۆش دەبوو...

لەگەڵ دان پیانانم کە منیش هاوبەشی بووم لەگەڵ مێردەکەمدا کاتێ کە ئازاری کارەکەرەکانی دەداو فێربووبوو بەلێدانیان.. بەڵام من زۆرجار بەزەییم بەم کچەیاندا دەهاتەوە، بەهۆی پیرۆزی و خۆبەکەم زانینی لەبەردەممانـدا، بۆیە تکام دەکرد لەمێردەکەم کە لێی نەیا، ئەویش پێی دەووتم: ئەم جۆرە کەسانە هەڵسوکەوتی هێمنانەو باش لەگەڵیاندا هیچ سودێکی نیە.

بەوشێوەیە، کچەکە بەبێ دەنگی و ئارامیەوە خۆڕاگربوو لەژێر ئەو سزادانەدا، دەبێ ئەوەش بڵێم کاتێ جەژن دەهات کوڕو کچەکەم بە دڵخۆشیەوە دەچوونە دەرەوەو ئەم منداڵە هەژارەش لەماڵەوە دەمایەوەو ماڵی پاك دەکردەوەو شتی دەشت بەبێ ئەوەی بەزەییمان پیایدا بێتەوە...

زۆر بەکەمی باوکیمان دەبینی تەنها چەندجارێك نەبێت ئەویش بۆ وەرگرتنی کرێکەی، وە هەندێ جار یەکێ لەخزمانی دەنارد تاکرێی مانگانەکە وەربگرێت، وە هەروەها دایکی و خوشکەکانی نەبینران تەنها لەسێ بۆنەی دیاریکراودا نەبێت (جاری یەکەم) کاتێ برا گەورەکەی وەفاتی کرد (جاری دووەم) کاتێ تووشی نەخۆشیەکی درم بوو ،دەترساین میکرۆبەکەش بگوازێتەوە بۆ منداڵەکانمان بۆیە ناردمانەوە بۆ شارەکەی خۆی (جاری سێیەم)یش: لەکاتی وەفاتی باوکیدا.

بەو شێوەیە بەردەوام دڵڕەق بووین لەسزادانیدا ئەگەر هەر هەڵەیەکی بکردایە، بە جۆرێك مێردەکەم بە کێبڵی کارەبا لێی دەیا!! زۆرجاریش لەشەوە ساردە سەختەکاندا بێ بەشمان دەکرد لەنان خواردنی ئێواران و ئەویش بەبرسیەتی ڕۆژی لێ دەبوویەوە، لەبیرم نایەت کە ساڵانێکی درێژە شەوێك بەبێ گریان خەوتبێت!!

ئەو ئافرەتەی بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەوانەیە بپرسیت بۆچی ئەو کچە هەموو ئەو ئازارانەی قبوڵ دەکرد،بۆ ڕاینەدەکرد لەناو ئەو دۆزەخەی ئێوەدا؟

لەڕاستیدا: کاتێ کچەکە گەیشتە تەمەنی گەنجێتی، ڕۆژێکیان ڕۆیشتە دەرەوە بۆ کڕینی سەوزەو نەگەڕایەوە، مێردەکەم پرسیاری کرد لەدەرگاوانەکە، ئەویش دانی بەوەدانا کە ئەو کچە بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ لاوێکدا قسەی دەکرد کە ئیش دەکات

لەلای قەسابێك لەهەمان شەقامدا، وە ئەگەری ئەوە هەیە ڕێکەوتبێت لەگەڵی لەسەر زەواج، تادووری بخاتەوە لەو ژیانە دەردیسەریە...

بەڵام هەفتەیەکی نەبرد لایەنگرانی مێردەکەم توانیان لەو شوێنەدا کە خۆی حەشاردابوو بیهێننەوە، کچەکە لەکاتی ڕۆشتنا زۆر لەتری ئەبرد، بردمان نیشانی پزیشکماندا، ئەویش پێی ووتین کە چاوی زۆر کزبووە، وە ئەو ئێستا ژێرپێی خۆی نابینێت واتە: ئەو ئێستا نیمچە کوێرە، لەگەڵ ئەوەشدا بەزەییمان پیایدا نەدەهاتەوەو بەردەوام هەموو ئیش و کاری ماڵەوەی دەکردو دەچووە دەرەوەش بۆ کڕینی سەوزەوات، زۆرجار ئەگەر سەوزەی تازەی نەهێنایەتەوە لەبازاڕ منیش زوڵمم لێ ئەیا، بۆیە ژنی دەرگاوانەکە بەزەیی پیادا هاتەوەو ئەو دەڕۆشت سەوزەی دەکڕی بۆی تا ڕزگاری بکات لەسوکایەتی پێکردن و لێدان.

گوزەرانمان بۆ ماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە بەسەر برد، پاشان ڕۆژێکیان کچەکە لەماڵ چوویە دەرەوە دوای ئەوەی نیوە کوێر بوو بوو و ئیتر جارێکی تر نەگەڕایەوە، ئێمەش ئەم جارەیان هیچ گرنگیەکمان نەیایە بۆ دۆزینەوەی و گەڕان بەدوایدا..

ساڵان گوزەران و مێردەکەم خانەنشین کراو پۆستەکەی و لایەنگرانی لەدەستدا، کوڕەکەشم زانکۆی تەواوکردو چووە سەر کاری خۆی و ژنی هێنا و ئێمەش دڵخۆش بووین بەژن هێنانەکەی و بەتەواوی دڵخۆش بووین کاتێ کە زانیمان ژنەکەی سکی هەیە، دوای تەواوبوونی ماوەی سکەکەی منداڵی بوو، بۆمان دەرکەوت کە منداڵەکەی کوێر (نابینا)یە، بەڕاستی شۆکێکی گەورە بوو بۆسەر ئێمە، خۆشی و شادیمان گۆڕا بۆ ماتەمینی.. نیشانی چەندین پزیشکماندا بەڵام سوودی نەبوو، کوڕەکەم و ژنەکەی تەسلیمی ئەمری واقیع بوون، کوڕەزاکەمان نارد بۆ دایەنگای (نابینایان)، بوکەکەمان بڕیاریدا کە ئیتر نەهێڵێ سکی ببێت لەترسی دووبارەبوونەوەی ئەو کارەساتە.

بەڵام پزیشکان دڵنیایان کردو هانیاندا لەسەر سك بوون و ئێمەش هانماندا، بۆیە سکی بوو، منداڵێکی جوانکیلەی کچی بوو، پزیشکەکە مژدەی پێدان کە ئەم منداڵەیان وەك هەموو منداڵێکی ئاسایی تر دەبێت، بۆیە دووجار دڵخۆش بووین پێی، بەڵام دوای تێپەڕبوونی حەوت مانگ هەستمان کرد کە تێڕوانینی بۆ یەك ئاڕاستەیەو لانادات لێی، بۆیە نیشانی پزیشکی پسپۆڕی چاوماندا، ئەویش هەواڵێکی پێدان کە

زۆر لـەوەی پێـشووتر نارەحـەتتر بـوو، ئـەویش ئەوەیـە کـە ئـەم کـچە منداڵـە تـەنها تروسکاییەك لەڕووناکی دەبینێت، ئەمیش مەترسی ئەوەی هەیە کەبەتەواوی بینـایی لەدەسـت بـدات، بۆیـە مێردەکـەم تووشـی حاڵـەتێکی دەروونـی بـوو ..ڕۆژگـاری لەبەرچاوکەوت و ڕقی لەهـەموو شتێك دەبوویەوە، پزیشکان ئامۆژگاریان کردین کە بیخەینە نەخۆشخانەی دەروونیەوە تا چارەسەری ئەو (خۆکی)یەی بکرێت.

منیش دوای ئـەو دڵـم بەتـەواوی گوشرا، سـەرەتا هـەر بیرم ئەکردەوە وەك ئـەوەی لەبەردەم خەونێکی هەسارانکەردا بم.. تۆ بڵێی هۆکاری ئەم بەڵایە چی بێت... لەپڕ کارەکەرە دڵشکاوەکەم هاتەوە یاد کە بە کوێریی لەو دۆزەخەی ئێمە ڕایکردبوو، دوای ئەوەی دەسـاڵی لەگـەڵ ئێمـەدا بەسـەر بـرد کـە لـەو ماوەیـەدا تـاڵاوی لێدان بـە کێبڵـی کارەبـاو زڵلـەو سـوکایەتی پێکـردن و بێبەشـکردنی دەچەشـت، لـە بێئاراميـدا تـەواو دەروونم بێتاقـەت بـوو، ئایـا ئەمـە تۆڵـەو سزای خوایـە بـەهۆی خـراپ مامەڵەکردنمان لەگەڵ ئەو کچەدا؟!

وێنـەی ئـەو کـچە هـەتیوەی کـە گوێمـان نـەدا بەچارەسـەرکردنی و هۆکـاربووین لـەکوێربوونی هەمیـشە لەتەنهاییمـدا لەبەرچـاومدابوو، بۆیـە ئومێـدم هـەبوو کـە پـەروەردگارم لـێم ببورێـت و بکەومـە خـۆم پـێش ئـەوەی کـار لـەکار بـترازێ... بـەو ئومێدەی بەڵکو ببمە هۆی چاکسازی شتێك دوای ئەوەی کە خراپمان کردبوو.

بۆیـە دەسـتم کـرد بەگـەڕان بـەدوای ئـەو کارەکـەرە بەسـتەزمانەدا، دوای گـەڕان و پرسـیارکردن زانیمـان کـە لەیـەکێ لەمزگەوتەکانـدا وەك خـادیم ئـیش دەکـات، چـووم بـۆلای تابیهێنمـەوە و لەگەڵمـدا بـژی هـەتا لەژیانـدا مـاوم، کـاتێ زانـی چـووم بـۆلای و سۆراخی دەکـەم، لەگـەڵ ئـەو هـەموو یادگاریـە تاڵـەدا دڵـی خـۆش بـوو، بەڕاسـتی ئـەو بەتەواوەتی پێچەوانەی ئێمە بوو... دڵساف و پاك بوو..

ئـەو پێکـەوە ژیانـەی لەبیرنەچـوو بـوو کـە ئێمـە لـەبیرمان چـوو بـوو، بەهـەرحاڵ پۆشاکەکانی کـۆکردەوەو لەگەڵمـدا گەڕایـەوە، کـاتێ مـن دەسـتیم گرتبـوو هەسـتی بـە ڕێگاکە دەکرد.

کچەکە جێگیر بوو لەگەڵمانداو منیش چاودێریم دەکرد.. خزمەتی ئەوو هەردوو کوڕەزا کوێرەکەمم دەکرد و ئومێدم و تکام لەپەروەردگار ئەوەبوو کەلێم خۆش بێت لەو کردەوانەم کە پێشتر کردوومە چونکە بەڕاستی پەروەردگارم لێبوردەو میهرەبانە..

ئەوەتا من ڕووی دەمم دەکەمە ئەوکەسانەی کە بەزەیی لەدڵەکانیاندا نەماوە.

لاتظلمنَّ إذا ماكنتَ مقتدراً    فالظلم مرتعه يُفضي الى النَّدم

تنام عينكَ والمظلومُ منتبهٌ    يدعوا عليك وعين الله لم تَنمُ

واتە:

ئەگەر دەسەڵاتدار بویت زوڵم مەکە    چونکە ئاییندەی زوڵم هەر پەشیمانیە

چاوەکانی تۆ دەخەون و زوڵم لێکراویش هەر بەئاگایە    دووعات لێ دەکات و خوای گەورەش بەئاگایەو نەخەوتووە.

﴿ڕۆژنامەی (الأهرام)ی میسری. بەدەستکارییەوە﴾

## ٦٦- ﴿نكوڵی کردن لەمافەکانی خەڵکی﴾

(تورکی محمد) ووتی: بڕی (سەد هەزار ریاڵ)م لەپیاوێك قەرز کرد، لەپێناوی تەواوکردنی یەکێ لەپڕۆژەکان، دوای تەواوبوونی ماوە دیاریکراوەکەم خاوەنی پارەکە هات بۆ داواکردنەوەی پارەکەی تا بیدەمەوە، بەڵام من هەستام بەدەرکردنی و نکوڵیم کرد لەوەی کە ئەو بڕە پارەیەی یابێت بەمن، بەتایبەتی ئەو هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەبوو کە لەمنی وەرگرتبێت.

نەشم ئەزانی بەهۆی ئەم زوڵمەوە هیچم بەسەردێت، دوای تێپەڕبوونی سێ مانگ، گرێبەستێکم لەکیس چوو بەبڕی (نیو ملیۆن ریاڵ)، لەوڕۆژە بەدواوە بەردەوام هەر زەرەرم دەکرد، ژنەکەم ئامۆژگاری کردم کە ئەو بڕە پارەیە بگەڕێنمەوە بۆ خاوەنەکەی، چونکە ئەوەی کە بەسەرماندا دێت سزایە لەلایەن خوای گەورەوە، بەڵام بەداخەوە گوێم بۆ نەگرت و بەبێ موبالات ئینکاریم دەکرد و فوم دەکردە خۆم، گوێم نەیا بەوەی کەپەروەردگار چاوی لێمە.. تا ئازازیترین موڵکی خۆمم لەدەستدا، بەڵێ هەرسێ کوڕەکەمم لەدەستدا لەڕووداوێکی ئۆتۆمبێلدا لەکاتی گەڕانەوەیان لەشاری (الدّمام).

لەکۆتاییدا و لەبەردەم ئەو رووداوە تۆقێنەرەدا بەبێ ڕاڕایی بڕیارمدا کە ئەو مافە بگەڕێنمەوە بۆ خاوەنەکەی، و داوام لێکرد کە لێم ببورێت تا خوای گەورە ژنەکەم و کوڕە حەوت ساڵانەکەمم بپارێزێت لە بەڵا، چونکە دوای خوای گەورە تەنها ئەو دوانەم مابوو کە ئومێدی ژیان بن بۆ من..

# ٦٧- ﴿خراپ بوونی کێڵگەکەم﴾

(سەعد سالم) دەڵێ: خاوەنی کێڵگەیەکی تایبەتی خۆم بووم، لەپاڵیشیدا پارچە زەویەکی کشت و کاڵیی هەبوو، زۆر خەریك بووم لەگەڵ خاوەنەکەی کەوازی لێ بێنێت، بەڵام ئەو ڕازی نەدەبوو.

لەکۆتاییدا هەوڵمدا ئەو زەویەم دەست کەوێت با بەهێزیش بێت، کاتێ کە بۆم دەرکەوت کە هیچ بەڵگەنامەیەکی بەدەستەوە نیە کە موڵکداری ئەو زەویەیە بسەلمێنێ کە لەباوکیەوە بۆی بەجێ مابو..

بۆیە منیش دوو شایەتم ئامادەکردو (شەست هەزار)م یا بە هەریەکێکیان لەبری شایەتیدانیان لەبەردەم دادگادا کە من موڵکداری شەرعیی ئەو زەویەم، دوای چەند دانیشتنێکی دادگا توانیم زەویەکەم دەست بکەوێت و بیکەم بەهی خۆم.

دوای ئەوەی هەوڵم دەدا بیکەم بە کشتوکاڵ، هەوڵی زۆرمدا بەڵام سوودی نەبوو، هەرچەندە پسپۆڕانی ئەو بوارەش بۆیان روون دەکردمەوە کە زەویەکی شیاوە بۆ کشتوکاڵ.

کێڵگە تایبەتەکەی خۆشم ورردە ورردە دەردو مێرووی زەوی زاڵ بوو بەسەریدا لەکاتی چنینەوەی بەروبوومەکەیدا بە جۆرێك زیانێکی زۆرم لێ کەوت... هاوکات لەگەڵ کۆمەڵێ ڕووداوو کارەساتدا کە خەریك بوو خۆشم دەبوومە قوربانیی.

لەکۆتاییدا، هەستام بە گەڕانەوەی زەویەکە بۆ خاوەنەکەی، لەوانەیە بڕوانەکەیت ئەگەر پێت بڵێم: ئەو زەویەی کە پێشتر هیچ بەروبوومێکی نەبوو زۆر لەکێڵگەکەی من بەرهەمدارتر بوو... وە ئەو مێروانەی دابویانە کێڵگەکەی من ورردە ورردە هیچ شوێنەوارێکیان نەما...

وە سوپاسی خوا دەکەم کە ڕێنومایی کردم بۆ گێڕانەوەی ئەو زەویە کە بەزوڵم داگیرم کردبوو، وە ئامۆژگاری هەموو ئەو کەسانە دەکەم کە دەروونیان بەرەو زوڵم رایان دەکێشێ... تاپەندو ئامۆژگاری لەمن و لە هەموو زاڵمێك وەربگرن... چونکە سەرەنجامی زوڵم سەرگەردانیە..

# ﴿خراپیی قوتابیەك﴾

(حەمەد بەدر) دەڵێ: پێش هەشت ساڵ کاتێ قوتابی بووم لەقۆناغی دواناوەندیدا، من و یەکێ لەقوتابیە زیرەکەکان بوو بەشەڕمان... بۆیە بەهۆی ئەو شەڕەوە بڕیارمدا ئایندەی بڕوخێنم..

هەرگیز ئەو ڕۆژە شومە لەبیروهۆشمدا دەرناچێت.. شەیتان وەسوەسەی بۆ دروست کردم کە ڕۆژێکیان بەیانی زوو چووم بۆ قوتابخانە کۆمەڵێ جگەرەو تلیاکم پێ بوو کە ئێمە خۆمان دەمانکێشان و دەمانخوارد...دامنا لە جانتای ئەو قوتابیەدا، و داوام کرد لەیەکێ لە هاوڕێکانم کە هەواڵ بدات بە پۆلیس کە لە قوتابخانەکەدا یەکێك هەیە بڕەو بەمادده بێهۆشکەرەکان دەدات... بۆیە پیلانە شەیتانیەکەمان بەتەواوی سەری گرت.. و ئێمە خۆمان کە مادە بێهۆشکەرەکانمان بەکاردەهێنا شایەت بوین.. لەو ڕۆژەوە من باجی ئەو زوڵمەی خۆم دەدەم... من بوم بوختانم بۆ ئەو کردو توشی نەهامەتیم کرد... پێش دووساڵ تووشی ڕووداوێکی ئۆتۆمبێل هاتم و بەهۆیەوە دەستی ڕاستم لەدەستدا.. دوای ڕووداوەکە چووم بۆ ماڵیان و داوام لێکرد لێم خۆش بێت بەڵام ئەو زۆر بەتوندی ڕازی نەبوو... چونکە من هۆکاری ئەوەبووم ڕێزو حورمەتی ئەو لەکەدار بکەم لەناو خزمانیدا.. و بەهۆی زوڵمی منەوە بووە بە کەسێکی بێزراو لە ناو کۆمەڵگادا، وە پێی ووتم کە هەموو شەوێك دوعای لەمن کردووە، چونکە بەهۆی ئەو فەزاحەتەوە هەموو شتێکی لەدەستدا..

قوتابیە زاڵمەکە ووتی: لەگەڵ ئەوەدا دەستێکم لەدەستدابوو، بەهۆی ڕووداوێکی تریشەوە لە چوار پەل کەوتم و بەهۆی کورسی کەمئەندامیەوە دەبزوام... من ئێستا ژیانێکی سەخت بەسەردەبەم.. وە خەڵکی دەترسێنم کە هۆشیاربن وەك چۆن من لەمردنیش دەترسم چونکە دەترسم لەسزادانی پەروەردگارم و لێپرسینەوەم..وە دەپاڕێمەوە لە خوای گەورە کە لێم خۆش بێت و بیخاتە دڵی ئەویشەوە کە لێم ببورێت و لێم خۆش بێت.

## ٦٩- ﴿ووتو ویژی شەیتانی﴾

بەپەنجەکانی یاری بەژمارەکانی تەلەفۆنەکە دەکرد... لەپڕ یەکێ لەژمارەکانی لێدا.. منداڵێك وەڵامی دایەوە ئەمیش ووتی: ئەلو، ئەلو...... منداڵ: ئەلو... چۆنیت ... تۆ کێیت؟

بەرامبەر: تەمەنت چەندە؟ منداڵ: شەش ساڵ، بەرامبەر: ماشاالله، پیاویت بەخوا... ئایا ئێستا کەست لەپاڵدایە؟ منداڵ: نەخێر... تۆ کێیت؟ بەرامبەر: من مامی تۆم...!

منداڵ (بەدڵخۆشییەکی تەواوەوە): چۆنی مامەگیان.. تۆیت... ئەوەی کە لەسعودیەیە؟

بەرامبەر (بەدەنگێك کە پڕ بوو لەبێئومێدی): بەڵێ.. بەڵێ.. منم لەسعودیەوە.. کوا خوشکەکانت؟ منداڵ: خوشکم نییە بەرامبەر: باشە، ئێستا کێت لەگەڵدایە لەماڵەوە؟

منداڵ: بەس کارەکەرەکە بەرامبەر: جوانە؟ منداڵ: یەع، نەوەڵا جوان نییە

بەرامبەر: کوا دایکت؟ منداڵ: لەگەرماوە خۆی دەشوا بەرامبەر: یا الله، خواحافیز.. و تەلەفۆنەکەی داخست.. دوای چەند خولەکێك... پەیوەندی کردەوە... بەرامبەر: ئەلو... ئەلو

منداڵ: ئەلو... کێیە.. مامەم؟ بەرامبەر: بەڵێ... کوا دایکت؟

منداڵ: چووبۆ ژووری نوستن. بەرامبەر: ئێستا چی لەبەردایە منداڵ: پۆشاکێکی سوری زۆر جوان... هەموی ئاوە. بەرامبەر: یا الله خواحافیز. جارێکی تر تەلەفۆنەکەی داخستەوە... دوای چەند خولەکێك... بەرامبەر: ئەلو... ئەلو.. ئەم جارەیان باوکی منداڵەکە وەڵامی دایەوەو ووتی: ئەلو.. بەڵێ.. کێ قسە ئەکا؟ بەرامبەر: (بەدەنگێکی گاڵتەئامێزەوە): ئەی داماو... دیارە ئێستا لەدەوام گەڕاویتەوە؟

باوکی منداڵەکە: تۆ کێی قسە بکە... چیت دەوێ؟

بەرامبەر: تورە مەبە... بەس ویستم بەڕاشکاوی پێت بڵێم کە ژنێکی جوانت هەیە.. ئەی داماو زانیوتە کێ هەڵبژێریت... پێت دەڵێم، ئەگەر دەشتەوێ بڕوا مەکە.. من پێش تۆزێك لەگەڵ ژنەکەتدا خەوتبووم.. هەتتا داوام لێ کرد جلی سور لەبەر بکات.. و تەلەفۆنەکەی داخست.

باوکی منداڵەکە: هەی سوك.. هەی بێ ئەدەب.. و تەلەفۆنەکەی فڕێدا.. بەپەلە ڕای کرد بۆ قاتی سەرەوە.. چووە ژووری نوستنەوە.. ژنەکەی خۆیی بینی پۆشاکی سوری لەبەردابوو.. قژیشی تەڕبوو.. لەبەردەم تەوالێتدا دانیشتبوو خۆی دەڕازاندەوە.. گرتی و سەری ژنەکەی کێشا بە ئاوێنەکەدا.. پاشان بەشەق و زللە کەوتە لێدانی.. و دەیوت: بڕۆ دەرەوە لەماڵەکەم.. ئەی داوێن پیس.. تۆ لەماڵێکی بەشەرەف و ڕێزەوە نەهاتویت.. ژنەکەشی زۆر بەسەرسوڕمانەوە تەماشای دەکرد.. نەیدەزانی بڵێ چی و وەڵامی چی بداتەوە.. بۆیە بەخێرایی پۆشت و کەل و پەلەکانی خۆی گلێرکردەوە تا بڕواتەوە بۆ ماڵی کەس و کاری..

باوکی منداڵەکەش بەسەرسامی و تورەییەوە دانیشت.. نەی زانی بۆچی وای کرد بەخۆیی و بۆچی ئەوە ڕوویدا... زۆر حەیران مابوو لەکارەکەی خۆی... نەیدەزانی چی بکات... و شکاتی حاڵی خۆی بەرێتە لای کێ... بەهەرحاڵ دوو ڕۆژ بەوشێوەیە تێپەڕی هەستی بەهیچ حەوانەوەیە نەدەکرد... خەویش نەچووبوە چاوانیەوە.

کابرای بەرامبەریش... خوای گەورە سزاکەیی دوانەخستبوو بەڵکو پێشی خستبوو.. ئەگەر بیویستایە بنوێت نەیدەتوانی... هەر ساتی ناساتێك لەسەر جێگاکەی پاڵ دەکەوت.. بەڵام نەیدەتوانی بنوێت، ڕۆژانێکی زۆر بەو شێوەیە مایەوە، لاشەی لاواز بوو، دنیا لەبەرچاوی تەسك بووبوویەوە.. دەیەویست بۆساتێکیش بێت بخەوێت.. بەڵام نەیدەتوانی... تا بەدرێژایی شەو بمێنێتەوەو یادی ئەو کردەوەیەی بکاتەوە کە هێنابووی بەسەر ئەو ئافرەتە بێتاوانەدا...وە بوو بوە هۆی دورخستنەوەی لەمێردەکەی بە تەنها بە یەك تەلەفۆن کردنی شەیتانیانە..

بەهەرحاڵ، پرسیاری لەیەکێ لە شێخەکان کردوو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە..

شێخەکە پێی ووت: بەخوا چارەسەرت نیە ئەوە نەبێ کە دان بەتاوانەکەتدا بنێیت بۆ ئەو ژن و مێردە، بەڵکو خوای گەورە لێت خۆش بێت و بگەڕێیتەوە بۆ حاڵی جارانت.

بەرامبەرەکە: من ئامادەم... بەهەرحاڵ من دەمەوێ بخەوم.. یا شێخ دەمارەکانم خەریکە لەکار دەکەون.. شێخ: دەی کەواتە هەر ئێستا بڕۆو پەیوەندی بە باوکی منداڵەکەوە بکەو ژوانێکی لێ وەربگرە.. منیش ئامادەم لەگەڵتدا بێم.

پیاوەکە پەیوەندی کرد، و ژوانیان دیاری کرد، پیاوەکەو شێخەکە چوونە ژوورەوە، باوکی منداڵەکەش پێشوازیەکی گەرمی لێ کردن.. شێخ وەك سەرەتایەك چەند ئایەتێکی یاد خستنەوەو باسی ئەوەی کرد کە چەندە فەزڵ و بەرەکەتی هەیە بۆ مرۆڤەکان.. و هتد پاشان باسی گەورەیی لێبوردنی کرد... پاشان بەکابرای ووت بەڕاشکاوانەو ڕاستەقینەیی مەسەلەکە بە مێردی ژنەکە بڵێ... پیاوەکە دەستی کرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکەو مێردی ژنەکەش گوێی گرتبوو... لەقسەکانی نەبوویەوە، مێردی ژنەکە ڕاستی بۆ دەرکەوت و هەستایەوە دەستی کرد بە لێدانێکی خەستی پیاوەکە تا خوێنی لەلاشەی هێنا... شێخیش هەوڵی دەدا ناوگژیان بکات.. مێردی ژنەکە دوای لێدانێکی زۆر هێمن بوویەوە... شێخ پێی ووت: جەناب، سوپاس بۆخوا کە ڕاستی ئاشکرا کردو کەسی لێبوردەش لای خوا بەڕێزە... ژنەکەی تۆش پاکیزەو داوێنپاکە.. خواش لەتۆ ڕازی بێت لێی خۆش ببە لەبەر خوای گەورە.

مێرد: بەڵێ( بەهۆی ماندوێتی و زۆری لێدانەکەوە هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو) بەڵام بەیەك مەرج، ئەویش ئەوەیە ئەم تاوانبارە دان بەتاوانەکەیدا بنێ لەبەرچاوی ژنەکەم تا پاکانەبێت بۆ هەڵوێستەکەی من و بگەڕێتەوە... پیاوەکە: من ڕازیم... گرنگ ئەوەیە بتوانم بخەوم...

بۆیە هەموویان ڕۆشتن بۆ ماڵی باوکی ژنەکەی تا ئامادەبێت گوێ لەقسەی شێخ و پیاوەکە بگرێت.. ژنەکە هات... پیاوەکە سەرلەنوێ بەسەرهاتەکەی خۆیی گێڕایەوە... هەرئەوەندەی نەبرد براکانی ژنەکە هەستانەوەو پێکە لێدانێکی باشیان سرەواندە کابرا، خەریك بوو لەهۆش خۆی دەچوو... شێخ هەستایەوەو چەند ئایەتێکی قورئانی خوێند و کەوتە نێوانیانەوە..

لەوکاتەدا ژنەکە هەستایەوە.. و لێدانەکەی وەستاند... هەموان چاوەڕوانیان کرد بزانن چی دەڵێ.. بۆیە قسەی لەگەڵ شێخدا کردو ووتی: یاشێخ.. سوپاس بۆخوا کە حەقیقەت دەرکەوت... بەڵام بەداخەوە ناتوانم بەڵکو مەحاڵە بگەڕێمەوە بۆلای مێردەکەم... ناگەڕێمەوە بۆلای پیاوێك لێم بدات و هەڕەشەی تەڵاقم لێ بکات تەنها بەهۆی پەیوەندیەکی تەلەفۆنی درۆوە...

یاشێخ مانای ئەوەیە: کە متمانە لەنێوانماندا نەماوە.. وە ناتوانم لەگەڵ کەسێکدا بژیم کە متمانەی پێم نەبێت... .پاشان کۆڕەکەی جێ هێشت... بۆیە بەدڵنیاییەوە بەبراکانی ووت: ئەمە کۆتاهەمین وەڵامی منە بۆ ئەوان..

ووتم: خوای گەورە ڕاستی فەرمووە کاتێ کە دەفەرموێ: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَنْ تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ﴾ الحجرات:٦

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر گوناهکارێ هەواڵێکی گرنگی هێنا بۆتان، ئەوە لێی بکۆڵنەوە (تاڕوون ببێتەوە)، نەوەك زیان بگەیەنن، بەخەڵکێك بەنەزانین، ئەوسا پەشیمان بن لەو کارەی کە کردووتانە.

## ٧٠- ﴿بەسەرهاتی من لەگەڵ منداڵەکەمدا﴾

لە یەکێ لەبنەکاکانی چارەسەرکردندا (ب م) ژنی هێنابوو وە حەوت منداڵی هەبوو: ژیانی تلیاك خۆران زەلیلی و ئیهانەیە، کەسی تلیاك خۆر ڕازی دەبێ بەهەموو شتێ لەپێناوی بەدەستخستنی مادەی بێهۆشکەردا.. هەتتا بەهەموو توانات دەگەڕێیت بەدوای هاوڕێ خراپەکاندا.. چونکە ئەوان ڕێنمایی تۆیان کردووە بۆ ئەو ڕێگایە تائەو ژەهرانەت دەست بکەوێت.. بەڕاستی ژیانێکی بێنەوایی و دەردیسەریە.. لەسەرەتا تەنها حەز پێکردنێك بوو بەڵام ئەمڕۆ بۆماوەی بیست ساڵە ژیانێکی دەردیسەری و ژیانێکی سەرشۆڕی بەسەردەبەم...

سەرەتای ڕێگای من بۆ ئەو جیهانە تاریکە لەڕێگای هاوڕێیەکی خراپەوەبوو پێشنیاری کرد بۆم بەڵکو زۆریشی لێ کردم تا بەکاری بهێنم چونکە بەپێی قسەی ئەو بەختەوەری دروست دەکات و بەتەواوی لەش چالاك دەکات!!!

منیش ڕازی بووم خۆزگە ڕازی نەبوومایە، بەهەناسە ساردیەوە ئەمەی ووت... پاشان بەردەوام بوو: دوای ئەوە ڕێگام گرتە بەر و هەستم بەخۆم نەدەکرد، و بڕوام پێ بکە ئەگەر پێت بڵێم نازانم چۆن توانیم بەردەوام بم لەسەری ،چونکە ئەو مادەبێهۆشکەرانە وردە وردە تۆ کەمەندکێش دەکەن تا دەکەویتە داوەکەوەو خۆت ڕازی نابیت لێی دەربازبیت، چۆن نا، ئێمە زۆر کەم نەبێت یادی خوامان نەدەکرد، و هیچ ئاگایەکمان لەنوێژ کردنیش نەبوو کە پایەی ئاینە.. وە دەربارەی ژیانم لەگەڵ ژن و منداڵەکانمدا، زۆرم دەیا لە ژنەکەم و منداڵەکانم، تەنها لەسەر ئەوەی داوای شتێکیان بکردایە با ئاسانیش بووایە.. لەگەڵ ئەو توندوتیژیەمدا لەمامەڵەکردنم لەگەڵیاندا، منداڵەکان بەتەواوی پێچەوانەی ئەوەبوون، ئەگەر بیانبینیمایە دەهاتنە ئامێزمەوە، بەڵام من هیچ گرنگیەکم پێ نەدەدان.. هۆکارەکەشی مادە بێهۆشکەرەکان بوو.. دێتەوە یادم جارێکیان من لەماڵەوە دانیشتبووم، کچەکەم هات بۆلام کەتەمەنی شەش ساڵان بوو بەڕوخسارێکی بەرائەتەوە پێی ووتم: باوکە بۆچی ئێمە زۆر کەم تۆ دەبینین؟؟ پێناکەنیت لەگەڵماندا؟ هەڵدەستا بەجموجوڵی منداڵانە لەگەڵمدا وەکو چوونە سەر پشتم و لەوجۆرە شتانە، بەڵام من کوێر بووم و وەڵامی ئەو بەرائەتەیم نەدایەوە... وەڵامی ئەو خۆشەویستیەم نەدەیایەوە.. من دوای مەست بوونم هەستم بە

هیچ جۆره سۆزێك نەدەكرد.. ئەو هەر یاری لەگەڵ دەكردم پاشان ووتی: وەكو هاوڕێكانم لە قوتابخانە یاریەكم بۆ بكڕە.. ئیتر دنیا لەبەرچاوم تەسك بوویەوەو كاتەكەش شەو بوو، هەستامەوە تێمسرەواندو دەستیم گرت و دەرگاكەم كردەوەو فڕێمدایە سەر شەقامەكەو دەرگاكەم داخستەوە، گوێم لێیەوەبوو دەپاڕایەوە لێم كە ئیتر هەرگیز جارێكی تر داوای هیچ شتێ ناكات... دوای ئەوەی دایكی هەوڵیدا هێنامە ژوورەوە... پاشان لەپڕ پیاوەكە بێدەنگ بوو... ووتی: وێنای بكە لەكچەكەم بدەم و فڕێیدەمە سەر شەقام بەهۆی داواكردنی یاریەكەوە؟؟ ئەوەیە ئاسەواری مادە بێهۆشكەرەكان، بەدەنگێكی بەرز ووتی: بەڵكو ئەم وتانە بگات بەهەموو تلیاكیەك تاحەقیقەتی كارەكەی لای رۆشن بێت... پاشان ووتی: خۆشترینی رۆژنەكانی ژیانم بەدەردیسەری و سەرشۆڕی بەسەر دەبرد تەنها بەدوای پارەدا دەگەڕام تا فەسادو وێرانكاری پێ بكرم... رۆژێكیان چوومە دەرەوە لەماڵ و زۆر بێتاقەت بووم، یەكێ لەپیاوانی گەڕەكەكەمان لە ئۆتۆمبیلەكەیدابوو، وەستاو زۆر بەگەرمی سڵاوی لێ كردم و پێی ووتم: ئیشم پێتە بۆكارێكی گرنگ.. دوای داكۆكی كردنی سواری ئۆتۆمبێلەكەی بووم، لەشەقامەكانی شاردا دەیگەڕاندم، خوای گەورە رابەرداری بكات و سەرفرازی دنیاو قیامەتی بكات، دەیەویست خوا بێنێتەوە یادم، و جەختی لەسەر ئەوە دەكرد ماوەیەكی زۆرە كە نام بینێ لەمزگەوتا.. ئایا تاكەی لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام دەبم؟؟ خوای گەورە ویستی وابوو كە رێنمایی بكرێم.. وردە وردە قسەكانی پێش ئەوەی بچێتە عەقڵمەوە دەچویە دڵمەوە... بەتایبەتی شێوازێكی جوانی كاریگەرانەی هەبوو، خوای گەورە پاداشتی خێری بداتەوە... دوای ئەوەی كۆتایی بەقسەكانی هێنا لەگەڵمدا، رێككەوتین كە بمبات بۆ بنكەیەكی راهێنانەوەی دەروونی كە ئەویێ بەویستی خواو بەلێبڕان و ئیرادەو سووربوونی من دەبێتە هۆكارێك بۆ چاكبوونەوەو رێنومایی و رزگاربوون لەومەینەتی و دەردیسەریە... بۆیە بێگومان گومانەكانم بەهەدەر نەچوون، سوپاس بۆخوا خوای گەورە شیفای پێ بەخشیم و من ئێستا بەعیزەت و كەرامەتەوە هەڵسوكەوت لەگەڵ خێزانەكەماندا دەكەم و زۆر زۆر باشم و ئەوكچەم كەلێمدا (مژدەت دەدەمێ) دوو یاری منداڵانەشم بۆكڕی نەك دانەیەك... (بەپێكەنینەوە قسەی دەكرد)...

## ٧١- ﴿تەلەفزیۆنەکە بەرە دەرەوە لەماڵمان﴾

دوو پیاو لەپێناوی خوادا پەیوەندی بەهێز هەبوو لەنێوانیاندا، یەکێکیان تەلەفزیۆنێکی کڕی و بردیەوە بۆماڵەوەیان بەبێ ئاگاداری هاوڕێکەی دوای ئەوەی لەلایەن ژنەکەی و منداڵەکانیەوە پەستانیان خستبووە سەری.

خاوەنی تەلەفزیۆنەکە مرد، دوای ئەوەی کفن و دفنیان کرد، هاوڕێ ماتەمە بەئارامەکەی ڕۆشت بۆ مزگەوت و لەوێ خەوت.. لەخەویدا بینی کە هاوڕێکەی ڕوخساری ڕەش هەڵگەڕاوەو ماندووبوون و شەکەتی پێوە دیارە، وەك ئەوەی ئازارێکی زۆر سەخت درابێت، لێی پرسی: ئەوە بۆچی وات لێ هاتووە؟ ووتی: ئەی فلان، تکایەکی برایانەت لێ دەکەم کە بچی بۆماڵمان و تەلەفزیۆنەکە لەماڵمان دەربهێنێت، وە من لەوکاتەوەی خستومیانەتە ناو گۆڕەکەمەوە هەتا ئێستا بەهۆی ئەو تەلەفزیۆنەوە ئازار دەدرێم.. هاوڕێکەی لەخەوەکە بەئاگا هاتەوەو پەنای گرت بە خوا لەشەیتانی نەفرەت لێکراوو شوێنەکەی خۆیی گۆڕی پاشان خەوتەوە.. جارێکی تر هاوڕێکەی بینیەوە لەخەویدا کە حاڵی زۆر لەوەی پێشتر خراپتر بوو، دەگریاو داوای لێدەکرد تەلەفزیۆنەکە لەماڵیان دەربهێنێت.. جارێکی تر هەستایەوەو شوێنەکەی گۆڕی و بەهۆی زۆری ماندوبوونیەوە خەوی لێکەوتەوە، دیسان هاوڕێکەی بینی کە شەقێکی لێ یاو پێی ووت: هەستە... ئایا نێوانمانت بیرچووەوە... سوێندت ئەیەم بەخوا... کە بچیت و بەماڵەوەمان بڵێیت، چونکە هەموو سات و خولەکێك دواکەوتن دەبێتە هۆی زیادبوونی خراپەکانم و زیادبوونی سزادانم..

ووتی: منیش هەستام و چووم بۆ ماڵیان و لەنێوان بڕواکردن و بڕوانەکردندا بووم، کە تەلەفزیۆن لەماڵیاندا هەبێت، چوومە لای منداڵەکانی و داوام کرد کە ژنەکەی و کچەکانیشی نزیك ببنەوە تا گوێیان لەقسەکانی منەوە بێت: بۆیە هەواڵەکەم پێ گەیاندن و ئاسەواری سزادانی جەستەی و ڕوخساری باوکیانم بۆ وەسف کردن، هەموویان دەستیان کرد بە گریان و منیش گریام.

یەکێ لەکوڕە ژیرەکانی کە باوکی خۆش دەویست، تەلەفزیۆنەکەی هەڵگرت و لەبەردەم هەمووماندا شکاندی.. منیش سوپاسی خوام کردو هاتمەوە..

دوای ئــەوە لەخەومــدا هاوڕێکــەمم بینیــەوە کــە لــە نــازو نیعمەتدایــەو دەم بەخەندەیــەو ئاســەواری ڕازی بــوون و بەختــەوەری بەڕوخــساریەوە دیــاربوو، ووتــی: خوای گەورە لەهەموو ناڕەحەتیەك ڕزگارت بکات وەك چۆن منت ڕزگارکرد لەسزای قەبر.

ووتم: ئەمە لەحاڵـەتی بەکارنەهێنانیـدا لەشتی بەسوودو موباحدا.. وە ئەگەرنا ئەوە تاوانەکانی تەلەفزیۆن زیاترە... خواش زاناترە...

## ٧٢- ﴿من و خەسوەکەم نە (تەڵاق) و نە (عِدة) بەڵکو جیابوونەوە)﴾

ئافرەتەکە ووتی: بەسەرهاتی خۆم پێشکەش دەکەم تاببێتە پەند بۆ هەموو کچێك:

لەزەتم وەردەگرت و هونەرم پەیدا کردبوو لە ئازاردانی خەسومدا، و دورخستنەوەی مێردم لێی بەپێی توانا، ئەو مافەیم لەیادکردبوو کە خوا فەرزی کردبوو لەسەرمان.

وەڵامەکەشی تۆڵەی خوای گەورە بوو لێم یان تۆڵەکە زۆر ناڕەحەت بوو، وە سەخت بوو کە ژیانمی لە بنچینەوە تێکشکاند.. فەرمایشتی خوای گەورەم هاتەوە یاد ﴿وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللَّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ﴾ إبراهيم/٤٢.

واتە (وامەزانە خوا بێئاگایە لەوەی کە ستەمکاران دەیکەن، بێگومان ئەو دوایان دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکان تیایدا نەبڵەق دەبن (و نانوقێن لەترسا)).

فرمێسکەکانم دەریایەکیان دروستکرد بەهۆی ئەو ڕووداوەوە کە بەربەرەکانێیەکی بێدەنگ یان ڕاگەیەنراو بوو لەنێوان ژنێك و دایکی مێردەکەی لەمەڕ مێردو مافی هەردوکیان، دایکە مافی خۆی وادەبینی کە لەپێشی بوکەکەوەیە، ژنەکەش دانی بەو مافەدا نەدەنا، وایدەبینی مێردەکەی تەنها موڵکی تایبەتی ئەوە، ناهێڵێ هیچ کەسێکی تر هیچ ئیعتیبارێکی هەبێت با دایکی خۆیشی بێت..

ژنەکە زۆرجار وەرەقەی یاریەکەی دەبردەوە، وای دەزانی کە سەرکەوتوەو، سەری دەنایە سەر خەسوی، بەڵام حساباتەکەی هەرچۆنێك بێت جەنگەکە هەر لەبەرژەوەندی خەسویەتی، بەهۆی چەندین هۆکارەوە، زۆری ناکۆکیەکە وای کردبوو کە ژنەکە پشت گوێی بخات و بەتەواوی حسابی بۆنەکات، بۆیە بایەك هەڵی دەکرد کە کەشتیەکەی تێر نەدەکرد..

چیرۆکەکەی من نزیکە لەخەیاڵەوە، چونکە خراپیم و ئیهانەی بەردەوامم بۆ خەسوم هۆکارێ بوو لەبەختەوەر نەبوونی مندا کە باس ناکرێت... بۆیە لەیەك ساتدا

هـەموو شـتێك تێـك چـوو بەسـەر یەكـدا كـە بەخـەیاڵی كەسـدا نایـەت، لەبـەر ئـەوە بەسەرهاتی خۆم دەگێڕمەوە تاوەكو ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ هەموو كچێك

ئـەویش پەیوەنـدی بـەكوڕی مامـەوە بـوو كـە مێردیـشم بـوو، چـونكە ئێمـە هـەر لەمنداڵیەوە هۆگربووین بەیەكـەوە، هـەتا كـاتێكیش گـەورەبووین و بووینـە هاوسـەری یـەكتر لەوپـەڕی خۆشـی و كامەرانیـدا بـووین لـەناو كـەس و كارمانـدا، ژیـانێكی پـڕ خۆشـی و ئاسـودەمان دەگوزەرانـد كـە لـە ئەفسانە دەچـوو، تـا ئـەو ڕادەیـەی خـەڵكی ئێمــەی بەنموونــە دەهێنایــەوە لــەڕووی و گونجــان، و خشەویــستی و تێگەشــتن و خۆشگوزەرانی، خـوای گـەورەش دوو منـداڵی پـێ بەخـشین كوڕەكـەمم ناونـا بـە نـاوی باوایەوەو كچەكەشم بـەناوی دایكمەوە، مێردەكـەم زۆری خـۆش دەویـستم كـە ئێرەیـی پێ دەبرا..

بەڵام منـیش ئـافرەتێكی زۆر جـوان بـووم بەشـایەتی هـەموان، وە زۆر گـرنگیم بـە خـۆم دەدا.. جوانیەكـەم و خۆشەویـستیەكەم دوو هۆكـار بـوون كـەپاڵیان پێـوە دەنـام خراپ بم لەگەڵ خەسومدا، یان ڕاستر بڵێین بێزاری بكـەم بـە هەڵسوكەوتە ساردەكانم، چونكە من هەموو داوەكانم بەدەستەوەبوو، هەرچەندە لەناخی خۆمدا دەمزانی كـە ئـەو كارەی من پێی هەڵدەستم هەڵیـە، بەڵام ئـەو قسەیە كاری تێكردبووم كە دەیـان ووت خەسوو زۆر ڕقی لـە بووكـە، بەهـەرحاڵ توانیم زۆرم هـەبێت بەسـەر مێردەكەمدا، هـەتا گرنگـی پێدانـەكانی بـەدایكی لەسـنورێكی تەسـكدابێت.. ڕۆژان دەگـوزەران و منـیش بەردەوام بووم لەدژایەتی كردنی، بەو شێوەیە یاریەكە بەردەوام بوو.. كـاتێ مێردەكـەم گوێی نەدەگرت لەشكاتەكانی دایكی، من وام هەست دەكرد نازو مەكری من گەشتوەتە ڕادەی ئەو ئافرەتانەی دەوری یوسفیان دابوو –علیه السلام–

تا ئەو ڕۆژە ڕەشەم بەسەرا هات، كە ئـەو ئافرەتـە گوورزی خـۆی وەشـاند و لەیـەك سـاتدا ژیـانی منـی بەتـەواوی وێرانكـرد.. نـازانم ڕاسـتگۆبوو یـان سوكایەتیەكانی مـن وای لێكردبـوو كـە ئـەو هەڵوێستە وەربگرێـت؟ هـەر چۆنێك بێـت مـن دۆڕام و شكستم هێنـا و پەشـیمانم لـەو ڕۆژە ڕەشـە.. ئـەو پیرەژنـە (خەسـوم) نـەخۆش كـەوت و منـیش چووم سەردانی بكەم، كاتێ دانیشتم لەپاڵیداو بەوپەڕی جوانی و خۆڕازاندنـەوە منـی بینـی پـێم ووت: وەسـیەتی خـۆت بنوسـە.. ئـەویش هەناسـەیەكی قـوڵی هەڵكێـشاو

بەچاوە پڕ فرمێسکەکانیەوە ووتی: کچی خۆم مردن هەقە... و بێدەنگ بوو، منیش وەڵامم دەستکەوت، هەستام و بەپەلە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە..

کاتێ مێردەکەم گەڕایەوە بۆ ماڵ منداڵەکانی بانگ کردو لاواندنیەوە، باسی ئەو یادگاریانەی بۆ دەکردم کە ژیاوین تیایدا، و پێی ووتم: ناتوانم بەبێ تۆ بژیم، هەموو خەڵکی ئێرەییم پێ دەبەن، پێم ووت: منیش هەروەها... پاشان باسم بۆ کرد کە دایکی نەخۆشەو پێویست ناکات سەردانی بکات.

بەڵام ئەو ڕۆشت بۆلای دایکی، چەند ساتێکی کەمی نەخایاند مێردەکەم بەروخسارێکەوە گەڕایەوە کە پێشتر بەو شێوە گرژو بێزاریە نەمبینیبوو، سەری شۆڕکردبوو، پێم ووت: مرد؟ ووتی: نەء، بەڵام... ووتم: بەڵام چی؟؟؟؟ بەڵام لەماڵ چوویە دەرەوە بەبێ ئەوەی قسەم لەگەڵ بکات... لەوکاتەدا هەستم کرد کە دایکی شتێکی پێ ووتووە بێتاقەتی کردووە، منیش چووم بۆلای خەسووم بەشێوەیەکی زۆر بەرزو لەخۆبایی بوون، پێم ووت: ئەی پیرە ژن چیت ووتووە بە مێردەکەم؟

ئەویش بەخوێن ساردیەك و دەنگێکی پەککەوتەوە ووتی: مردن هەق و ڕاستەقینەیە، من پێشتر نەزان بووم، تۆو ئامۆزاکەت من پێکەوە شیرم پێداون، وە من ئەمڕۆ گوێم لە مەلایەکەوە بوو لەڕادیۆدا دەیوت: خوشکی شیری ناتوانێ شوو بە برای شیری خۆی بکات، منیش پرسیارم لە زانایان کرد پێیان ووتم: زەواجی کوڕەکەت دانەمەزراوەو بەتاڵە؟

منیش هاوارم کرد بەسەریداو ووتم: ژیانی منت وێرانکرد؟! گوناهت ئەگات... تۆ کەسێکی قین لەدڵی، لەوکاتەدا دنیا لەبەرچاوم دەسوڕایەوەو لەتاوا کەوتم، کارەساتەکە ڕوویداو بوومە بنێشتەخۆشەی سەرزاری خەڵکی.... پرسیارم لە دایکم کرد دەربارەی ئەو شیرپێدانە ئەویش پێی ووتم: ئەوە چەند شیر پێدانێك بوو لەپەنجەکانی دەستێك تێپەڕیان نەکردووە، بەڵام خەسووم سوێندی دەخوارد کە زیاتر بوو لەپەنجەکانی هەردوو دەست، دوای ئەوەی دۆسیەکە بەرزکرایەوە بۆ دادگا بڕیاردرا بە جیابونەوەمان بەبێ تەلاق و بەبێ گێڕانەوەی منداڵەکان... هەمووشتێکی جوان لەژیانمدا فەوتا... بەڵێ من گوناهباربووم، لەوانەیە من پاڵم پێوە نابێ تا ئەویش ئەو سوێندە بخوات کە بەو شێوەیە شیری بەمن داوە، هەتا دڵم شەق پێ

بەرێت وەك چۆن من دڵی ئەوم شەق پێ بردبوو... بەڵێ هەر بەهەمان جۆر پاداشتی یامەوەو هەقی لێکردمەوە...

لەوساتەدا فرمێسك بەچاوەانمدا دەبارین و بوونە دەریایەك... یادی ئەو گوناهو تاوانە مەزنانەم دەکردەوە کە بەرامبەر ئەو ئافرەتە هەژارە کردبووم و سەرەنجامیش خۆم چیم لێ بەسەرهات.

﴿گۆڤاری (شهد الفتيات) ژمارە: ١٤٢٥/١٣ك﴾

## ٧٣- ﴿خۆشەویستی تەمەن﴾

پاڵەوانی چیرۆکەکە باسی خۆی دەکات و دەڵێ: کاتێ باوکم وەفاتی کرد من منداڵ بووم... دایکم سەرپەرشتی دەکردم... لەماڵەکاندا کارەکەری دەکرد تا بتوانێت خەرجی من بکێشێت، من تاقانەی ئەو بووم، منی خستە قوتابخانەو منیش خوێندم هەتا زانکۆم تەواو کرد... من خۆشەویست بووم لای.

بۆ خوێندنم بڕیاردرا بمنێرین بۆ هەندەران، دایکیشم بەچاوی پڕ فرمێسکەوە خواحافیزی لێ کردم و پێی ووتم: ڕۆڵە نازدارەکەم باش ئاگات لەخۆت بێت و بێبەشم نەکەیت لەهەواڵی خۆت، نامەم بۆ بنێرە تا دڵنیابیم لەتەندروستیت.

بەڵێ سەفەرم کرد بۆ یەکێ لە وڵاتانی رۆژئاوا، تا لەوێ خوێندنەکەم تەواو بکەم.. دوای ماوەیەکی زۆر گەڕامەوە بۆ نیشتمانەکەم، بەڵام بە کەسایەتیەکی ترەوە گەڕامەوە، شارستانیەتی ڕۆژئاوایی کاری تێکردبووم.. بەدواکەوتویی و کۆنەپەرستی تەماشای ئاینم دەکرد.. پەنا بەخوا تەنها بڕوام بە ژیانی ماددی هەبوو.

پاش گەڕانەوەم بوومە فەرمانبەرێکی پلە بەرز، دوای ئەوە گەڕام بەدوای هاوسەرێکدا تا خێرم دەستگیر بێت، دایکیشم کچێکی دینداری باڵاپۆشی بۆ دەستنیشان کردبووم.. بەڵام من ڕازی نەبووم پێی، تەنها ئەو ئافرەتە جوانە دەوڵەمەندە نەبێت، چونکە من خەونم بە ژیانی وەك دەڵێن (ئوروستکراتی) یەوە دەبینی.

دوای شەش مانگی هاوسەرگیریمان، ژنەکەم بەهۆی مەکرو فێڵەکانیەوە وای لێکردبووم هەتتا ڕقیشم لەدایکم هەستابوو.. جارێکیان گەڕامەوە بۆماڵەوە بینیم ژنەکەم دەگری... لێم پرسی بۆچی دەگریت؟ ووتی: با باش بزانیت یان من یان دایکت دەبێ لەم ماڵەدا بین... لەمە زیاتر ناتوانم ئارام بگرم لەسەری.

منیش وەك شێتم لێ هات و لەوساتەدا کە تورەیی و شەیتانی نەفرەت لێکراو زاڵ بوو بوو بەسەرمدا دایکم لەماڵ دەرکرد.. بەڵێ دایکم بەگریانەوە لەماڵ چوویە دەرو دەیوت: خوای گەورە صاڵحت کات کوڕی خۆم.. خوای گەورە بەختەوەرت کات کوڕی خۆم..

دوای دەرکردنی بەچەند سەعاتێك چوومە دەرەوە بەدوایدا تا بیهێنمەوە بەڵام بێ سودبوو.. گەڕامەوە بۆماڵەوە.. ژنەکەم بەهۆی مەکرو نازیەوە توانی ئەو دایکە ئازیزو سەنگینەم لەبیربەرێتەوە، کە هەموو تەمەنی لەپێناوی پەروەردەکردنی مندا سەرفکرد، شەوانێکی درێژ خەڵوەتی دەکێشا تا من ئارام و بەختەوەربم.. خۆی برسی دەکردو منی تێر دەکرد.. خۆی ڕووت و ڕەجاڵ دەکردو منی پۆشتە دەکرد... ماوەیەکی زۆر هیچ هەواڵێکی دایکم نەزانی... لەوماوەیەدا توشی نەخۆشیەکی پیس بووم و کەوتمە نەخۆشخانەوە...

دایکم بەهەواڵەکەی زانیبوو هاتبوو بەگریانەوە تا سەردانم بکات، بەڵام ژنەکەم لەلام بوو، پێش ئەوەی دایکم بێتە ژوورەوە بۆلام تا بمبینێت، گوێم لێبوو ژنەکەم دەریدەکردو پێی دەوت: کوڕەکەت لێرە نیە.. چیت ئەوێ لێمان.. بڕۆ لاچۆ لەلامان.. دایکیشم لە کوێوە هاتبوو گەڕایەوە بۆ ئەوێ !

منیش دوای ماوەیەکی زۆر دەرچووم لەنەخۆشخانە.. بەڵام حاڵەتی دەروونیم تەواو پەشێوبوو.. بۆیە وەزیفەکەم و ماڵەوەم لەدەستداو قەرزێکی زۆر کۆبوویەوە لەسەرم... هەموو ئەوانە بەهۆی ئەو ژنە پیسەمەوە بوو.. چونکە بەهۆی داواکاریە زۆرەکانیەوە هەراسانی کردبووم..

لەکۆتاییدا ژنەکەم پاداشتی کردەوە جوانەکانمی دایەوەو وتی: مادام وەزیفەکەت و ماڵەکەت لەدەستداو لەناو کۆمەڵگادا هیچ بایەخێکت نیە، ئەوا من بەڕاشکاوانە ڕایدەگەیەنم: من تۆم ناوێت... تەڵاقم بە، تەڵاقم بە..

ئەو هەواڵە وەك هەورەگرمەیەك وابوو کە دابارێە سەرسەرم.. لەژێر پێداگرتنی و گیری و سوربوونیدا، تەڵاقمیا.. تا بتوانم لەو متبوونەم کە تێی کەوتبووم هەستمەوە..

بۆیە چوومە دەرەوەو بەسەرشۆڕی دەستم کرد بە گەڕان بەدوای دایکمدا... بەهەموو دەنگم هاوارم دەکرد دایکە تۆ لەکوێیت... بەڕاستی من زوڵمم لێکردیت.. من نکوڵیم کرد لەو هەمووچاکەیەی کردت بەرامبەرم... لەکۆتاییدا دایکم دۆزییەوە.. بەڵام لەکوێ؟ لەیەکێ لەخەڵوەتگەکاندا بەهۆی بەخششی چاکەکارانەوە دەژیا...

چووم بۆلای... بینیم ژیان کاری تێکردبوو زۆر پەژارەو خەفەتباری کردبوو.. هەر کەبینیم خۆم یا بەسەر قاچەکانیداو بەتاسەوە دەستم کرد بە گریان، ئەویش هیچی لەدەست نەهات ئەوە نەبێ بوویە هاوبەشم لە گریانەکەدا.

نزیکەی سەعاتێك بەو شێوەیەماینەوە... دوای ئەوە، فرمێسکەکانیم سڕی و بردمەوە بۆماڵەوەو، بڕیارم یا کە پێویستە گوێڕایەڵی بم، وە پێش هەموو شتێکیش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورەبم و دوورکەومەوە لەقەدەغەکراوەکانی..

ئەوەتا ئێستا من خۆشەویسترین و جوانترین ڕۆژانی ژیانم بەسەردەبەم، لەگەڵ خۆشەویستی تەمەنم (دایکم)دا.

﴿لەکتێبی (العائدون الی الله) شیخ محمد بن عبدالعزیز المسند﴾

## ٧٤- ﴿چاكە لە گەڵ دایك و باوكدا﴾

ئێوارەیەكیان دایكە لە گەڵ منداڵەكانیدا دانیشت و یارمەتی دەدان لە پێداچوونەوەی وانەكانیادا و ئەو منداڵەی كە تەمەنی چوار ساڵ بوو دەفتەری وێنەكێشانەكەی دابەدەستیەوە تاوەكو ئەم سەرقاڵ نەكات و بتوانێت وانە بەوانیتر بڵێتەوە .

لە پڕ بیری كەوتەوە كە خواردنی ئێوارەی ئامادە نەكردووە بۆ باوكە بە ساڵاچووەكەی مێردی كە لە گەڵیاندا دەژیا لە ژوورێكدا و لە گۆشەیەكی ماڵەكەیاندا ، چەندەی لە تواناادا هەبووایە هەڵدەستا بە خزمەتكردنی ، مێردەكەشی رازی بوولە خزمەتكردنی ئەو بۆ باوكی ، چونكە باوكی بە هۆی ناساغیەوە لە ژوورەكەی نەدەهاتە دەرەەوە ، بە پەلە خواردنی بۆ برد و لێی پرسی ئایا پێویستی بە هیچ شتێكی تر نیە و پاشان رۆشتە دەرەوە ، كاتێ گەرایەوە بۆ لای منداڵەكانی ، هەستی كرد كە منداڵە بچوكەكەی خەریكی وێنەكێشانی بازنە و چوارگۆشە و دانانی ئاماژەیە لێی پرسی : ئازیزم ئەوە وێنەی چی دەكێشیت؟

منداڵەكەش بەوپەڕی بەرائەتەوە وەڵامی دایەوە: من وێنەی ئەو ماڵە دەكێشم كە كاتێك گەورە دەبم و ژن دەهێنم و تێیدا دەژیم، وەڵامدانەوەكەی دڵخۆشی كرد ..وتی: ئەی لە كوێ دەخەویت ؟منداڵەكەش چەندین چوارگۆشەی پێ نیشاندا و دەیووت ئەمە ژووری نووستن و ئەویان مەتبەخ و ئەوی تریان ژووری میوانە ..بۆیە دەستی كرد بە ژماردنی هەموو ئەوانەی كە دەیزانی لە ماڵەكەدان ، پاشان چوارگۆشەیەكی لە دەرەوەی چوارچێوەكە كێشابوو .

دایكیشی سەرسام بوو، پێی وت : بۆچی ئەو ژوورە لە دەرەوەی ماڵەكەدایە و جیایە لە هەموو ژوورەكانی تر ؟ لە وەڵامدا منداڵەكە وتی ئەوە ژووری تۆیە، تۆ دەخەمە ئەوێ و لەوێدا بژیت وەك چۆن باپیرە گەورەم لەوێدا دەژی.

دایكی بە بیستنی قسەی منداڵەكەی تووشی شۆك بوو !! بۆیە لە خۆی دەپرسی ئایا دەبێت من بە تەنها لەو چۆڵەوانیەدا لە دەرەوەی ماڵەوەدا بم ، بە بێ ئەوەی لەزەت ببینم لە قسەكردن لەگەڵ كوڕەكەم و منداڵەكانیدا و دڵخۆش ببم بە قسەكانیان و شادیان و یاریان كاتێ كە لە جوڵە دەكەوم؟ ئەو كاتە قسە لەگەڵ كێدا بكەم ؟ئایا

هەموو تەمەنم لە نێو ئەم چوار دیوارەدا بەسەربەرم بەبێ ئەوەی گوێم لە دەنگی ئەندامانی خێزانەکەم بێت .

بە پەلە کارگوزارەکانم بانك کرد و بەخێرایی ژووری تایبەت بە میوانمان گواستەوە کە رازاوەترین ژوورە و دیارترینیان بوو، کەلوپەلی مامم ( باوکی مێردەکەم) ئامادەکرد و کەلوپەلی تایبەتی ژووری میوانیشم گواستەوە بۆ ئەو ژوورەی دوور بوو لە خانووەکە .

کاتێ مێردەکەی گەڕایەوە لە دەرەوە سەرسام بوو بەو کارە چونکە چاوەڕوان نەکراو بوو.. لە خێزانەکەی پرسی: چی وای لێکردێت ئەو گۆڕانکاریە بکەیت؟

بە چاوانی پر لە فرمێسکەوە وەڵامی دایەوە من جوانترینی ژوورەکان هەڵدەبژێرم من و تۆ تیایدا بژین ئەگەر خوای گەورە تەمەنی پێداین و لە جموجوڵ کەوتین ، با میوانەکان لەو ژوورەی دەرەوە بن .

مێردەکەشی لە مەبەستەکەی تێگەیشت و ستایشی ئەو کارەی کرد کەبەرامبەر بە باوکی ئەنجامی دابوو کە ئەویش بە رووخساری پر لە خەندەوە تەماشای دەکردن و منداڵەکەش تەنها ئەوەی بۆ مایەوە وێنەکەی کوژاندەوەو خەندە گرتی .

## ٧٥- ﴿ئاه وناڵەی ژنێك﴾

تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و وەڵامم دایەوە : بەڵێ ، سلاو لە تۆ ، گوێم لە دەنگێکی بزرکاو بوو کە گریان و ئازار پچڕ پچڕی دەکرد ، هەر کە گوێم لێوە بوو ، هەموو هەستێکم یەکلایی کردەوە بۆ ئەو دەنگە ماتەم و بێزارە ، تەنها گوێم لە دەنگی گریان و ناڵە و زاریە بوو ، ئافرەتێك بوو ئازار و ماتەم وای لێکردبوو کە تەلەفۆن بکات بە گرنگی پێدانەوە لێم پرسی : خوشکی بەڕێزم چیتە ؟بۆچی ئەوەندە دەگریت و هاوار دەکەیت ؟

بە دەنگێکی خنکاوەوە کە بگەڕێت بە دوای فریادڕەسێکدا کە رزگاری بکات ئەگەر رۆچووبێت لە سەرگەردانی و تاریکیدا ؟ژنێك چی بکات ئەگەر نوقم بووبێت لە داوێن پیسی و خراپەکاریدا ؟ ئەو کەسەی کە رووناکی رێنمایی گۆڕی بێت بە گومڕایی چی بکات ؟ ئەو کەسە چی بکات کە ناپاکی لە گەڵ خوا و مێرد و کەسوکاری و داب و نەریتی رەسەندا کردبێت ؟

کەسێك کە رۆژ و شەوی کردبێتەوە بۆ ئارەزوواتە حەرامەکان وکوێر بووبێت لە ئاست پاکیتی و بینایدا ؟ یا شێخ وەڵامم بەرەوە ، وەڵامم بەرەوە ئەگەر وەڵامێك شك دەبەیت ، چونکە لۆمە و سەرزەنشت دەروونمی گڕ تێبەرداوە ..

منیش بە هێمنکردنەوەوە پێم ووت : لە سەرخۆبە خوشکی بەڕێزم ، فرمێسکە گەرمەکانت وا رادەگەیێنن بە ئیزنی خوای گەورە لە دایك بوونی ئافرەتێکی نوێ و سەرەتای لاپەرەیەکی ئاسودە لە ژیانتدا.. بەڵام پێم بڵێ بۆچی ئەو رێگایەت گرتە بەر ؟ بۆچی رۆچویت لە گوناه و تاواندا ؟ بۆچی لە فەرمانی خوای گەورە دەرچوویت ؟

بە دەنگێکی ماتەم و خەفەتباریەوە وتی ، مێردەکەم هۆکاری ئەوە بوو ، بەڵێ ئەو بەرەو سەرگەردانی بردم ، ئەو کردمی بە نێچیری سەگە برسیەکان ، مێردەکەم بە دەستی خۆی منی کوشت ، هەموو بەها و بنەمایەکی لە مندا کوشت ، هەموو مانا جوانەکانی تیا کوشتم ، هەموو پەردەکانی خۆشەویستی نێوان خۆم و خۆیی پچراند ، بە هۆی دڵرەقی و کەللە رەقی و نەزانیەوە .

ئافرەتەکە کەمێك بێدەنگ بوو هەناسەی هەڵکێشا و فرمێسکەکانی سڕی ، پاشان ووتی : خەونم دەبینی بە مێردێکی ناسکەوە کە رێگام بۆ رووناك بکاتەوە ، خەونم بە

چرای خۆشەویستیەوە دەبینی و بە هەست و سۆز و ئەویندارییەوە کە بمبات بەرەو کەناری ئارام و هێمن ..

خەونم بە کەسێکەوە دەبینی لاپەرە ناخۆشەکانی ژیانم بگۆڕێت بە لاپەرەی پرشنگدار لە بەختیاری و ئارامیی ،کە گەورەبووم هەموو خەونەکانم لە گەڵمدا گەورە بوون ،من گەورە بووم و ئەویش پێش من گەورە بوو ، پێشبڕکێی لە گڵدا دەکردم ، هەتا سواری خەونەکان (فارس الاحلام ) بووم کە چاوەڕوانم دەکرد و وا گومانم دەبرد تەقەی دا لە دەرگا ، شووم پێکرد لەو کاتەدا هەستم کرد پێویستم بەو خەونە ئەرخەوانیانە نیە ، چونکە سبەینێ لە گەڵ مێردەکەمدا دەبێتە راستی و تێیدا دەژیم بۆیە شەوی بوکێنیم خوا حافیزیم لێکرد و پێم وت : خوا حافیز بۆ ئاسمانی خەیاڵ ، ئیتر ناتبینمەوە ، ئەگەر کۆبونەوەکەم هەبوو لە سەر ئەرزی واقیعا ئەوە ئەتبینم ، رۆژگار گوزەران و چەند مانگێك دوای زەواجەکەمان لە گەڵ مێردەکەمدا دەژیام و هەستم بە وشکی ئەو دەکرد ... بەلأم قبوڵم دەکرد و دەمووت : سبەینێ سەرسامی ئەکەم بە قسەکانم و بە شێوازی مامەڵەکردنم لەگەڵی ، وای لێ دەکەم هەستم پێ بکات و هەست بە ناخم بکات و واز لەو عەقڵیەتە سەرەڕۆییە بێنێت بەلأم هەی هووو .....

هەی هوو بۆ ئاسن کە کەل و کول ببێت .. وە بۆ بەرد کە نەرم بێت مانگ بە دوای مانگدا دەهات و کارەکە خراپتر دەبوو ، ئەو ساردیەی نێوانمان بۆشاییەکی قوڵی دروست کرد ، قوڵیەکەی بەڕادەی قوڵی خەمەکانم بوو بۆ سەر خەونە جوانەکانم ، کە خوا حافیزیم لێکردبوو بەو ئومێدەی لە ئەرزی واقیعدا پێی بگەمەوە ، بەلأم وا دیار بوو خوا حافیزیم لێکردبوو بۆ هەتا هەتایی و ئیتر نایبینمەوە مادام لە گەڵ مرۆڤێکی ئاوادا دەژیم ..

زۆر بە سەختی و دڵرەقی مامەڵەی لە گەڵدا دەکردم من بە قسەی ناسك و شیرین دەدوام لە گەڵی ، بەلأم ئەو بە خراپترین و ناقۆڵاترین قسە وەلأمی دەدامەوە ، دەمویست بە خۆجوانکردن و خۆرازاندنەوە لێی نزیك بمەوە ، بەلأم خۆمم دەبینیەوە کە خۆم دەکێشم بە دیوارێکی بەردیندا کە هەست و نەستی نیە و مانای جوانی ناچێژێت .

دڵتەنگ ئەبووم ، گوێم نەئەدا بەو دڵتەنگیەم ، دەگریام، نەیدەپرسی بۆچی فرمێسك بە چاوانتا دێت ، نەیدەزانی ئەو هۆکاری خەم و ئازارەکانمە .

بە درێژایی ڕۆژ زۆر کەم ئەمبینی، لەو کاتە کەمانەشدا ڕزگارم نەدەبوو لە گاڵتە پێکردنی پێم و ڕەخنەگرتنی لە ئیش و کارەکانی ناوماڵم .

شەویش تا نیوە شەو چاوەڕوانیم دەکرد تا بەشەکەتی دەگەڕایەوە و بە ماندوویی وەك لاشەیەکی خامۆش لە جێگایەکدا پاڵ دەکەوت تا بخەوێت ، هەموو خەمێکی ئەوە بوو کە بگەڕێتەوە ماڵەوە خواردن ئامادەبێت و بیخوات و بخەوێت و پاشان برواتەوە بۆ سەر ئیش و کار و جەنجاڵیەکانی و لای هاوڕێکانی .

جارێکیان پێم وت کە دەیویست بچێت بۆ شەونشینیەکانی خۆی : مێردەکەم تکایە بمێنەرەوە لە گەڵم ، من پێویستم بە تۆیە ، بە تەنها جێم مەهێڵە، بە گاڵتە پێکردنەوە تەماشای کردم و ووتی لە چیت کەمە . باشترین خواردن و پۆشاك و کەل و پەلی ناوماڵم بۆ دابێن کردووی لە سەروو ئەمانەشەوە سەتەلایتێکم بۆ هێناوی تا سەدان کەناڵی ئاسمانی هەمەرەنگ ببینیت تا کاتی بەتاڵیشتی پێ بەریتە سەر ، ئیتر پێویستت بە چیە ؟

بە دەنگێکی شکاوانە و شەرمنانەوە وتم پێویستم بە تۆیە پێویستم بە قسەی شیرین و هەڵسوکەوتی ناسکی تۆیە ، پێویستم بە سۆز و خۆشەویستی و ئەوینی تۆیە ، پێویستم بەوەیە کە هەست بکەم لێمەوە نزیکیت ، تاوەکو هەموو مەترسیەکانم لێ دوورخەیتەوە .

قاقا پێکەنی و وتی : ئەمانە قسەی بەتاڵن ، جیهان هەر هەمووی لە کێشەی ئابووری و سیاسیدا دەژی و تۆش گرنگی بەو شتە بێبایەخانە دەدەیت .

منیش خێرا پێم وت : ئایا بێبەش بوونی من لە سۆز و خۆشەویستی تۆ کێشەکانی جیهان بنبڕ دەکات و نایهێڵێت ، نەخێر هیچ لەم واقیعە ناگۆڕێت ، بەڵکو کێشەی نوێ زیاد دەکات کە ئەویش کێشەی منە ، ژنە هەژارەکەت..... کاتێ دەستی بە دەرگاکەوە بوو دەیەویست بچێتە دەرەوە بە توڕەییەوە لای کردەوە بە لامدا وتی : واز لەم فەلسەفە بەتاڵانە بێنە و پاشان ڕۆشتە دەرەوە و دەرگاکەی داخست

لەو ساتەدا زۆر بە تاسەوە دەستم کرد بە گریان و لە خۆم پرسی: ( مێردەکەم گرنگی بە کەسی تر دەدات ، ئەی بۆچی گرنگی بە ژنەکەی و هاوڕێی ژیانی نادات کە هەست و سۆزە ناسکەکانی کوشتووە بە ئاگری گاڵتە پێکردن و گوێ پێنەدان و پشت گوێ خستن ؟)

نەفرەتت لێ بێت مێردەکەم ، بۆچی ئەم هەموو نەگونجانە ؟ ئەگەر ڕۆژێ دڵخۆش بوومایە لە گڵێدا ئەوا ئەو دڵخۆشیەی تێك ئەیام و ئەیکرد بە ڕۆژێکی خەم و خەفەتاوی .

هەموو هۆکارەکانم بۆ تاقی بوویەوە و تەقەم لە هەموو دەرگاکان یابوو ، بەڵام هەموو دەرگاکانی بەرووی مندا داخستبوو ، وام لێهاتبوو زۆربەی کاتەکانم بە تەماشاکردنی کەناڵە ئاسمانیەکان دەبردە سەر و دەمگۆڕین لەم کەناڵ بۆ ئەو کەناڵ بەڵکو ئەو مەینەتیە تاڵەم کە هەمە لە گەڵ مێردەکەمدا لە بیر بچێتەوە ، ئێوارەیەکیان دانیشتبووم تەماشای یەکێ لە فیلمە عەرەبیەکانم دەکرد ، ڕووداوی فیلمەکە لە روداوی ژیانی منی دەکرد . ڕووداوەکانی باسی ژنێکی دەکرد کە مێردەکەی فەرامۆشی کردبوو بە هۆی شەونشینیەکانیەوە و کار و باری خۆیەوە ، ئەمیش هەستی بە بۆشایەیەکی مەترسیدار دەکرد کە ژیانی پر کردبوو، بۆیە ناپاکی لە مێردەکەی کرد و دەستی کرد بە پەیوەندی کردن بە هاوڕێی مێردەکەیەوە ، لە گەڵیدا کەوتە تاوان و داوێن پیسیەوە .... لە ڕاستیدا کاتێ سەیری ئەو فیلمەم دەکرد بۆ یەکەمجار شتێك هات بە خەیاڵمدا و دەیووت بۆچی تۆش وەکو ئەو ژنە بێبەشکراوە ئەو کارە ناکەیت ؟بۆچی تاقی ناکەیتەوە وەك ئەو چۆن تاقی کردەوە ، بەڵکو ئەوەت دەست کەوێت کە ئەگەرێت بە دوایدا لە سوز و خۆشەویستی و ئەویندارى لە پیاوێکی ترەوە .. لێرەدا پاکیزەیی و داوێنپاکی لە دڵمدا خەبەری بوویەوە و لەناخ و یژدانمدا هاواری کرد ،نەخێر ، ئایا دەتەوێت تۆش وەکو ئەو ئافرەتە ناپاکە تۆش ناپاك بێت، بۆچی ڕێز و سەربەرزی دەگۆڕیتەوە بە سەرنزمی، با مێردەکەت کەمتەرخەم بێت ، ئەمە بەهانە نیە بۆ تۆ و مافی ئەوەت نیاتێ ناپاکی بەرامبەر بکەیت و شەرەفی لەکەدار بکەیت لەگەڵ پیاوێکی تردا ، هەڵە بە هەمان هەڵەی وەك خۆی چارەسەر ناکرێت ، ئاگری بلێسەدار بە هەمان ئاگری وەك خۆی ناکوژێتەوە ..

ئێوارەیەکیان دانیشتبووم چاوەڕوانی گەڕانەوەی مێردەکەم دەکرد لە یەکێ لە شەونشینیەکانی ، ئەو نیوە شەو نەهاتایە نەئەگەڕایەوە، خوا ئاگادارە هەستم بەترس و تەنیایی دەکرد ، دانیشتبووم ماتەمم دەگێڕا بۆ بەخت و چارەڕەشی خۆم ، شریتی خەونەکانم بەبەردەممدا ئەچوو دەمبینی دەکەوێتە ئاگری خەمەکانمەوە و وردە وردە دەسوتێت ، لەو کاتەدا بە کوڵ دەستم کرد بە گریان و تا بیتاقەت بووم لە گریان ، دەستم کرد بە گۆڕینی کەناڵەکان بەڵکو شتێك ببینم و ئەو خەم و ئازارە ناخۆشانەم لە بیر بەرێتەوە کە هەستم پێدەکردن ، لە پڕ زەنگی تەلەفونەکەی پاڵم لێیدا و واهات بەخەیاڵمدا وەڵامی نەدەمەوە ، بەڵام ترسام ئەوەی کە پەیوەندی دەکات مێردەکەم بێت و ئەو کاتە دنیا ژێرەو ژوور دەکات .

بەتنی تەلەفونەکەم هەڵگرت و وزۆر بێزاربووم لەو پەیوەندیە ناوەختەدا کە کاتی شك نەبردبوو لەو ساتەدا نەبێت ، بە وشکیەکەوە وتم بەڵێ .. ئەویش بە دەنگێکی ناسك و نەرم وەك پێستی مار وتی : بەڵێت باقی بێت ، ئەم کاتەت باش .. بە توندی و رەقیەوە وەڵامم دایەوە: چیت ئەوێت ؟

وتی داوای لێبوردن دەکەم ، پێدەچێت ژمارەکەم بە هەڵە لێدابێت ، بەڵام ئەم دەنگە وام پێ دەڵێت کە دەنگی کەسێکە دەناڵێنێت بە هۆی ئازاری تەنیایی و خەفەتەوە ، ئەی ئەو دڵە ناسکە بۆچی ؟

ژنەکە وتی : یاشێخ لە راستیدا لێت ناشارمەوە ، قسەکانی تەقەیان لەدەرگای دڵم دا پێش گوێم ، هەست و نەستمی هێنایە لەرزین ، روخسارم سوور هەڵگەڕا و دڵم زۆر بە خێرایی لێیئەدا و نەم ئەتوانی تەفسیری ئەو حاڵەتەم بکەم ،ئای هەناسە بڕکێ و ترسە یان خۆشی.. سەرت سورنەمێنێ لەوە لە ساتی شووکردنمەوە ئەوە یەکەم جارە مرۆڤێك هەست بە من بکات و لە سەدای دەنگمەوە هەست بە ئازار و مەینەتیەکانم بکات ، پاشان رەحمەت و بەزەیی خوا تەدارەکی کردم و بە پەلە تەلەفۆنەکەم داخستەوە ، هەست و نەستم تێکەڵی فرمێسك بوو ، نەم ئەزانی ئایا ئەوە فرمێسکی خۆشیە یان فرمێسکی ترسە ؟

لە راستیدا دڵم خۆش بوو ، چونکە کەسێکم بینیەوە کە هەست بە ئازار و غەمەکانم دەکات ، دوای ئەوەی هەمووان دەستبەردارم بوون ، هەتا نزیکترین کەس

لێمەوە کەمێردەکەمە، وەهەروەها زۆریش ترسام ، چونکە ئەمە یەکەمین جارە لە ژیانمدا پیاوێك بەو شێوەیە قسە بکات لە گەڵمدا ، بۆیە پەنام بردە بەر بێدەنگی و وەك ئەوەی رابکەم لەو فیکر و ئەندێشانە ، بەڵام ئەو بێدەنگیە سەر لەنوێ زەنگی تەلوفۆنەکە پچڕاندیەوە ،وەك زەنگێك وابوو کە دەیکێشا بە دڵی برینداری تێکشکاومدا ، یان وەك ئەوەی بەرگریکەرێ شورای داوێن پاکی ناو دڵم وێران بکات ، بۆیە لە ناخمدا ململانێ دەستی پێکرد ، ململانێ لەنێوان خێر و شەڕدا و لە نێوان رووسوری و حەیاچووندا و لە نێوان دەستپاکی و ناپاکیدا و لەنێوان عەقڵم کە دەیقیڕان بە سەرمدا و دەیووت قسە مەکە لەگەڵی و لە نێوان دڵم کە هاواری لێدەکردم و دەیووت قسەی لە گەڵدا بکە ، بەڵکو ئەو بەختەوەریەی تۆ بە دوایدا دەگەڕێت لای ئەو بێت ، لە کۆتایدا بێنەوایی و بێبەش بوونی سۆزداری زاڵ بوو بەسەر بانگی ئیمان و عەقڵدا و هەستم بە خۆم نەکرد کاتێ نەبێت تەلەفۆنەکەم هەڵگرت و پێم وت : بەڕێز تۆ چیت ئەوێت لەمن

بە دەنگێکی ناسك و سۆزدارانەوە وتی مـن هیچم لە تۆ ناوێت بەڵام لەناو پەراسووەکانمدا دڵی مرۆڤێکم هەڵگرتووە کە گرنگی بە مەینەتیەکانی کەسانی تر دەدات و بە ئازارەکانی ئەوان خەفەت بار دەبێت ، ئایا من هەڵەم لە گرنیگدانم بە خەڵکانی تر ؟ ئەگەر وایە تەلەفۆنەکە بەڕوومدا داخەرەوە .

منیش خێرا پێم وت : نەخێر تۆ هەڵەنیت ، بەڵکو ئەمە هەستێکی بەرزە لە تۆوە .. بەڵام .. پێی بڕیم و وتی : من لە بێدەنگی تۆدا گوێم لە ئازار و خەفەتە ، لە خەمەکانتەوە گوێم لە قسە و ئاگام لە نارەحەتیەکانتە ، قسە بکە و خەمەکانت سووك بکە .

یا شێخ لە راستیدا بێدەنگ بووم و هیچم نەوت ، بەڵام بەرگە گرتنم وردە وردە لاواز و بێهێز بوو .

پیاوەکە بەردەوام بوو لە سەر قسەکانی: ئەو گوڵە بۆچی دەگری و بێتاقەتە ، ئەم دەنگە ناسك و خۆشە بۆچی ماتەم و سەرگەردانە ، ئەی چۆلەکە جوانەکەم بجریوێنە و باسی خۆتم بۆ بکە تا دڵە رەسەنەکان گوێت لێبگرن ، ئەو کاتە دەمبینیت کە گوێم و دڵم جێی ئەو هەموو خەمانەی تۆی تیا دەبێتەوە ..

وتی :/ یاشێخ لێت ناشارمەوە لە ناخی خۆمدا بەراوردی ئەو کەسە نامۆیەم کرد کە دڵی خۆی بۆ کردمەوە تا گوێ لەخەم و ئازارەکانم بگرێت لە گەڵ مێردەکەمدا کە هەر کاتێ هەوڵم ئەیا دانیشم لەگەڵیدا تا خەم و ئازارەکانمی بۆ باس بکەم ، پشتی تێدەکردم و وازی لێ ئەهێنام لەگەڵ خۆمدا قسە بکەم .

شەیتان یاری بە جوانیم کرد ، ئەو کەسە نامۆیە گوێ لە ئازارەکانت دەگرێت و بۆ مەینەتیەکانت ئازار دەچێژێت ، بۆچی لە بەرامبەر چاکەکانیدا بە رەقی وەڵامی دەدەیتەوە ؟

قسەی لەگەڵدا بکە و ئەو رزگار کەری ئەو حاڵەی تۆیە ، ئاگات لێبێت لە دەست نەچێت و هەتا هەتایە دەست ناکەوێتەوە .

هەستم نەکرد کاتێ نەبێت ئەو شەپۆلە کاریگەرە رایکێشاوم بۆ لای خۆی و دەستم کرد بە قسەکردن لە گەڵی و سەرەتا باسی ئازار و خەفەت و خاڵیکردنەوەی مەینەتیەکان بوو ، بەڵام زۆر بەداخەوە قسانێکی تر هاتنە ئاراوە ، پەیوەندیەکان درێژەیان کێشا بۆ چەندین سەعات ، بەڵکو وام لێهاتبوو چاوەڕوانی مەوعیدی قسەکردنەکانم دەکرد بە تاس و شەوقێکی زۆرەوە ، کاتێ زەنگی تەلەفۆنەکە لێدەدا هەموو زەنگەکانی هەستم لە خۆشی و شادیدا لێیان دەدا... لە گەڵ مێردە سەرقاڵەکەمدا هەر بە لاشە دەژیام بە بێ رۆح و بەبێ عەقڵ و بەبێ هەست ، هەموو ئەو شتانەم گواستبویەوە بۆ پیاوێکی تر ، کە دڵی خۆی بۆ کردبوومەوە و هەموو ژیان و هەستمی داگیر کردبوو .

وتی: یا شێخ کارەکە گەشەی کرد ، مەوعیدێکم دانا لەگەڵیدا بۆ بینین ، بینینێك کە بۆ یەکەم جار کۆمان بکاتەوە لەگەڵیدا لە ماڵی خۆمان ، بینینێك کۆم بکاتەوە لەگەڵیدا لە ماڵی مێردەکەمدا و لە ژووری نوستنەکەیدا کاتێ ژوانەکە نزیك بوویەوە و سۆزی لۆمەی و ویژدان لە ناخمدا جوڵا و و بورکانی ترسی ئایندە لە ناخمدا گڕی سەند و پاڵنەرە خێریەکان لەناخمدا زیندوو بوونەوە ، لە خۆمم پرسی : پێکانم ئەبێت بۆ کوێ بچن ؟ بەڵکو ئەبێت بە چ ئاقارێکدا بچن ؟ وەڵام بەرەوە ئەی دڵی شکاو ، ئایا ناترسیت لە سزای خوای گەورە ؟بەڵام سۆزم و شیتانەکەم زاڵ بوون بە سەر هەموو بیرکردنەوەیکمدا ، تەنها خەونم بەوەوە دەبینی تینوێتی هەست و جەستەم بشکێنێت

و بۆشـایی دڵـم و ویـژدانم پڕبکاتـەوە ، دەرگـام بـۆکردەوە .. ئـەو ژوانـە .. ژوانێکـی چاوەڕوان کراو بوو بە شەوق و ترسێکی زۆرەوە ، ژوانێك ئەو لە لای خۆیەوە کورتی کردبوویەوە بۆ چەند قسەو سەرنجێك وەك ئەوەی بۆمی بسەلمێنێت لەوجۆرە کەسانە نیە کە رادەکەن بەدوای شەهەواتی لاشەدا تاوەکو زیاتر و زیاتر متمانەی پێبکەم .

ئافرەتەکە وتی : یاشێخ لێت ناشارمەوە کە بە راستی من ئازارێکی زۆرم ئەچەشت کە دڵی داگیر کردبووم وهاتبووە سەر جێگاکەم، چۆن نا ، ناپاکیم لە گەڵ مێردەکەمدا کرد لە ماڵەکەی خۆیدا و لەناو جەرگەی ژوورەکەیدا ، ناپاکیم لە راسپاردەکە کرد ، پەردەکەم هەتك کرد لە گەڵیدا تەقەمان دا لە دەرگای سەرشۆری ، لەگەڵیدا رۆشتم بەرەو نەهامەتی ، پەیوەندیەکان بەردەوام بوون، جارێکیان داوای لێکردم کە ببیینم، بەلاَم پێی وتم ئەو دەیەوێت ئەم جارەیان جیاواز بێت لە جارەکانی تر .

وتی : تۆ نەزانی من چیم ئەوێت .. کاتێك رووبەند ( قناع ) ەکەی کەوتە خوارەوە لـە روخـسارە قیزەونـە ناشـرینەکەیەوە کەسـایەتی ئـەوم بـۆ دەرکـەوت ، گورگەکـە حەقیقەت و راستەقینەیی خۆی دەرخست .

پێم وت ئێمە رێکەوتووین تەنها لە سەر قسەکردن، وە تۆ پێت وتم کە پاڵپشتی من دەبیت و دڵت دەکەیتەوە بۆ یارمەتیدانم لەم نارەحەتیەم ، چونکە مرۆڤێکی سۆزدار و میهرەبانیت .

بە گاڵتە پێکردنـەوە پێی وتم : تـەنها قـسەکردن سـوودی نیـە بـۆ ئـەم رۆژگـارە ، هـەموو شتێك دەبێـت نرخـی خـۆی هـەبێت ، منـیش داواکاریەکـەیم قـەبوڵ نـەکرد و بە جێنـۆ و قسە پـێ وتنـەوە بەرپەرچـم دایـەوە ، بـەلاَم ئـەو بەهەنـدێ کاسـیەتی دەنگـی هەرەشـەی لێکـردم کـە پێـشتر قـسەکردنەکانی منـی تۆمـارکردبوو .. وە لـە ژێـر هەرەشـەکردندا ناچاربووم داواکاریەکـەی قبوڵ بکـەم ، بۆیـە هاتـە لام وەك چۆن مێـرد دەچێتە لای ژنی خۆی ..

ئافرەتەکـە کـەمێ بێدەنگ بـوو و فرمێسکەکانی سـڕی و پاشـان وتـی : هەوڵمـدا هەڵەی مێردەکەم و کەمتەرخەمیەکەی و سەرقاڵیەکەی و بێبەشیم لەو چارەسەر بکەم ، بـەلاَم زۆر بەداخـەوە بـە هەڵەیـەکی گـەورەتر و تـاوانێکی نـاقۆلاَ چارەسـەرم کـرد کـە ئەویش تاوانی ناپاکی ژن ومێردایەتیە .

تاوانێکی مەزنم ئەنجامدا ، سبەینێ چی بڵێم بە پەروەردگارم، چی بڵێم بە کەس و کارەکەم ، ئەی چی بڵێم بە کچانی هاوڕێم ؟ دان بەوەدا دەنێم کەمن تاوانبارم ، من دەرگام کردەوە بۆ مێش و مەگەز ، دان بەوەدا دەنێم کەخۆم دەروونی خۆم کوشت ، من کوژراوم و هەر خۆیشم بکوژم .

پێم وت : خوشکی بەرێزم بە راستگۆیانە پێم بڵێ ؟ ئایا لە گەڵ ئەو لاوە داوێن پیسەدا ئەوەی کە بە دوایدا دەگەڕایت لە سۆزی راستگۆیانەوە و لە هەست و ئەوین دەستت کەوت ؟

وتی: نا نە بەخوا دەستم نەکەوت و هیچ ئافرەتێك کە ناپاکی لەگەڵ مێردی یان کەس و کاری دەکات دەستی ناکەوێت ، ئەزانی یا شێخ بۆچی ؟ چونکە ئەو هەستە ناسك و جوانانە گەشە ناکەن و پێناگەن لە ژینگەیەکی پاك و خاوێندا نەبێت کە ئەویش ژینگەی زەواج و خێزانداریە، وە ئاو نادرێت بە ئاوی پاکژ نەبێت کە ئەویش ئاوی خۆشەویستی ژن ومێردە.

بەڵام زۆنگاوەکانی ناپاکی و زبڵدانەکانی قسەکردنی ناشەرعیەکان، ئەوە کەشێکی ژەهراوی و گوناهاوی و پڕ لە میکرۆبە، کە ئەستەمە مانا جوانەکانی تێدا بژی یان سۆزە ناسك و راستگۆکان سەوز بێت تیایدا .

ئافرەتەکە کەمێك بێدەنگ بوو پاشان وتی : یا شێخ من چی بکەم ؟ تکات لێدەکەم رزگارم بکە ، چی بکەم ئەو هەڕەشەم لێدەکات کە لە بەردەم مێردەکەمدا بە کاسیەتە دەنگیەکان فەزحم بکات .. پاشان دەستی کرد بە گریانێکی بەردەوام .. لە راستیدا دڵم ئازاری چەشت بۆ ئەو ئاهو حەسرەتە ، جەرگم پارچە پارچە دەبوو بۆ ئەو فرمێسکە گەرمانە ، دڵم هاتە جۆش بۆ ئەو راستیە تاڵانە کە لەناخیدا مەینەتی کۆمەڵگاکەمانی هەڵگرتبوو، کەزۆرێك لەتاکەکانی بەرگەردەلولی ئارەزوات کەتوون و بوونەت دیلی شەهوەت، دوایش چنینەوەکانیان درك و داڵ و برینداریە ...کە دڵ بریندار دەکات و ئەسرین دێنێ بە چاواندا پاشان پێم وت : خوشکی بەرێزم کشتوکاڵەکەت بریتی بوو لەتاوان و ئێستاش خەرمانەکەت تاڵاوە ...بەڵام هێشتا فرسەت لە بەردەستدایە تا هەڵەکەت راست بکەیتەوە ، ئەوەی تۆ ئەنجامت داوە

تــاوانێکی گەورەیــە بــەڵام لــەوە گــەورەتر بــەردەوام بوونــت و ســووربوونتە لەســەر ئەوتاوانە.

خوشکی بەرێز نێوان خۆت و خوای خۆت چاك بکە ، خوای گەورەش ئەو مێردەت بۆ چاك دەکات، وە نێوان تۆ و نێوان ئادەمیزادەکان چاك دەکات ، بگەڕێوە بۆ لای خواو تەوبەیەکی پاك و یەکجاری بکە ، خوای گەروە تۆبەی تۆبەکاران قبوڵ دەکات ، لەمپەری سەرەڕۆیان کەم دەکاتەوە وخۆش دەبێت لەوانەی کە داوای لێبوردن دەکەن.

خوشکی بەرێزم ئەو پەیوەندیە لە گەڵ ئەو لاوە داوێن پیسەدا بپچڕێنە ، کە تەنها تێربوونی شەهواتە ئاژەڵیەکانی دەوێت لە تۆ و بەسەربردنی کاتە بەتاڵەکانی ، چۆك دامەدەو لە بەردەم هەڕەشەکانی تەسلیمی و پەستانەکانی مەبە ، چی دەوێ با بیکات، دڵنیابە کە ناتوانێت ئەو کاسیەتانە بڵاو بکاتەوە ، چونکە پێش ئەوەی تۆ زیانت پێ بگات ئەو زیانی پێدەگات .

قسەکردنەکان لە گەڵ ئافرەتەکە تەواو بوو ، بەڵام دەروونمی پرکرد لە ئازار و پرسیاری زۆر کە مرۆۃ بەرگەی نەدەگرت ، بۆچی هەق ئەناسین و و پشتگیری ناکەین ؟ بۆچی شوێن پێی پێغەمبەرمان ﷺ هەڵنەگرین لە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژنەکانماندا ؟ بۆچی دڵەکانمان و عەقڵمان بێئاگا بێت تا وای لێبێت رەقتر بێت لەئاسن و ناڵێم بەرد ، چونکە بەردی وا هەیە بە ناوی بەردەوام شەق دەبات ، پاشان کاتێك دروێنە دەکەین دەگرین بۆ ئەو رۆژگارانە و دەگرین بۆ بەخت و غەریبی رۆژگار .

دوای نزیکەی مانگ و نیوێك ئەو ئافرەتە جارێکی تر پەیوەندی کردەوە ، بەڵام ئەم جارە و ئەو جارەی تریان جیاوازیان زۆر بوو ، دەنگی هێمن و دامەزراو بوو ، لە دەنگ و قسەیدا نوری رێنمایی و ئیستقامەت و خۆڕاگری دەبینرا ، لە پیتەکانیدا دڵئارامی و بەختەوەری و هێمنی دەروونی دەبریسکایەوە ، پاشان پێ وتم : یا شێخ ژیانم بە تەواوی گۆڕا ..من سەر لەنوێ لە دایك بوومەوە ، بەراستی خۆری رێنومایی هەڵهات بە سەر تاریکستانی ژیانی بێئومێدیمدا و نور و ئارامی و دامەزراوەیی جێگەی گرتەوە ، کاتەکانم زیندوو کردووەتەوە بە گوێڕایەڵی خوای گەورە ، سوپاس بۆ خوا رزگارم بوو لەو رابردووە تاڵە ، هەرچەندە لەو پێناوەدا بەرەو رووی نارەحەتی زۆر گەورە بوومەوە ، کە پشت بە خوا لای خوای گەورەی پاداشت

دەدرێمەوە ، بەڵام لە کێڵگەی دڕکاویدا گوڵ ناچێنرێتەوە .... مێردەکەم مامەڵەی لە گەڵمدا کەمێك باش بوو بوو ، بە هۆی ئەو گۆرانکاریەوە بە سەر ژیانمدا هاتبوو ، وە ئوێد و متمانەی زۆرم بە پەروەردگار هەیە کە سنووری نیە، کە ڕێگای بۆ ڕووناك بکاتەوە و ڕێنومایی بکات بۆ ڕێگای ڕاست، و کۆ ببمەوە لە گەڵیدا لە دنیادا لە سەر خۆشەویستی و سۆزداری و لە قیامەتیشدا و لە بەهەشتی نەبڕاوەدا .

ئەم چیرۆکە شیخ(نواف المرتقی) گێڕاویەتیەوە

## ٧٦- ﴿( مى ) دراوسێمان﴾

ئافرەتێکیان وتی : ئافرەتێکی دراوسێمان هەبوو لەش و لار جوان و بالاَ مامناوەند .. گەنم رەنگ بوو ..دوو لێوی ئەستور و لوتێکی وەك شمشێری هەبوو ، چاوەکانی گەورە بوون تا ئەو رادەیەی بەشێکی زۆری رووخساری داگیر کردبوو، لە گەڵ ئەو هەژاریەی کە لە گەڵ خێزانەکەی بەسەری دەبرد بەلاّم خەزی لە بۆن خۆشی بوو ، ژوورەکەی هەمیشە شوشەگولاّوێکی تێدابوو کە بەکاری دەهێنا لە گەڵ پاکەتێك بخوردی خۆماڵی .. لە گەڵ دوو شوشەی عەتری بچوك لە عەترە ئاسایەکان وعود و عەنبەر کە یەکێ لە دراوسێکانمان پێشکەشی کردبوو .. بەڵێ ئەو دراوسێیەمان ناوی (مى) بوو کە چاوەکانی هەمیشی کلیان پێوە بوو، وە قژیشی کە هەمیشە لە پێشەوە دەرچوو بوو زەیتی پێوەبوو .

مێردە راوکەرە هەژارەکەی کە ناوی (سالم) بوو .. ئەگەر بە هۆی راوکردنەوەکەیەوە رۆزیەکی دەستکەوتایە لە بازار دەیفرۆشت وشتێکی سوکەی لێ هەڵدەگرت و ئەویشی دەیدا بە پێویستی ژیانی رۆژانەیان .

سالم و مى دە منداڵیان هەبوو گەورەکەیان ناوی وەردە بوو بچوکەکەشیان ناوی رێحانە بوو و مناڵەکانی تریشی کوڕ بوون .

مى شوێنی خۆی کردبوویەوە لە ناو دڵی درواسێکاندا، راهاتبوون هەموو بەیانیەك یەکتری ببینن ، دەنگی لە ناو هەمووانـدا بەرز دەکردەوە ،و حەز ی لە پێکەنین بوو بە دەنگی بەرز .. و قسەی ناشرینی بەمیان و بەویان دەوت .. هەموو رۆژێکیان بەو شێوەیە بەسەردەبرد .

ئەمرۆ ( مى ) زۆر پێکەنی .. وەهەروەها قسە وتنی زۆر بەدراوسێکان .. ئەوانیش پێدەکەنین و گاڵتەیان دەکرد، ماوەی بەیانیان کۆتایی هات بە ئومێدی یەکتر بینینەوەی نوێ ..( مى ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوەیان بۆ ئامادەکردنی خواردنی نیوەرۆ .. بەلاّم ئەو ماسیانەی نەبینیەوە کە مێردەکەی هەموو کات لە مەتبەخدا دایدەنا .. چاوڕوانی درێژەی کێشا ... سەعاتەکان بە قورسی تێپەڕدەبوون ... داڵغە و خەیاڵ مى سەرقاڵ کردبوو، شەپۆل دەی هێناو دەیبرد ونقومی دەکرد ، کاتی ئیتر ئارامگرتن

لە سنوور تێپەڕی .. چووە دەرەوە تا بە دراوسێکان بڵێت بەڵکو وەڵامێکی دەست کەوێت و بۆ ئەو ئەندێشەو خەیاڵانەی کە ئازاری دەدا .

پیاوانی لادێکە و گەنجەکانیان ڕۆشتنە دەرەوە بۆ هەواڵ پرسین بەڵام وەڵام نەبوو .. خۆریش لار بوویەوە دوای ئەوەی خواحافیزی لە گوندەکە کرد تا بحەوێتەوە لەو ماندووبوونە دوور و درێژەی ڕۆژ .. هەرچی ڕووناکی هەبوو بردیەوە ..( سالم ) یش نەگەڕایەوە .. بەڵام دارو پەرودوی بەلەمەکەی گەرایەوە . دوای ئەوەی دەریاکە قووتی دابوو بۆ سنگە قوڵەکەی تا بیگوازێتەوە بۆ جیهانی نادیار ..

مـی ومنداڵـەکانی دوای خـوای گـەورە تاکـە سەرپەرشـتیاری خۆیـان لەدەسـتدا . مەینەتی دەورەیدان ..، خەندە و پێکەنین گۆڕا بۆ ئاهو حەسرەت وناخۆشی .

دوێنێ دەریا هیـوا و ئومێد بوو ، ئەمڕۆ چاوەکان بەفرمێسکەوە بۆی دەڕوانن .. سـەرنجە نـاخۆش و ومەینەتیـەکان پرسـیار لـە شـەپۆلەکانی دەکـەن .. لـەوێ خۆشەویستێك ئـارامی گرتـووە کەسێك نیە رزگـاری بکـات، مـرۆڤ ناتوانێت لەقەدەر رابکات، ئەو خۆشەویستەش ناگەڕێتەوە .. .. خۆر پرسیار دەکات و ئەستێرەکانیش بەدوایدا دەگەڕێن . بەلەمەکەی بەشکاوی گەڕایەوە .. بەڵام ...بەڵام ئەو و ئومێدەکانی لە سینەیدا مانەوە .

هەموو خەونەکان لەبار چوون . لەوێ لە ماڵە پەرپوتەکەیدا شتەکان پێویستیان بە چاکردن و گۆڕین هەیە .. تۆڕ .. زەوی ..پاڵتاو .ئاوێنـەی شـکاو... ( سالم ) بەو ئاوێنە شکاوە تەماشای مووە سپیەکانی دەم و چاوە باریکەکەی دەرکرد کە خەریك بوو ریش و سەری پڕ دەکرد... ئاوێنەکەش چاوەڕوان بوو تا دەم وچاوە باریکەکەی ببینێت .. خۆشیەکان لەدڵی منداڵەکاندا مرد ..بێنەوایی ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەی دەسەند ...لە گەڵ یارمەتیدانی پیاو چاکاندا دەریاش لە پاڵ ماڵەکەدا سالمی پێچایەوە بە شـەپۆلەکانی، بـەڵام یادگـاری و یاداشـت وەسـتانیان بـۆ نـەبوو ، وە ڕۆح و دڵـی خۆشەویستانی ئاگری دەسەند .

ماوەی عِدة تەواو بوو بەڵام خەمەکان کۆتایان نەهات، ژیان دەگوزرا تا دەست بکاتەوە بە خولی نوێ و ژیانی تر ، توێشووی ڕۆژگار تەنها ئازار و ئارام برین بوو .

